# شیعەو ڕاستکردنەوە

## ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوع

منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com



نووسینی:

**موسا موسەوی**

وەرگێڕانی:

**ئاسۆ حەسەن**

تایبەت بە/ منتدى اقرأ الثقافي
أبو علي الكردي

# شیعە و ڕاستکردنەوە

## ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوع

لەگەڵ دوو پێشەکیو هەندێ سەرنجی وەرگێڕ و پاشکۆیەك بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبەی لە وەڵامی شیعەو ڕاستکرنەوەدا دەرچووە

نووسینی:
موسا موسەوی

وەرگێڕانی:
ئاسۆ حەسەن

ناوی کتێب: شیعه و راستکردنەوە، ململانێی نێوان شیعەو تەشەییوع
نووسینی: موسا موسەوی
وەرگێڕانی: ئاسۆ حەسەن
ژمارەی سپاردن: ( ٦٦٩ ) ساڵی ( ٢٠٠٨ ) بەڕێوەبەرێتی گشتی کتێبخانەی سلێمانی
ساڵی چاپ: ٢٠٠٨
نۆبەی چاپ: چاپی یەکەم

## وتەیەکی پێویست

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان، دروودو سەلام لەسەر پێغەمبەری خۆشەویست و خزم و یارو شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی.

ڕاستییەك هەیە لە زۆربەی خەڵکی شاراوەیە، ئەویش ئەوەیە کە: پێوەری ڕاستەقینە بۆ هەڵسەنگاندنی هەر ڕێبازێك دەبێ ڕاستی و دروستی ئەو ڕێبازە بێت نەك سەرکەوتنی و گەیشتنیە دەسەڵات چونکە مەرج نییە هەر ڕێبازێك ڕاست بوو سەرکەوێت یا هەر ڕێبازێك سەرکەوت ڕاست بێت.

هەر لەبەر شاراوەیی ئەم ڕاستییەیە کاتێك ڕێبازە چەوتەکان سەرکەوتن بەدەست دێنن خەڵکی دوایان دەکەون یان هەوڵی لاسایی کردنەوەیان دەدەن. نموونەی بەرجەستەی ئەم قسەیە بڵاوبوونەوەی شیوعییەت بوو دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ڕوسیاو ڕووکردنە مەزهەبی شیعە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران و باوەش گرتنەوە بۆ عەولەمەو سیستمی دیموکراسی دوای سەرکەوتنی بلۆکی ڕۆژئاوا بەبێ ئاوڕدانەوە لە ڕاستی و دروستی ئەو ڕێبازانە.

لێرەوە پێویست دەکات لە سەر پسپۆران و شارەزایان لێکۆڵینەوە بکەن لەسەر ئەو جۆرە ڕێبازو سیستمانە بۆ ئەوەی خەڵکی سادە بە بریق و ڕەونەقیان فریونەخۆن و هەڵنەخەڵەتێن.

هەر لێرەشەوەیە کە ئەم نووسینەمان وەرگێڕاوەتە سەر کوردی بۆ ئەوەی خەڵکی کوردستان بە سەرکەوتنی شیعە لە ئێراندا هەڵنەخەڵەتێن وئەو سەرکەوتنە نەبەستن بە ڕاستی ئەو مەزهەبەوە بەڵکو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن و لەسەر بناغەی ڕاستی و هەڵەیی هەڵوێستی لێوەرگرن نەك لەسەر بناغەی سەرکەوتن و سەر نەکەوتن.

ئەوەیشی کە پاڵی پێوە نایین ئەم کتێبە وەرگێڕینە سەر کوردی دووشت بوو:

یەکەم: ناشارەزایی موسوڵمانانی کوردستان بە مەزهەبی شیعە.

دووەم: چالاك بوونەوەی بانگخوازانی شیعە لە کوردستاندا بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکەیان.

ئێمەش لە پێگەی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر بە خواو بە میللەتەکەمان هەستاین بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ کوردی بۆ ئەوەی میللەتەکەمان بپارێزین لە مەترسی کەوتنە داوی ڕێبازە ناڕاستەکانەوە.

ئەم کتێبەی لە بەردەستداندایە گرنگییەکەی لەوەدایە کە کەسێکی شیعە نووسیویەتی، ڕاستە بۆ شیعە نووسیویەتی و ئەو سەرچاوانەی پشتی پێ بەستوون سەرچاوەکانی شیعەن و خوێنەر ئاگای لە بەڵگەکانی ئەهلی سوننە نابێت بەڵام هەر ئەم خاڵەشە گرنگییەکەی دەردەخات ئەویش بەوەی کە ئەگەر بە سەرچاوەی شیعە ناڕاستی مەزهەبی شیعە دەربخرێت ئاخۆ ئەگەر کەسێك بە شێوەیەکی زانستییانەو دوور لە دەمارگیری لێکۆڵینەوە لە سەرچاوەکانی سوننە و شیعەدابکات دەبێ چەند زووتر بگات بەم ڕاستییە.

خاڵێکی تر کە گرنگی ئەم نووسینە دەردەخات ئەوەیە کە شیعە خەڵکانی خۆیان بە شیوەیەك پەروەردە دەکەن کە بیروباوەڕی مەزهەبی لەگەڵ خوێنیاندا تێکەڵ بێت، لە ڕێگەی سۆزەوە دەیخەنە مێشکیانەوە نەك لە مێشکەوە بۆ ناو دڵ، بەڕادەیەك کە دەست هەڵگرتنیان لە مەزهەب زۆر سەخت بێت و هەر کەسێك ئەو کارە بکات مانای وایە ئەرکێکی زۆری کێشاوەو دوای ململانێ وزۆرانبازییەکی زۆر لە نێوان عەقڵ و دڵیدا یا ژیری وسۆزیدا گەیشتۆتە ئەو بڕیارە کە دەتوانم بڵێم سەخترین بڕیارە.

خاڵێکی تر بەپێویستی دەزانم لێرەدا باسی بکەم ناساندنی کتێبەکەیە:

نووسەر لەم کتێبەدا بە لۆژیکێکی زۆر بە هێز گفتوگۆی لە سەر مەسەلەکان کردووە بەتایبەت بابەتی پێشەوایەتی و جێنشیتی، هەروەها وێنەیەکی زۆر جوانی کێشاوە بۆ کۆمەڵگەی پێغەمبەر لە ڕووی ئازادی و سەربەستییەوە و جیاوازی خستۆتە نێوان لایەنی مرۆڤایەتی و لایەنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (د.خ) وە نێوان ئەو شتانەی کە حەزی پێغەمبەر بوون و ئەوانەی کە فەرمانی خوایی بوون و بە نیگا بۆی دادەبەزی و چەندین شتی تر

لە کۆتاییدا دەڵێم ئەم کتێبە لەبەر ئەوەی لە بنەڕەتدا بۆ شیعە نووسراوە گۆڕینەوەی بۆ کوردی سەرنجگەلێکی زیاتری دەویست بۆ ئەوەی وێنەکە ڕوونتر بێت لەبەرچاوی خوێنەری کوردی سوننی مەزهەب کەشارەزاییەکی وای دەربارەی مەزهەبی شیعە نییە بۆیە لێکۆڵینەوەیەکی شیکارییانەمان لە دوای ئەم پێشەکییەوە نووسیوە و لە پەراوێزەکاندا هەندێك سەرنجی خۆمانمان نووسیوە بۆ ئەوەی خوێنەر باشتر لە مەبەستەکانی نووسەر تێبگات.

واللە ولی التوفیق

**وەرگێڕ**

**موحەڕڕەمی ١٤٢٩**

# پێشەکی وەرگێڕ

## لێکۆڵینەوەیەکی شیکاریانە بۆ بیروباوەڕەکانی شیعە

پێش ئەوەی بێینە سەر پەیامە ڕاستکارییەکەی موسى الموسوي بە پێویستی دەزانم بیروباوەڕی شیعە شی بکەمەوە بۆ خوێنەر بۆ ئەوەی باشتر لەو پەیامە تێبگات و بزانێت نووسەر چیدەوێت چونکە ئەو پەیامە لە بناغەدا بۆ شیعە نووسراوە کە مانای ئەو زاراوایانە دەزانن کە باسی دەکات و دان بەڕاستی ئەو شتانەدا دەنێن کە دەیداتە پاڵیان، بەڵام بە نیسبەت ئەهلی سوننەوە کە بۆمان گۆڕیوەتە سەر کوردی لەوانەیە لە زۆرێك لەو شتانە تێنەگەن و نەزانن چۆن سەریان هەڵداوە،بۆیە پێویستی کرد ئەم لێکۆڵینەوەیان بۆ بنووسین بەهیوای ئەوەی کەبتوانین یارمەتییان بدەین بۆ باشتر گەیشتن لە مەبەستەکانی نووسەر.

ئیمامەت و خیلافەت:

یەکەمین و سەرەکیترین شت کە شیعەی لە سوننە جیاکردۆتەوە مەسەلەی ئیمامەتو خیلافەتە.

شیعە باوەڕی وایە کە ئیمامەت وەکو پێغەمبەرایەتی وایە دەبێ خوا خۆی دیاری بکات واتە چۆن خوا پێغەمبەران دەنێرێت بەهەمان شێوە دەبێ ئیمام دیاری بکات چونکە ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گەورەیەو بەرژەوەندی بەندەکانی لەسەر وەستاوە و نابێ هەڵبژاردنی ئیمام بدرێتە دەستی مرۆڤەوە.

وەهەروەها لەبەرگرنگی کاری ئیمام دەبێ ئیمام مەعصوم بێتو پارێزراو بێت لەهەڵەو لەگوناهی گەورەو بچووك.

وەقەناعەتیشیان وایە کە پێغەمبەر ئیمامەکانی لەدوای خۆی دیاریکردووە کەیەکەمیان عەلی کوڕی ئەبی تالیبە و دواگەسیشیان (محمدی مەهدی)یە کە لەساڵی (٢٦٠)ی کۆچی لەتەمەنی پێنج ساڵیدا لەسامەڕا خۆی شاردۆتەوە و لەبەرچاو ونبووە وپێش ڕۆژی قیامەت دەگەڕێتەوە و زەوی پڕدەکات لە دادوەری و خۆشیو ئاسایش.

قەناعەتیشیان وایە کە چەندین ئایەتو فەرموودە لە سەر ئیمامەتی عەلیو نەوەکانی هەیە و پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە (غدیر خم)[١] دا بەیعەتی لەهەموو صەحابەکان وەرگرتووە بۆ ئیمامی عەلی، وەهەڵبژاردنی ئەبو بەکر و بەیعەت پێدانی سەرپێچی بوو لەفەرمانەکانی پێغەمبەر و پێشێلکردنی ئەو بەیعەتە بوو دابوویان بەعەلی و زەوت کردنی مافی عەلی و ستەم لێکردنی بوو وە ئیمامی عەلیش بۆ ئەوەی کێشە لەناو موسوڵماناندا ڕوونەداتو دەوڵەتی ئیسلام تێك نەچێت بەنابەدڵی و ناڕەزاییەوە چووە ژێر ئەو بارەوە و بەیعەتی ناچارییانەی بەهەریەك لەو خەلیفانەی پێش خۆی دا.

هەروەها شیعە باوەڕیان وایە کە ئیمامەت کۆڵەکەیەکی (ڕوکنێکی) گرنگە لەڕوکنەکانی ئیمانو باوەڕ پێهێنانی مایەی چوونە بەهەشت و کوفر پێکردنی مایەی چوونە دۆزەخە!! (بڕوانە کتێبی منهاج الكرامة)ی ابن المطهر الحلي کە بناغەیە بۆ هەرچی کتێبی تریان هەیە لەو بوارەدا.ئەمەش دەقی ئەو قسانەیە کە ابن المطهر لە منهاج الكرامە دا باسی کردووە:

---

[١] غدیر خم/ شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینەدا ناوی لێیە (غدیر واتە کانی) خم ناوی شوێنێکە واتە کانی خوم.. شیعە باوەڕیان وایە کە پێغەمبەر(ﷺ) لەوشوێنەدا بەیعەتی لەموسوڵمانان وەرگرتووە بۆ ئیمامی عەلی.

(اما بعد، فهذه رسالة شريفة ومقالة لطيفة اشتملت على أهم المطالب في أحكام الدين، وأشرف مسائل المسلمين، وهي مسألة الامامة التي يحصل بسبب إدراكها نيل درجة الكرامة. وهي أحد أركان الايمان المستحق بسببه الخلود في الجنان، والتخلص من غضب الرحمن...)، ( ثم أردف الرسالة بعد موت الرسول بالامامة فنصب أولياء معصومين، ليأمن الناس من غلطهم وسهوهم، فينقادون الى أوامرهم، لئلا يخلي الله تعالى العالم من لطفه ورحمته، وأنه لما بعث رسوله محمداً(ص)قام بنقل الرسالة، ونص على أن الخليفة بعده علي بن ابي طالب (ع)، ثم من بعده على ولده الحسن الزكي.......ثم على الخلف الحجة محمد بن الحسن. عليهم أفضل الصلوات. وأن النبي لم يمت الاّ على وصية بالامامة.) منهاج الكرامة: المقدمة والفصل الاول.

ئەمانە بەکورتی هەندێك بوون لە بیروباوەڕی شیعە دەربارەی ئیمامەتو هەرچی بیروباوەڕی تریان هەیە جیاواز لە ئەهلی سوننە هەمووی لەم بنەمایەوە واتە لە (ئیمامەتەوە) سەرچاوەی گرتووە.

ئێمە لێرەدا باسی ئەو بیروباوەڕانە دەکەین کە لە ئیمامەتەوە سەرچاوەی گرتووە و لە دەرفەتی تریشدا گفتوگۆی یەك بەیەکەیان دەکەین:

١) ڕووداتی کەمو کورتی وگۆڕانکاری لەقورئاندا(تحريف القرآن):

وەکو وتمان شیعە ئیمامەت بەڕوکنێکی گرنگ لەڕوکنەکانی ئیمان دەزانێت باوەڕیان وایە کە ئیمام دەبێ خوا دیاری بکات نەك موسوڵمانان خۆیان هەڵیبژێرن.

ئەمە وای پێویست دەکرد کە ئەم مەسەلە گرنگەو سەرەکییە بەکەم شت لە قورئاندا ڕوون بکرایەوە و یەك لایی بکرایەتەوە چونکە قورئان کتێبی سەرەکی و سەرچاوەی سەرەکی موسوڵمانانەو داڕێژەری دەستووری ژیانیانە.

شایانی باسیشە قورئان باسی هەموو بنەماو لقەکانی ئاینی کردووە هەر لە تەوحیدەوە تا سادەترین ئادابی نێوان موسوڵمانان، سەدان ئایەت دەربارەی یەکتاپەرستی و پێغەمبەرایەتی و ڕۆژی قیامەت هاتووە ولەدەیان شوێندا باسی نوێژو زەکاتو جیهادو فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپەو صەبرو داتیەخۆدا گرتنو بانگەوازی کردن کراوە، هەروەها دەویان ئایەت دەربارەی موعامەلاتو پەیوەندی و هەڵسو کەوتی نێوان موسوڵمانان هاتووە هەرلە باری کەسێتییەوە تا پەیوەندی دەوڵەتی ئیسلامی بە دەوڵەتانی ترەوە و هیچ مەسەلەیەکی تەشریعی نییە حوکمی لە قورئاندا باس نەکرابێت.

وەهەروەها دەیان ئایەت دەربارەی دڵسۆزی و تەقواو تەزکیەی نەفسو خۆپاراستن لەداوەکانی شەیتان هاتووە.

وە هەروەها دەیان ئایەت دەربارەی ڕەوشتو ئەخلاق هاتووە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو تەنانەت دەربارەی سادەترین ئادابی ئیسلامی کە سڵاو کردنو ئیزن خواستن و چەندین شتی ترە ئایەت دابەزیووە، وەهەرچی حەڵاڵو حەرام هەیە لە خواردنو جلو بەرگ و مامەڵە خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردووە..

هەروەها لە قورئاندا ئاماژە بە هەندێك پەیانناتە دەدات زۆر کەم بایەختر لە پەیماننامەی غەدیری خوم.

کەواتە، یانی چی ئیمامەت کە ڕوکنێکی وا گرنگە لە ڕوکنەکانی ئیمانو باوەڕ پێهێنانی مایەی چوونە بەهەشتو کوفر پێکردنی مایەی چوونە دۆزەخە[1] تاقە ئایەتێکی ڕاشکاوی لەسەر نەهاتۆتە خوارەوە؟!

---

٢. بڕوانە ئەو دەقەی لە منهاج الكرامەی ابن المطهر الحلي کە لەسەرەوە هێنامانەوە

یانی چی ئیمامەت کە سەرفرازی و بەرژەوەندی بەندەکانی لەسەربەندە یەك ئایەتی لەسەر نەهاتبێتە خوارەوە؟!

وە بە تاقە ئایەتێکیش ئاماژە بە پەیماننامەی غەدیری خوم نەکرێت کە گرنگترین پەیماننامەیەو پەیوەندی بە داهاتووی موسوڵمانانەوە هەیە لە کاتێکدا کە ئاماژە بە پەیمانامەی زۆر لەوە کەم بایەختر دراوە وەکو پەیماننامەی ژنان و پەیماننامەی ژێر دار لە حودەیبییە!

ئاشکرایە کە ئەمە کێشەو تەنگژەیەکی گەورەی بۆ زانایانی شیعە دروستدەکرد لەبەردەم شوێن کەتوانیاندا تا لەئەنجامدا وای لێکردن بۆ دەرچوون لەو تەنگژەیە و ڕزگاربوون لەوکێشەیە بڵێن قورئان گۆڕانکاری تێدا کراوە و شتی لێ قرتێنراوە و ئەوئایەتانەی باسی ئیمامەت و ئیمامی عەلی و نەوەکانی و ئەو ئایەتانەی زەمو سەرزەنشتی صەحابییەکان دەکات و حەقیقەتیان دەخاتە ڕوو لابراوە، ئەوکارەش لەسەردەمی ئەبوبەکردا ڕوویدا لەوکاتەی کە قورئانیان کۆکردەوە:

ئەی قورئانی ڕاستەقینە لە کوێیە؟

بەڕای شیعە قورئانی ڕاستەقینە لای ئیمامی عەلییەو پاش خۆشی کەوتەلای ئیمامەکانی ترو لەدواییشدا محمدی مەهدی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێتەوە و حوکمی پێدەکات!

عن سالم بن سلمة قال: قرأ رجل على ابي عبد الله (ع) وانا اسمع حروفا من القرآن ليس على ما يقرأه الناس، فقال ابو عبد الله (ع):كف عن هذه القراءة، اقرأ كما يقرئه الناس حتى يقوم القائم، فاذا قام القائم قرأ كتاب الله عزوجل على حدّه وأخرج المصحف الذي كتبه علي (ع)، وقال:أخرجه علي (ع) الى الناس حين فرغ منه وكتبه، فقال لهم: هذا كتاب الله عزوجل كما أنزله

الله على محمد (ص) قد جمعته من اللوحين،فقالوا: هو ذا عندنا مصحف جامع فيه القرآن، لا حاجة لنا فيه، فقال:أما والله لا ترونه بعد يومكم هذا أبدا انما كان عليّ أن أُخبركم حين جمعته لتقرؤوه. "الكافي في الاصول "ص ٦٢٣ ج٢ ط طهران.واته سالمی کوڕی سەلەمە دەڵێت: پیاوێك قورئانی لای ئیمامی صادق دەخوێندەوە گوێم لە هەندێك وشە بوو لەو قورئانە بەو شێوەیە نەبوو کە خەڵکی دەیخوێننەوە، ئیمامی صادق وتی: دەست لەم خوێندنە هەڵگرە، بەو شێوەیە بخوێنەرەوە کە خەڵکی دەیخوێننەوە تا ئیمامی مەهدی دێت، هەر کاتێك مەهدی هات کتێبی خوا بەو شێوەیە دەخوێنێتەوە کە دابەزیوەو ئەو قورئانە دەردێنێت کە ئیمامی عەلی نووسیویەتەوە. وتی (واتە ئیمامی صادق): ئیمامی عەلی دوای ئەوەی لە نووسینەوەی قورئان بوویەوە هێنای بۆ ناو خەڵکەکە( صەحابەکان) و پێی وتن ئەمە کتێبی خوایە بەو شێوەیەی دایبەزاندووە بەسەر پێغەمبەردا لە هەردوو لەوحەکە کۆم کردۆتەوە، وتیان ئەوەتا ئەم موصحەفەمان لایە هەموو قورئانی تێدا کۆکراوەتەوە، پێویستیمان بەوەی تۆ نییە، وتی سوێند بە خوا لەمڕۆبەدواوە چاوتان پێی ناکەوێت، لەسەرم بوو ئاگادارتان بکەمەوە لێی دوای لێی.

ئەمە بیروباوەڕی شیعەیە دەربارەی قورئان و لەڕاسترین و باوەڕ پێکراوترین کتێبیان هاتووە لەوانە کتێبی( الكافي) نوسینی کولەینی و دەیان کتێبی تر.

ئەوکێشە گەورەیەی کە بۆ شیعە دروست بووە و ئەو تەنگژەیەی کە تێی کەوتن لەنەبوونی باسی ئیمامەت و ئیمامەکان و بەیعەی غەدیری خوم لەقورئاندا شیعەی خستە بەردەم دوڕیانێکەوە کە یادەبێ دەست لەو بیروباوەڕەی خۆیان هەڵگرن و قەناعەت بێنن بەوەی کە ئەم مەسەلەیە بەو

شێوەیە نییە کە ئەوان لێی تێگەیشتوون و گرنگی و گەورەیی شتێك بەگوێرەی قورئانو لە قورئانەوە وەرگرن وەیا دەبێ بڵێین قورئان گۆڕانکاری تێدا کراوە.

لێرەدا شیعە وەکو هەموو ئەهلی بیدعە و شوێنکەوتوانی هەواو هەوەس بڕیاریاندا دەست بە بیدعەتەکەی خۆیانەوە بگرن و لە پێناوی ئەوبیروباوەڕەدا بکەونە هەڵەیەکی گەورەتر کە لافی ڕوودانی گۆڕانکاری و کەمو کورتییە لە قورئاندا.

بەڵێ لە جێی ئەوەی شیعە دەست لە بیدعەتەکەیان هەڵگرنو بڵێین مادەم قورئان(ڕاستەوخۆ)[1] باسی ئەم مەسەلەیەی نەکردووە کەواتە ئەم شتە بەوشێوەیە نییە کە ئێمە لێی تێ گەیشتوونو ئەوەندە مەسەلەیەکی گرنگ نیە کە ئێمە دەیڵێین. لە جێی ئەوەهاتن تۆمەتی گۆڕینی قورئانیانیان خستە ئەستۆی خەلیفەکان و یارانی پێغەمبەر و وتیان قورئان دەسکاری کراوەو لێی لابراوە!. لەجیاتی ئەوەی خۆیان لەو قوڕاوە دەربێنن کە تێی کەوتوون خۆیان هاوێشتە چڵکاوێکی گەورەترەوە. لەجیاتی ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ڕاستی ئەوەندەی تر ڕۆچوون لەناڕاستیدا.

لە جیاتی ئەوەی دەست لەوبیدعەتە هەڵگرن کەوتنە هەڵەیەکی گەورەتر و گوناهێکی گەورەترەوە کە ئەویش ئیدعاکردنی دەسکاریکردنی قورئان و ڕوودانی گۆڕانکارییە لە قورئاندا!.

ئەمەش ئەنجامێکی سروشتییە بۆ کەسانێك لەسەرەتاوە ڕێگاکەیان هەڵە کردبێت. تازیاتر پێیدا بڕۆن زیاتر لەڕاستی دووردەکەونەوە.

---

[1] بۆیە دەڵێین ڕاستەوخۆ چونکە شیعەکانی ئەمڕۆ ئایەتێکی زۆر دەهێننەوە و تەئویلیان دەکەن بۆ تأیید کردنی عەقیدە و بیروباوەڕو بۆچوونەکانیان.

بۆ ئەو مەبەستەش ریوایەتگەلێکی زۆریان داوەتە پاڵ ئیمامەکانیان، لەوانە:

١ کولەینی کە گەورەترین زانای فەرموودەناسیانەو کتێبەکەی کە ناوی الکافی یە بڕواپێکراوترین کتێبی فەرموودەیانە لە هیشام ی کوڕی سالمەوە لە جەعفەری صادیقەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ:**ان القرآن الذی جاء به جبریل (ع) الی محمد (ص)سبعة عشر الف آية.الكافي في الاصول "كتاب فضل القرآن" باب النوادر ص ٦٤٣ ج٢ ط طهران ١٣٨١هجرية.** ئاشکراشە کە **ژمارەی ئایەتەکانی قورئان شەش هەزارو شتێکە نەك حەڤدە هەزار ئایەت !**

٢. ریوایەتێکی تر هەر کولەینی لە کتێبی الکافی- کتاب الروضة – **دەیگێڕێتەوە لە ل ١٢٥ ب ٨ چاپی تاران:ان ابا الحسين موسى (ع) كتب الى علي بن سويد وهو في السجن: ولا تلتمس دين من ليس من شيعتك ولا تحبن دينهم فانهم الخائنون الذين خانوا الله ورسوله وخانوا أماناتهم، وهل تدري ما خانوا أماناتهم ؟ ائتمنوا على كتاب الله فحرفوه وبدلوه.**واتە موسای کازم لە زیندانەوە نووسیویەتی بۆ عەلی کوڕی سوید: چاوەڕوانی ئاین مەبە لە کەسێك کە لە سەر مەزهەبی خۆت نەبێت(واتە شیعە نەبێت) و ئاینەکەیانت خۆش نەوێت، ئەوانە خیانەتکارەکانن، خیانەتیان لە خوا و پێغەمبەرو ئەمانەتەکانیان کردووە، ئایا ئەزانی مانای خیانەتیان کرد لە ئەمانەتەکانیان چییە؟ متمانەیان خرایە سەر لە سەر کتێبی خوا شێواندیان و گۆڕییان. ئەمانەو دەیان ریوایەتی تر کە ئێرە جێگەی باسکردنی نییە.

سەرەڕای ئەم هەمو قسانەی سەرەوە کەداویانەتە پاڵ ئیمامەکانی ئەهلی بەیت و خۆیان ناوی لێ دەنێن فەرمودە چەندین بەڵگەی عەقڵی و لۆژیکیشمان هەیە لە سەر ئەوەی کە شیعە کۆنەکان باوەڕیان بە ڕاستی قورئان نەبووە، لەوانە:

١- هیچ بایەخێك لەلایەن شیعەوە بە زانستەکانی قورئان نەدراوە ( جگە لە تەفسیر ئەویش  دوای تەئویل و شێواندنی ماناکانی تەنها بۆ ئەوەی پشتگیری بۆچونەکانی خۆیانی پیّ بکەن ) وەهەرچی زانستی قورئان هەیە هەمووی لە داهێنانی ئەهلی سوننەیە بەتایبەت بابەتی ئیعجازی قورئان کە دەتوانین بڵێین شیعە هیچ بەشدارییەکیان تێیدا نەبووە بۆ ئەوەی بیرو باوەڕەکەی خۆیان دەربارەی ڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئاندا پوچەڵ نەبێتەوە.شایانی باسە شیعە هیچ لێکۆڵینەوەیەکی قورئانییان نییە وە هەرچی لێکۆڵینەوە لەسەر قورئان کراوە هەمووی لەلایەن زانایانی سوننەوە بووە بەتایبەت ئەو لێکۆڵینەوانەی بۆ سەلماندنی سەرچاوە خواییەکەی قورئان وڕوونەدانی گۆڕانکارییە تێیدا، تەنانەت زانستی تەجوید کە بۆ چۆنێتی خوێندنەوەی قورئانە لەلایلان زانایانی سوننەوە نوسراوە.

٢- نەبوونی کەسانێك لە ناو شیعە کۆنەکاندا ناسرابێتن بەوەی کە قورئانی لەبەر بووبێت تەنانەت لەناو زاناکانیشیاندا وبایەخ نەدانی پێویست نەك هەر بەلەبەر کردنی قورئان بەڵکو تەنانەت بە خوێندنەوەشی بەڕادەیەك کە بە ئاسانی دەتوانی هەستی پێبکەیت کاتێك کە دەبینی لە کاتی گفتوگۆو بەڵگە هێنانەوەدا بە قورئان زانایانی شیعە نە بەو شێوەیە قورئانیان لە بەرە وە نەدەزانن بەباشی بیخوێننەوە. بەڵگەیەکی بەرجەستە لەسەر ئەم قسەیە ئەم روداوەیە: چەند ساڵێك لەمەوبەر مەلایەکی ئێرانی کوڕێکی پێنج شەش ساڵەی قورئان پیّ لەبەر کردبوو وەکو شتێکی عاجباتی وسەیر دەیگەڕان بەم وڵات وبەو وڵاتدا وکۆڕی بۆ دەبەست وخەڵکی بۆ کۆ دەکردەوە وەکو ئەوەی کە کەسێکی تر نەبێت لەو تەمەنەدا هەموو قورئانی لەبەر بێت لەکاتێکدا کە ئەگەر بگەڕێی بە جیهانی ئیسلامیدا کە سوننە زۆرینەی ڕەهای

پێکدێنێت به هەزارەها منداڵی قورئان لەبەر دەبینییەوەو کەسیش نەیکردوەتە هەراو جاڕی بۆ نەداوە.ئەم ڕوداوە لە گەڵ ئەوەی کە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە شیعە لەمەو بەر گوێیان بە قورئان لەبەر کردن نەداوە هەوڵێکە لەلایەن شیعەوە بۆ سڕینەوەی ئەو وێنەیەی لەسەریان دروست بووە دەربارەی هەڵوێستیان لە قورئان.

٣-نەبوونی قورئان خوێنێکی شیعە لە پێش شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە کاتێکدا کە لە ناو ئەهلی سوننەدا سەدان قورئان خوێنی بەناوبانگ پەیدا بووە.بایەخدانی جمهوری ئیسلامیش بە خوێنەرانی قورئان بۆ هەمان ئەو دوو مەبەستە بووە کە ئەو مەلایە دەیکرد.

هەندێك هۆکاری تریش هەبوو بۆ ئەو هەڵوێستەی شیعە لە قورئان، لەوانە:

١-قورئان مەدح و ستایشێکی زۆری هاوەڵانی پێغەمبەری تێدایە، ئەمەش هەڵوێستی شیعەی لاواز کردوە و پێچەوانەی بیروباوەڕی شیعەیە دەربارەی ئیمامەت و دەربارەی هاوەڵان،بۆیە پێویستی کردوە بڵێن قورئان دەسکاری کراوەو ئەو ئایەتانەی زەمی هاوەڵان و ستایشی ئەهلی بەیتی تێدایە لابراون یا دەسکاری کراون!.

٢- دان نان بە ڕاستی قورئاندا دان نانە بە دەست پاکی و ئەمانەتی هاوەڵانی پەیامبەر چونکە ئەم کارە ئەوان پێی هەستان.جا ئەگەر ئەوان لە نووسین و گواستنەوەی قورئاندا دەستپاك بووبێتن کە دەستوری یەکەمی موسوڵمانانە چۆن لە گەیاندنی شتەکانی تردا دەستپاك نابن ؟. شایانی باسیشە ئیمامی عەلی لەو لیژنەیەدا نەبووە کە کۆ کردنەوەو نوسینەوەی قورئانیان خرابووە ئەستۆ.

٣- كۆكردنەوەو نوسینی قورئان گەورەترین شەرەف و شانازییە بۆ خەلیفە ئەبوبەکرو هاوەلانی پەیامبەر کە لەسەر دەستی ئەوان قورئان لە فەوتان وگۆڕان پارێزرا وخوا ئەوانی هەڵبژارد بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە گەورەو پیرۆزە، ئەمەش مەسەلەیەکە شیعە نایانەوێت دانی پێدا بنێن و شایەتی بۆ بدەن بە تایبەت گەر ئەوەش بزانین کە شیعە قورئان وئەهلی بەیت دەبەستن بەیەکەوەوئەهلی بەیت بە هاوتای قورئان دەزانن و ئەم کارەش بەبێ بەشداری ئەهلی بەیت ئەنجام دراوە.بەشداری نەکردنی ئەهلی بەیت لە نوسین وکۆکردنەوەی قورئاندا شیعەی زۆر نارەحەت کردووەو هەر ئەمەشە وای لێ کردوون بانگەشە بۆ ئەوە بکەن کە قورئانی راست وتەواو تەنها لای عەلییە.

ئەمە هەڵوێستی پێشینانی شیعە بوو لە قورئان، ئەی هەڵوێستی شیعەی ئەمرۆ چییە لە قورئان؟:

ئەمە مەسەلەیەکە زۆرێك لە موسڵمانان تێیدا کەوتونەتە هەڵەوەو ئیشکالێکە بۆ زۆر کەس چارەسەر نەکراوە چونکە لە لایەکەوە شیعە دەڵێن باوەڕمان بە ڕوودانی کەموکرتی لەقورئاندا نییەو ئەم قورئانەی ئێستا لە بەر دەستی موسڵماناندایە هەمان ئەو قورئانەیە کە دابەزیوە بەسەر پەیامبەردا بەبێ کەموکرتی وگۆڕانکاری،لەلایەکی تریشەوە هیچ هەڵوێستێك دەرنابڕن لەو کەسانەی وتویانە قورئان ناتەواوە.نەك هەر ئەوە بەڵکو تاکو ئێستا بەچاوی ڕێزەوە تەماشای ئەو کەسانە دەکەن کەوایان وتووەو بە پێشەوای مەزهەبیان دەزانن.!

هۆی پاشگەزبوونەوەی رواڵەتیی شیعە لەم بیروباوەڕە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی:

١- ماوەیەکی زۆر تێپەڕی بەسەر دیارنەمانی ئیمامی دوازدەهەمدا و هیچ دەنگ و باسێك نەبوو لە گەڕانەوەی، واتە دەبوایە شیعە بەبێ قورئان بمێننەوە، ئەویش ئیحراجییەکی زۆری بۆ شیعە پێشهێنابوو و نەدەکرا تا سەر بەردەوام بێت.

٢-بیرمەندانی شیعە (متکلموا الشیعە) بۆ دەربازبوون لە کێشەی نەبوونی ئایەت لەسەر ئیمامەت دەستیان دایە تەئویل کردن و ملبادانی ئایەتگەلێکی زۆر بۆ ئەوەی بەڵگەی ئیمامەتی عەلی و نەوەکەی لێدەربێنن،ئایەتگەلێك کە نەلە دوورەوە وە نە لە نزیکەوە پەیوەندییان بەو مەسەلەیەوە نەبوو چونکە ئەگەر پەیوەندییان پێوە هەبوایە ئیمامی عەلی ئاماژەی پێدەدان لە کاتی ڕوودانی مشت و مڕ لە سەر خەلافەت.وە ئەم مەسەلەیە (اتە تەئویل کردنی ئایەتەکانی قورئان) هەروا بەردەوامە و ڕۆژدوای ڕۆژ شیعە ئایەتی تری بۆ زیاد دەکەن ودوورنییە کار بگاتە ڕادەیەك بڵێن هەموو قورئان بۆ سەلماندنی ئیمامەتی عەلی دابەزیوە، وە ئەگەر بەڵگەشت دەوێت بڕۆ بەراوردێك لە نێوان کتێبی (منهاج الكرامة في اثبات الامامة )ی ابن المطهر الحلی کەلەسەدەی حەوتەمی کۆچیدا نووسیویەتی و کتێبی ( المراجعات) ی عبدالحسین شرف الدین الموسوی کە لە سەدەی چواردەهەمی کۆچیدا نووسیویەتی و بزانە جیاوازی چەند زۆرە لە نێوان ژمارەو سروشتی ئەو ئایەتانەی کە هەریەکێکیان هێناویانەتەوە بۆ سەلماندنی ئیمامەتی عەلی و نەوەکانی.ابن المطهر چل ئایەتی هێناوەتەوە لەسەر ئیمامەتی عەلی بەڵام شرف الدین زیاد لە هەشتا ئایەتی هێناتەوەو لە دوای ئەو ئایەتانەشەوە دوو ڕیوایەت دێنێتەوە، یەکێکیان لە ابن عباس ەوە کە گوایە وتوویەتی: تەنها لەسەر عەلی سێسەد ئایەت دابەزیوە، دوایش

دەڵێت: هەندێ کەسی تر دەڵێن چواریەکی قورئان لەسەر عەلی دابەزیوە!.
ئەمەش هەندێك لەو ئایەتانەی شرف الدین هێناویەتەوە کە نەلە نزیکەوە و نەلە دوورەوە پەیوەندی بە ئیمامەتەوە نییە بەڵکو بەڵگە پێهێنانەوەی دەچێتە خانەی شێواندنی تەفسیری ماناو دەلالەتەکانی ئایەتەکانی قورئان و تاوانێکی گەورەیە:( یا ایها الذین آمنوا ادخلوا في السلم کافة ولا تتبعوا خطوات الشیطان )، (والراسخون في العلم یقولون آمنا به کل من عند ربنا )،(وعلى الأعراف رجال یعرفون کلاً بسیماهم)» (واسأل من أرسلنا من قبلك من رسلنا )......هتد وە بۆ ئەوەی ڕادەی لادانی شیعە لە لێکدانەوەی قورئاندا ببینی تەنها ئەم چوار ئایەتەت بۆ ڕاڤە دەکەم: ئایەتی یەکەم داوا لە بڕواداران دەکات کە هەموو ئیسلام وەرگرن و بەرپای بکەن و بەدڵ و جەستە ئیسلام وەرگرن نەك بەشێکی وەرگرن و بەشێکی تری ڕەتکەنەوەو شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان نەکەون. ئایەتی دووەم باسی ئایەتە موحکەم و موتاشابیهەکان دەکات و ستایشی ئەو بڕوادارانە دەکات کە باوەڕیە هەموویان دێنن و بە دوای لادانی ماناکانیاندا ناگەڕێن وەکو ئەوەی ئەم دڵ نەخۆشە کردوویەتی، با پێکەوە ئایەتەکە لە سەرەتاوە بخوێنینەوە: (هو الذي أنزل علیك الکتاب منه آیات محکمات هن أم الکتاب وأُخر متشابهات، فأما الذین في قلوبهم زیغ فیتبعون ما تشابه منه ابتغاء الفتنة وابتغاء تأویله ولا یعلم تأویله الا الله والراسخون في العلم یقولون آمنا به کل من عند ربنا، وما یذکر الا أُلوا الألباب)آل عمران۷، ئیتر ئەمە چ پەیوەندییەکی بە ئیمامەتەوە هەیە؟ سەیریش لەوەدایە کە ئایەتەکە بە ڕاشکاوی زەم و سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات کە دوای پشت لە ئایەتە موحکەمەکان دەکەن و دوای ئایەتە موتەشابیهەکان دەکەون!.ئایەتی سێهەمیش ئەوپەڕی نەزانی و تێنەگەیشتویی نووسەر دەردەخات لە قورئان چونکە ئایەتەکە باسی

کۆمەڵێك دەکات نە ئەهلی بەهەشتن وەنە ئەهلی دۆزەخ بەلەبەر ئەوەی کردەوە خراپ و باشەکانیان هاوسەنگن و لە شوێنێکدا دانراون پێی دەوترێت ئەعراف کە چاویان بە بەهەشتییەکان دەکەوێت سلاویان لێدەکەن و ئاوات دەخوازن لە گەڵیاندا بچنە بەهەشت و کە چاویشیان بە دۆزەخییەکان دەکەوێت دەپارێنەوە لە خوا کە لە گەڵ ئەواندا کە ستەمکار بوون کۆیان نەکاتەوە، واتە نەیانخاتە دۆزەخ، کەچی زانایانی شیعە لە ئەنجامی بێئاگاییان لە قورئان دەڵێن عەلی لە ئەهلی ئەعرافەو ئەو ئایەتانە لە باسی ئەواندا دابەزیوەو بەڵگەیە لە سەر ئیمامەتی ئەوان!. با پێکەوە ئایەتەکان بخوێنینەوە(وبينهما حجاب -واتە لە نێوان بەهەشتییان و دۆزەخییاندا- وعلى الأعراف رجال يعرفون كلاً بسيماهم ونادوا أصحاب الجنة أن سلام عليكم لم يدخلوها وهم يطمعون.وإذا صرفت أبصارهم تلقاء أصحاب النار قالوا ربنا لا تجعلنا مع القوم الظالمين)الأعراف٤٦،٤٧. لە هەمووش گەورەترو ترسناکتر ئەم ئایەتەیە کە خوا تێیدا بە پێغەمبەر دەفەرموێت: بپرسە لەوانەی لە پێش تۆوە ناردوومانن ئایا ئایا جگە لە خوا( کە لێرەدا بە الرحمن باسی دەکات) فەرمانمان پێداون هیچ خوایەکی تر بپەرستن؟ کەچی ئەو بەدبەختە کۆتاییەکەی لێدەقرتێنێ و سەرەتاکەی دەکاتە بەڵگەیەك لە سەر ئیمامەتی عەلی! با ئەم ئایەتەش پێکەوە بخوێنینەوە خۆت دادوەر بە لە سەر ڕادەی شێواندنی مانای ئایەتەکانی قورئان لە پێناوی سەلماندنی ئیمامەتی عەلی: ( واسأل من أرسلنا من قبلك من رسلنا أجعلنا من دون الرحمن آلهة يعبدون)الزخرف ٤٥

٣-بە نیسبەت بەڵگەبوونی نووسینەوەی قورئان لە سەر ڕێزو شەرەف و دەسپاکی و ئەمانەتی یارانی پێغەمبەر(د.خ) و بەخشینی ئەو شەرەفە بەوان شیعە پەنایان بردۆتە بەر لۆژیکێکی زۆر سەقەت و کرچ وکاڵ، ئەویش ئەوەیە

که خوا خۆی قورئانی پاراستووه و دەیپارێزێ نەك هاوەڵانی پێغەمبەر و ئەگەر ئەوانیش کۆیان نەکردایەتەوەو نەیاننوسیبایەوە خوا هەر دەیپاراست! ئەمەش رێك وەکو ئەوە وایە بڵێی خوا خۆی ئاینی خۆی بڵاو دەکردەوە ئەگەر پێغەمبەر و یارانی هەستانایە بە بڵاوکردنەوەی یا هەڵنەسانایە و هەڵبژاردنی پێغەمبەر بۆ ئەو کارە هیچ رێزلێنان و شەرەفێکی تێدانییە بۆ پێغەمبەر و ئەویش نەیکردایە خوا هەر ئاینی خۆی بڵاو دەکردەوە !.

لێرەدا شیعە لە هەڵەیەکەوە دەرچوون کەوتنە هەڵەیەکی ترەوە، دورچوون لە ئیددعای ڕوودانی کەم و کورتی و دەسکاری کرانی دەقەکانی قورئان و کەوتنە ناو هەڵەی دەسکاریکردنی ماناو واتاو دەلالەتەکانی ئایەتەکانی قورئان!.

(الخروج من القول بوقوع التحريف في القرآن الى الوقوع في تحريف معاني ودلالات آيات القرآن).

ئەمەش هەمووی لە پێناوی ئەوەی دەسبەرداری ئەو بۆچوونانەی خۆیان نەبن کە پێچەوانەی قورئانە

٤-بەوانەشەوە ناوەستن بەڵکو ڕێو شوێنێکی زۆر ترسناکتر دەگرنەبەر بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو تۆمەتانەی دەدرێتە پاڵیان لە بارەی قورئانەوە،ئەویش ئەوەیە لە جیاتی ئەوەی ئەو زانایانە تۆمەتبار بکەن کە ئەو جۆرە قسانەیان هەڵبەستووە دەچن زانایانی سوننە تۆمەتبار دەکەن کە گوایە ئەوان باوەڕیان بە ناتەواوی قورئان هەیە نەك زانایانی شیعە، بۆ ئەو مەبەستەش هەرچی دەربارەی ناسخ و مەنسوخ وتراوەو لە باسی چۆنێتی کۆکردنەوەی قورئان و ئەو شتانەی دەربارەی بسم الله الرحمن الرحيم هاتووە کە ئایا ئایەتێکە لە هەموو سوورەتەکانی قورئان یا تەنها لە سورەتی النمل بە بەڵگە دەهێننەوە

لە سەر ئەوەی کە گوایە ئەهلی سوننەش باوەڕیان بە ناتەواوی قورئان هەیە، بەو شێوەیە دەبینی لە جیاتی چارەسەرکردنی کێشەکە ئاڵۆزتری دەکەنەوە و بەڵگە دەدەن بە دەست دوژمنانی ئیسلامەوە بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر ئیسلام.شایانی باسە هەرچی دوژمنانی ئیسلام دەیڵێن دەربارەی ئیسلام و مێژووی ئیسلام و یارانی پێغەمبەر و قورئان و فەرموودەوە هەمووی لە شیعەوە وەرگیراوە کە وێنەیەکی زۆر ناشیرینیا کێشاوە بۆ ئەو کۆمەڵگەیەی پێغەمبەر (د.خ) پێکی هێنابوو ! وە بۆ زیاتر ئاشنابوون بەو جیاوازییە کتێبی (صورتان متضادتان لجهود النبی الأعظم) دوو وێنەی دژ بەیەکی کۆششەکانی پێغەمبەری مەزن)ی أبو الحسن الندوی بخوێنەرەوە.

لە کۆتاییدا دەڵێین: هیوادارین شیعە ڕاستگۆ بن لەوەی کە دەڵێن باوەڕمان بە ناتەواوی قورئان نییە و باوەڕ بەو قسەیانەدەکەین بە سێ مەرج:

١.کتێبەکانیان پاك بکەنەوە لەو ریوایەتانەی باسی کەموکورتی قورئان و ڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئاندا دەکەن و حوکمی ناڕاستی ئێجگاری بەسەر ئەو ریوایەتانەدا بدەن و وەکو ئەهلی سوننە فەرموودەی ڕاست و هەڵبەستراو لە یەك جیا بکەنەوە لە کتێبی سەربەخۆداو لە ئاستی تیۆری و قسەدا نەیهێڵنەوەو ئیکتفا بەو قسەیە نەکەن کەبۆ چەواشە کردنی خەڵکی دەیڵێن کە گوایە مەرج نییە هەموو ریوایەتەکانی ناو ئەو کتێبە بڕواپێکراوانە ڕاستبن.

٢.حوکمی شەرع بە ڕاشکاوانە لە سەر ئەو زانایانە دەرکەن کە باوەڕیان بە ڕوودانی گۆڕانکاری و بوونی کەموکورتی هەیە لە قورئاندا.

٣. دەست لەو تەئویل و لێکدانەوە بێماناو بێبنەمایانە هەڵگرن کە بۆ قورئانی دەکەن بۆ سەلماندنی ئیمامەتی عەلی وەکو ئەوەی کە قورئان هیچ

ئیش و مەبەستێکی نەبووە دەرخستنی گەورەیی ئیمامی عەلی و ئیمامەتی ئەو نەبێت!

(٢) جنێودان بەصەحابەو تاوانبار کردنیان بەوەی کە لەپاش پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵگەڕاونەتەوە و فەرمانەکانی خواو پێغەمبەریان بەجێ نەهێناوە.

پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنصارەکان لەسەقیفەی بەنی ساعیدە[1] کۆبوونەوە بۆ دیاریکردنی جێ نشینی پێغەمبەر(ﷺ) وەلەئەنجامدا سەعدی کوڕی عوبادەیان هەڵبژارد ویستیان بەیعەتی بدەنێ. کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە موهاجرین یەکسەر ئەبوبەکرو عومەر و ئەبو عوبەیدە بەرەو سەقیفە کەوتنە ڕێ، لەوێ لەپاش موناقەشەیەك کەلە نێوان ئەنصارو موهاجریندا ڕوویدا لەبەربەهێزی بەڵگەی موهاجرین هەموو قەناعەتیان هاتە سەر ئەوەی کە ئەبوبەکری صدیق بکرێت بەخەلیفەی پێغەمبەر و سەرگەورەی موسوڵمانان و هەموو ئەنصارەکان بەیعەتیان دایێ تەنها سەعدی کوڕی عوبادە نەبێت کە تا ئەو ڕۆژەی مرد لە (١٥)ی کۆچیدا بەیعەتی بەکەس نەدا.

عەلی و زوبەیر کە لەڕیزی صەحابە گەورەکاندا بوون لە سەرەتادا لەم کارە ڕازی نەبوون و دڵگران بوون بەوەی کە ئەم کارە بەبێ وەرگرتنی ڕای ئەوان ئەنجامدراوە بەڵام لەئەنجامدا ئەوانیش بەیعەتیان دا بەئەبوبەکر.

ئەم کارەی صەحابە بەڵگەیە لەسەر سێ شت:

---

[1] سەقیفەی بەندی ساعیدە/ شوێنێك بوو لەمەدینە ئەوس و خەزرەج پێش ئیسلام تێیدا کۆدەبوونەوە وەکو دار الندوە لە مەککەدا.

١) نەبوونی هیچ دەقێك لەئایەت و فەرموودە لەسەر عەلی و کەسی تر.
٢) نەبوونی بەیعەت لەگەردنی کەسدا بەرامبەر بەئیمامی عەلی.
٣) بلاوبوونەوەی بیرۆکەی: کێ شیاوترە بۆ خیلافەت یا کێ ببێت بەخەلیفە لەپاش مردنی پێغەمبەر (ﷺ) لەناو صەحابییەکاندا لەدوای مردنی پێغەمبەر سەری هەلدا.

ئەم دەلالەتانە هەلۆێستی شیعەی ئیحراج کردووە چونکە پێچەوانەی عەقیدەی شیعەیە لە ئیمامەتدا جا یادەبێ بەحوکمی ئەو ئایەتانەی قورئان کە مەدحی صەحابە دەکات و بەحوکمی عەقل‌و لۆژیك پشتگیری لە هەلۆێست‌و کاری ئەو هاوەلانە بکەن و بەراستی بزانن، ئەوکاتەش واتە هەلوەشاندنەوەی بیروباوەرەکەی خۆیان و دەست هەلگرتن لێی وەیا دەبێ دەستبگرن بەعەقیدەو بیروباوەرەکەی خۆیانەوە و پشت لەو هەموو ئایەتانە هەلکەن کە لە ستایشی هاوەلاندا دابەزیووە و خۆیان گێل کەن لەو هەموو راستییەو هاوەلان تاوانبارب‌کەن بەخیانەت و هەلگەرانەوە و پشتگوێ خستنی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ).

دیارە کەسانێك سەرەرای ئەو هەموو ئایەتانەی هاتووە دەربارەی پاراستنی قورئان بتوانن بلێن قورئان گۆرانکاری تێدا کراوە و کەم‌و کوری رووی تێ کردووە، دەتوانن صەحابەکان تاوانبار بکەن بەوەی کە خیانەتیان کردووەو فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوایان پشتگوێ خستووە و پشتیان لەوبەیعەتە هەلکردووە کە داویانە بەعەلی!!

بەلێ ئەوە بوو لەئەنجامدا ئەمەیان هەلبژارد کە دەست بەبیروباوەرەکەی خۆیانەوە بگرن و هاوەلانی پێغەمبەر تاوانبار بکەن!

تاوانبار کردنی هاوەلان بەهەلگەرانەوە و خیانەت بناغەیە بۆ تاوانبارکردنی قورئان بەدەسکاری و گۆرانکاری.

بەوشێوەیە دەبینین هەڵوێستی شیعە لەصەحابەکانیش هەر لەمەسەلەی ئیمامەتەوە سەرچاوەی گرتووە.

هەندێك کەس وادەزانن هەڵوێستی شیعەی ئەمڕۆ لە یارانی پێغەمبەر جیاوازە لە شیعەی کۆن. ئەمە لە ڕاستیدا نەزانی ئەو کەسانە دەردەخات چونکە لە هەڵوێستی شیعە هیچ شتێك نەگۆڕاوە تەنها جۆری دەربڕینەکە نەبێت، شیعەی جاران بە ڕاشکاوی دەیا نوت هەموو صەحابەکان هەڵگەڕانەوە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر چوار پێنجێك نەبێت، بەلاّم شیعەی ئەمڕۆ هەمان قسە بە جۆرێکی تر دەکەن، دەڵێن صەحابە سێ جۆرن جۆرێکیان دووڕوو بوون، جۆرێکیان بۆ بەرژەوەندی بووبوونە موسوڵمان و جۆری سێهەمیان دڵسۆزو ڕاستگۆبوون مەبەستیشیان لێیان هەر ئەوچوار پێنجەن کە پێشینانیان باسیان کردوون. بڕوانەکتێبی( معالم المدرستين)ی مرتضى العسكري لە باسی صەحابەدا.

(٣) تەقییە(التقيّة):

تەقییە لەزمانی عەرەبیدا بەمانای پاراستن دێت وە لە شەرعیشدا (یا لەزاراوەدا) بەوحاڵەتە دەوترێت کە ئەگەر کەسێك هەڕەشەی کوشتن یا ئازاردانێکی گیانی یا ماڵی لێدرا لەبەرئەوەی کە موسوڵمانە دەتوانێ بەهەندێ قسە بەزار بیڵێت خۆی دەرباز بکات با ئەو قسانەش کوفر بن وەکو جنێو دان بەخوا یا بە پێغەمبەر یا بە موسوڵمانان وەیا حەقیقەتی عەقیدەی خۆی بشارێتەوە، ئەمە لەشەرعدا روخصەتی پێ دەگوترێت و بەرامبەرەکەی عەزیمەتە واتە هەڕەشەو ترساندن کارت تێ نەکاتو حەقیقەت بڵێیتو عەقیدەی خۆت دەرخەیت و وشەی کوفرو ناشەرعی بەسەر زارتدا نەیەت، وە عەزیمەتیش لێرەدا لەروخصەت لە پێشترە لەشەرعدا.

بەڵگەش لەسەر ئەم روخصەتە بریتییە لەم دووئایەتە(لا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ) (آل عمران:٢٨)

وەئایەتی: (مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْأِيمَانِ وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْراً فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (النحل:١٠٦)

واتە دەبێت لە دڵەوە بڕوادار بیت و پێشت ناخۆش بێت ئەو کارە دەکەیت، نمونەش لەسەر ئەم تەقییەیە:

عەماری کوڕی یاسرە کاتێك داوایان لێکرد جنێو بەخواو پێغەمبەر بداتو مەدحی بتەکان بکات ئینجا ئازادی دەکەن ئەویش ئەو کارەی کردو ڕزگاری بوو وە پێغەمبەریش(ﷺ) سەرزەنشتی نەکرد بەڵکو فەرمووی ئەگەر دووبارەیان کردەوە تۆش ئەم کارە دووبارە بکەرەوە.

هەروەها ئەو صەحابییەی کە موسەیلەمەی درۆزن لەژێر هەڕەشەی کوشتندا داوای لێدەکرد بڵێ باوەڕم بە پێغەمبەرایەتی تۆ هەیە ئەویش ئەوکارەی کرد و پێغەمبەر(ﷺ) سەرزەنشتی نەکرد بەڵام کاری برادەرەکەی بەباشتر زانی کە ڕازی نەبوو دان بە پێغەمبەرایەتی موسەیلەمەدا بنێت تا پارچە پارچەیان کردو کوشتیان.

ئەمە مانای تەقییەو چۆنێتی بەکارهێنانیەتی لەفکرو عەقیدەی ئیسلامیدا بەڵام لای شیعە بەمانایەکی فراوانتر و لە بوارێکی فراوانتردا بەکار دەهێنرێتو لەجیاتی ئەوەی بەڕوخسەت لەقەڵەمی بدەن بەعیبادەتێك و بە بنەمایەك لە بنەماکانی مەزهەبی لەقەڵەمی دەدەن.

ئەم تێگەیشتن و هەڵوێستە جیاوازەی شیعە بۆ تەقییە دەگەڕێتەوە بۆ مەسەلەی خەلافەت و هەڵوێستی ئیمامی عەلیو نەوەکانی لەمەسەلەی

ئیمامەت و خەلیفەکان، واتە بیرۆکەی تەقییەش بەوشێوەیەی شیعە لێی تێدەگەن دیسانەوە لە ئیمامەتەوە سەرچاوەی گرتووە، بابزانین چۆن:

وەکو لەوەبەر وتمان شیعە باوەڕیان وایە کە ئیمام دەبێ خوا دیاری بکات نەك موسوڵمانان هەڵیبژێرن وە ئیمامی عەلیش خواو پێغەمبەری خوا دایانناوە بەئیمامی موسوڵمانان لەدوای پێغەمبەر و پێغەمبەر بەیعەتی بۆ وەرگرتووە، ئەمەش وا پێویست دەکات کە ئیمامی عەلی و نەوەکانی داکۆکییەکی زۆریان بکردایە لەسەر ئەو مافە زەوتکراوەی خۆیان و بەهیچ شێوەیەك ملیان نەدایە بۆ ئەوکارەی کەصەحابە و خەلیفەکان کردیان بەڵام ئەوەی کە ڕوویدا پێچەوانەی ئەم شتە بوو، ئیمامی عەلی بەبەیعەتی بەهەرسێ خەلیفەکەی پێش خۆی داوە ویارمەتی داون و پشتگیری کردوون.

هەروەها نەوەکانی ئیمامی عەلی حوسەینی لێ بترازێ کە دژی یەزید وەستا- هەموویان بێدەنگ بوون لەئاستی ئەو مافەی لێیان زەوت کراوە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو یەکێکی وەکو ئیمامی حەسەن بەویستو ئیرادەی خۆی دەست لە خیلافەت دەکێشێتەوە بۆمعاویەو بەیعەتی پێ دەدات.

ئەم قسەو هەڵوێستانەی ئیمامی عەلی و نەوەکانی چەند شتێك دەگەیەنێت:

١) نەبوونی هیچ دەقێك دەربارەیان نەئایەت و نەفەرموودە بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەوانیش قەناعەتیان وابووە کە خەلیفە دەبێ موسوڵمانان هەڵیبژێرن نەك خەلیفە لە لایەن خواوە دیاریکرابێت چونکە ئەگەر وا بوایە بۆیان نەبوو دەست هەڵگرن لەومافە چونکە ئەو کاتە لەدەستی خۆیاندا نەدەمایەوەو دەبووە ئەرکێك کە خوا خستبوویە ئەستۆیان.

٢) هیچ بەیعەتێك لەگەردنی صەحابەدا نەبوو بۆ ئیمامی عەلی، ئەگەر هەبوایە بیری دەخستنەوە یان نەوەکانی باسیان دەکرد لەگەڵ بەرامبەرەکانیاندا.

٣) خیلافەتی ئەو خەلیفانە ڕاست بووە، چونکە ئەگەر ڕاست نەبوایە چۆن بەیعەتیان دەدانێ و یارمەتییان دەدان و پشتگیرییان لێدەکردن و بەگوێیان دەکردن. ئەم هەڵوێستو قسانەی ئیمامی عەلی و ئەهلی بەیتەکەی هەڵوێستی شیعەی ئیحراج کردووە و خستوونیەتە تەنگژەیەکی گەورەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر ئێوە خۆتان بەهەوادارو شوێن کەوتووی ئەهلی بەیت دەزانن بۆچی لەگەڵ ئەواندا هاوهەڵوێست نین، بۆچی ئەوان بەیعەتیان داوە بەو خەلیفانە و هاوکارییان کردوون و ژن و ژن خوازیان لەگەڵدا کردوون کەچی ئێوە دوژمنایەتییان دەکەن؟! یا دەبێ ئێوە هەڵەبن و ئەو شتانەی دەیلێن دەربارەی ئیمامەت و ئەهلی بەیت هەڵەبێت وەیا دەبێ ئیمامەکان بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵنەسابن و نەچووبێتنە ژێرئەوئەرکەی خوا خستوویەتە ئەستۆیان وبێ ئەمری خوایان کردبێت و حەقیقەتیان شاردبێتەوە لە موسوڵمانان.

دیارە شیعە ناتوانن هیچ کام لەم دووشتە بڵێن ،نەدەتوانن بڵێن ئێمە هەڵەین وە نەدەتوانن بڵێن ئەهلی بەیت هەڵە بوون، ئەی دەبێ مەسەلەکە چی بێت؟

ئەمە وای لە شیعە کرد بەدوای شتێکدا بگەڕێن خۆیانی پێ دەرباز بکەن لەم کێشەیە، تاقە ڕێگەش ئەوەبوو کە بڵێن ئەهلی بەیت هەرچییەکیان کردبێت لەڕووی تەقییەوە کردوویانە و ئەوە حەقیقەتی هەڵوێست و بیروبۆچوونی خۆیان نەبووە بەڵکو بەدرێژایی ژیانیان ناڕازی بوونە لەو

خەلیفانە و بەشەرعییان نەزانیوە. بۆ سەلماندنی ئەم بیروبۆچوونەی خۆیان دەیان فەرموودەیان داوەتە پاڵ پێغەمبەرو ئەهلی بەیتەکەی کەلە شوێنی خۆی دا ئاماژەی بۆ دەکەین.

ئەمە یەکێکە لەو هۆکارە سەرەکییانەی کەبوو بەهۆی سەرهەڵدانی بیرۆکەی تەقییە لەناو شیعەدا بەوشێوە فراوانە،بەو شێوەیەی کە بۆتە هاوتای درۆو دوو ڕوویی و فێڵ کردنو فریودانی خەڵکی سادەو بێ دەسەڵات ولە حاڵەتێکی (إستثنائي)یەوە بگۆڕێت بۆ بنەمایەك لەمامەڵەکردنی شیعەدا لەگەڵ غەیری خۆیاندا بائەو غەیرەش بێ دەسەڵات و بێ توانا بێتو هەڕەشەیان لێ نەکات.

هۆکارێکی تر بۆ ڕەگ داکوتانی تەقییە لەناو شیعەدا بریتی بوو لەوهەموو عەقیدە چەوتانەیان دەربارەی قورئان و صەحابە و خێزانەکانی پێغەمبەرو دەیان شتی تر(کەلەمەودوا باسی دەکەین) کەنەیاندەوێرا لای هەموو کەسێك ئاشکرای بکەن بەتایبەت لەو سەردەمانەی کە ئەهلی سوننە دەوڵەتیان هەبوو وەزانای گەورەو بەرزیان هەبوو وە شیعە کەمایەتی بوون ئەهلی سوننەش باشیان دەناسین و ئەوانیش نەیاندەتوانی ئەو بۆ چوونانەی خۆیان ئاشکرابکەن، ئەمە وای لێکردن دەق بەوخووەوە بگرنو هەرچی سیفاتی دووڕوویی و درۆزنی و فێڵ کردن بێت بەناوی تەقییەوە لەناویاندا بڵاوبێتەوە.

دەبینی عەقیدەی تەقیەش بەوشێوەیەی شیعە مومارەسەی دەکەن نەك بەوشێوەیەی لەعەقیدەو فیکری ئیسلامیدا هاتووە لەمەسەلەی ئیمامەتەوە سەرچاوەی گرتووە.

هەندێك وادەزانن کە شیعەی ئەمرۆ تەقییە ناکەن چونکە پێویستییان پێی نەماوە و دەوڵەتی خۆیانیان هەیەو کەس نەماوە لێی بترسن. لە ڕاستیدا

ئەمە ناشارەزایی ئەو کەسانە دەردەخات بە بیروباوەڕی شیعەو سروشتی شیعە چونکە تەقییە بووەتە بەشێك لە کەسایەتی شیعەو بووەتە سەلیقە بۆیان و ڕێنماییەکانیان بە ڕاشکاوی دەڵێن: تەقییە بکەن لەگەڵ ئەوانەی لێیان ناترسن بۆ ئەوەی ببێت بە سەلیقە بۆتان لە گەڵ ئەوانەی لێیان دەترسن.

شیعە لەم ڕۆژەدا تەقییە تەنها لەبەر ترس بەکارناهێنن بەڵکو بە پلەی یەکەم لە بانگەوازدا بەکاریدێنن بۆ لە خشتە بردنی ئەو کەسەی دەیانەوێت کاری بکەنەسەر بۆیە دەبینی بە هەمیشەیی دووجۆر ئاخاوتنیان هەیە، جۆرێکیان تایبەتە بە خۆیان کە بە ڕاشکاوی جنێودەدەنە خەلیفەکان و هاوەڵان و خێزانەکانی پێغەمبەر و ئەو ریوایەتانە ڕاڤە دەکەن کە زیادەڕەوی تێدایە دەربارەی ئیمامەکانیان، وە جۆری دووەم بۆ غەیری خۆیانە کە ڕاستی بیروباوەڕەکانیان دەشارنەوە و خۆیان وا نیشان دەدەن کە ڕێز لە خەلیفەکان و یاران و خێزانەکانی پێغەمبەر دەگرن.

**(٤) عەقیدەی بەداء(البداء):**

بەداء لەعەرەبیدا بەمانای دەرکەوتن دێت وەلە زاراوەی شیعەدا بەومانایە بەکاردەهێنرێت کە خوا خەبەرێك بدات یا شتێك بفەرمووێت بەڵام دُوایی بۆی دەربکەوێت کە ئەو مەسەلەیە وانییە کە خەبەری لێداوە یاشتێك بڕیار بدات دوایی وا دەرنەچێت!

ئەم عەقیدەیەش بۆیەکەم جار لەسەردەمی جعفر الصادق دا سەری هەڵدا ئەویش لەبەرئەوەی کە ئیسماعیلی کوڕی جعفر الصادق کە کوڕە گەورەی باوکی بوو وە بەجێ نشینی باوکی ناسرابوو لەژیانی باوکیدا کۆچی دوایی کرد، ئەمە لەرزەیەکی لەعەقیدەی شیعەدا دروست کرد کە چۆن ئیمام

خەبەری داوە کەئیسماعیلی کوڕی پاش خۆی ئیمامە و کەچی ئەم لەژیانی باوکیدا دەمرێت لێرەدا یادەبێ ئەو بنەمایەی دایانناوە بۆ ئیمامەت هەڵەبێت کە ئیمامەت لەباەکەوە بۆ کوڕی گەورە دەمێنێتەوە وەیا دەبێ ئیمامی جەعفەر هەڵەی کردبێت وە یا دەبێ خوای گەورە هەڵەی کردبێت و بە هەڵە ئەو خەبەرەی دابێت.

لێرەشدا شیعە وەکو هەموو شتێکی تریان لەجیاتی ئەوەی چاوێك بەعەقیدەو بیروباوەڕەکەی خۆیاندا بـخشێننەوە و دان بەهەڵەی خۆیاندا بنێن و پاشگەز ببنەوە لەوبیروباوەڕە چەوتەیان ئەمجارە هاتن تۆمەتەکەیان دایە پاڵ خواو ئەویان تاوانبارکرد بەوەی کە هەڵەکە لای ئەوەوە بووەو ئەو وای زانیوە ئیسماعیل ئیمامە لەدوای باوکی ولەدواییدا بۆی دەرکەوتووە کە ئیسماعیل ئیمام نییە بەڵکو موسى الكاظم ئیمامە! تعالى الله عما يقولون علواً كبيراً.

بەڵگە لەسەر عەقیدەی بەداء لەکاتی باسکردنی ئەم عەقیدەیەدا دەهێنینەوە و لێرەدا تەنها ئەوەمان بەسە کە هۆوکاتی سەرهەڵدانی ئەم عەقیدەیە بزانین، ئەویش ئاشکرا بوو کە وەکو ماباقی بیروباوەڕەکانی تری شیعە لەمەسەلەی ئیمامەتەوە سەری هەڵداوە(١)کاتێك کە بینییان ئەو بنەمایانەی دایانناوە دەربارەی ئیمامەت هەڵوەشایەوە و بەتاوانبارکردنی خوا خۆیان دەربازکرد لەو کێشەیە.

بەوشێوەیە دەبینین شیعە بەهیچ شێوەیەك ئامادەنین دەست لەو بیروباوەڕە هەڵگرن دەربارەی ئیمامەت هەرچەندە دەیان بەربەست هەبێت دژی !.

(١) کاتێك بینیان قورئان بەگوێرەی بەرژەوەندی ئەوان مەسەلەکە باس ناکات قورئانیان تاوانبارکرد بەوەی کە گۆڕانکاری تێدا ڕوویداوە و دەستیان لە بۆ چوونەکەی خۆیان هەڵنەگرت، وەکاتێك بینیان هەڵوێستی صەحابە دژی

بۆچوونەکانیان دەوەستێت و پێچەوانەی بیروباوەڕەکانی ئەوان دەسەلمێنێت دەستیان لەبۆ چوونەکانی خۆیان بەرنەدا بەڵکو صەحابەیان تاوانبارکرد بەوەی خیانەتیان کردووەو سەرپێچی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوایان کردووە.

(٤) وەکاتێك بینیان هەڵوێستو قسەکانی عەلی‌و ئەهلی بەیتەکەی پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئەوانە و خزمەت بەو عەقیدەیەی خۆیان ناکات لەجیاتی ئەوەی دەست لە بۆچوونەکانی خۆیان هەڵگرن و بچنە سەررێگای ئیمامەکانیان هاتن ئیمامەکانی خۆیانیان تاوانبارکرد بەوەی کە هەرچییەکیان کردووە و هەرچییەکیان وتووە لەڕووی تەقییەوە کردوویانەو وتوویانە و یەکێکی وەکو ئیمامی عەلی ماوەی ٢٥ ساڵ تەقییەی کردووەو حەقیقەتی خۆی شاردۆتەوە و بەفرت‌وفێڵ لەگەڵ خەلیفەکاندا ژیاوە.

ئێستاش کەسەکێك لەوینەمایانەی بۆ ئیمامەت دایانناوە هەڵدەوەشێتەوە لەجیاتی ئەوەی دەست لەوبۆچوونانەی خۆیان هەڵگرن و دان بەهەڵەی خۆیاندا بێنن هاتن ئەمجارە خوایان تاوانبار کرد بەوەی کە ئەو هەڵەی کردووە نەك شیعە.

واتە بەتاوانبارکردنی قورئان و صەحابە و ئەهلی بەیتەوە نەوەستان بەڵکو خواشیان تاوانبار کرد، واتە بەهیچ شێوەیەك ئامادەنین دەست لەو عەقیدەیەی خۆیان هەڵگرن، ئەوەش وەکو لەوەبەر وتمان هۆکەی ئەوەیە کە ئەوان هەر لەسەرەتاوە بەچەوتی هێناویانە و کەوتوونەتە دوای شەیتانەوە و بەهیچ شێوەیەك ناتوانن خۆیان لەوداوەی شەیتان دەرباز بکەن.وە ئەو سروشتی شوێنکەوتوانی هەواو ویستەکانی نەفسە، واتە شیعە لەهەموو کاتێك و بوارێکدا دەیسەلمێنێت کە ئەهلی ئەهوائن.

شیعەی ئەمڕۆ کاتێك ڕەختەیان لێدەگیرێت دەربارەی بەداء لە جیاتی ئەوەی بە خۆیاندا بچنەوەو دان بە هەڵەی ئەو بیروباوەڕەدا بنێن هەوڵ دەدەن

له فکری ئیسلامییەوە ڕەگوڕیشەی بۆ بدۆزنەوە و بیشوبهێنن بە مەسەلەی دوعاو سڕینەوەی گوناه و ناسخ و مەنسوخ وهتد کە هەمووی جیاوازە لەو بەدائەی کە لەسەر زمانی ئیمامەکانیان هاتووە و ڕاڤەیان کردووە و جگە لە نەزانین دانە پاڵ خوا هیچ مانایەکی تر هەڵناگرێت.

سەیر لەوەدایە کە شیعەی ئەمڕۆ سەرەڕای ئەوەی کە پێویستییان بەم بیروباوەڕە نەماوە چونکە زنجیرەی ئیمامەکانیان تەواو بووە کەچی هێشتا هەر لە زیارەتنامەکانیاندا دەیخوێننەوە بەتایبەت لەسەر گۆڕی هەردوو ئیمامی دەهەم و یازدەهەم لە سامەڕا، لەوەش سەیرتر ئەوەیە کەهەوڵدەدەن ئەم بیرۆکەیە لە بیری خەڵکی ببەنەوە کەچی لە زیارەتنامەکانیانی دەرناهێنن!.

## ٥) عەقیدەی گەڕانەوە بۆ دونیا پێش ڕۆژی قیامەت (الرجعة):

ڕەجعەت واتە گەڕانەوە، لەزاراوەی شیعەشدا واتە گەڕانەوەی ئیمامەکانی ئەهلی بەیت بۆ ئەم دونیایە و فەرمانڕەوایی گرتنە دەستو سەندنەوەی تۆڵە لە دوژمنەکانیان.

ئەم عەقیدەیەش بەهەمان شێوە لە ئیمامەتەوە سەرچاوەی گرتووە، بابزانین چۆن:

وەکو لەوەو بەر وتمان شیعە باوەڕیان وایە کە ئیمام دەبێ خوا دیاری بکات وە بەڕای ئەوان خوا دیاری کردووە، یەکەمیان عەلی کوڕی ئابی تالیبە و دوازدە هەمیشیان محمدی مەهدی یەکە لە پێنج ساڵیدا دیارنەماوە.

وەیەکێك لەو فەرموودانەی بەبەڵگە دەیهێننەوە ئەو فەرموودەیەیە کە دەفەرموێت خەلیفەکان دوازدەن و هەر هەموویان لەقورەیشن.

بەگوێرەی عەقیدەی شیعە دەبوایە ئەو دوازدە ئیمامە هەرهەموویان فەرمانڕەواییان بکردایە بەڵام کاتێك بینییان پاشایان ئیمامەتیان نەکردووە

بەمانای فەرمانڕەوایی کردن شیعەی خستۆتە هەڵوێستێکی نارەحەتەوە، کە ئەگەر ئەوکەسانە خوا دیاری کردوون بەئیمام چۆن ئەم بڕیارەی خوا نایەتە دی. ئەمە وای لە شیعە کردووە بیر لە شتێك بکەنەوە خۆیانی پێ دەباز بکەن لەم کێشەیە، ئەوشتەش بریتی بوو لە عەقیدەی (رەجعەت) واتە ئیمامەکان پاش مردنیان دەگەڕێنەوە بۆ دونیا و فەرمانڕەوایی دەگرنە دەست،بەوەشەوە نەوەستاون بەڵکو دەڵێن دوژمنەکانیشیان زیندوودەکرێنەوە و تۆڵەیان لێ دەسێننەوە.

ئەوەی کە وای لەزانایانی شیعە کردووە ئەم بیدعەتە گەورەیە دابهێنن ئەوەبوو کە نایانزانیوە چۆن وەڵامی شوێن کەوتوانیان بدەنەوە و خۆیان لەو دژبەیەك(تناقض)ە ڕزگار بکەن.

لەلایەکەوە وتوویانە خوا ئەمانەی داناوە بەئیمام و گەورەی موسوڵمانان لەولاشەوە دەبینین ئیمامەکانیان نەك هەر دەسەڵاتیان بەدەست نییە بەڵکو لاوازنو پارێزگاری خۆشیان پێ ناکرێت!

ئەم دووشتە چۆن بەیەکەوە دەگونجێت؟ ئەمە وای لێکردوون عەقیدەی رەجعەت دابهێنن و شوێن کەوتوانیان هەڵخەڵەتێنن و هیواداریان بکەن.

سەیر لێرەدایە کە شیعە پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە هیچ کام لەوانەی بەئیمامیان دەزانن دەسەڵاتیان نەکەوتە دەست جگە لە ئیمامی عەلیو ئیمامی حەسەن بۆ شەش مانگ و پاشان دەستی لێ هەڵگرت کەچی هەر دەست بەرداری ئەو ئەو بیروباوەڕە بێبنەمایانەی خۆیان نابن.

٦) دیارنەمانی محەمەدی مەهدی:

شیعە قەناعەتیان وایە کە محمدی کوڕی حسن العسکری لە ساڵی ٢٦٠ ك لەتەمەنی پێنج ساڵیدا لە سامەڕڕا لە ترسی عەبباسییەکاندا خۆی شاردۆتەوە ودیارنەماوە.

له پێشدا تا ساڵی ٣٢٩ کۆچی توانراوه پەیوەندی پێوەبکرێت ئەویش تەنها لەلایەن چوارکەسەوە کەیەك لەدوای یەك هاتوون و پێ یان دەگوترێت(نواب المهدی) یا أبواب المهدی وە بەم غەیبەتەی مەهدیش دەڵێن غەیبەتی بچووك (الغیبه الصغری) وە پاش ساڵی ٣٢٩ ك کە دوا نائیب مردووە ئیتر کەس چاوی بەمەهدی نەکەوتووە و غەیبەتی گەورە(الغیبه الکبری) ڕووی داوە کە ئاشکرا نییە تاکو کەی بەردەوام دەبێت.

شیعە خۆیان دەڵێن غەیب بوونی محمدی مەهدی و گەڕانەوەی بۆ دونیا ئیمامەکانی پێش خۆی خەبەریان لێداوەو لەفکری شیعیداشتێکی زانراوبووە بەڵام لەبەرئەوەی هەرچی زانای فەرموودە و ریـجالیان هەیە لەپاش مردنی محمد المهدی یەوە هاتوون ئێمە یەقینمان هەیە کە هەرچی لەوبارەیەوە هاتووە هەروەکو شتەکانی تر بەسەر زمانی ئیمامەکانیانەوە هەڵیان بەستبێت و لەوەبەر شتێکی وا نەزانرابێت ئەگینا چۆن کاتێك ئیسماعیلی کوڕی جعفر الصادق مرد زۆرێك لە شیعەکان وتیان نەمردووە بەڵکو غەیب بووەو دەگەڕێتەوە و لەئەنجامدا فیرقەی ئیسماعیلی پەیدابوون، ئەگەر مەسەلەی(١٢) ئیمام بزانرایە و ئەوئیمامانە خەبەریان بدایە کە ئیمامی دوازدەهەم ئیمامی مەهدییە و غەیب دەبێت وپاشان دەگەڕێتەوە چۆن هەر لە کۆنەوە ئەم ناوە لەدەیان کەس لە (أهل البیت) دەنرا کەیەکەم کەسیان (محمد الحنفیه) بوو وە دواکەسیان محمد بن الحسن العسکری بوو!

کەواتە هرچی ڕیوایەت هاتووە دەربارەی محمد المهدی هەمووی هەڵبەستراوی زاناکانی شیعەیەو ئیمامەکان لێیان بێئاگان.

ئێستا ڕەنگە بپرسی ئەی عەقیدەی غەیب بوونی محەمەدی مەهدی و گەڕانەوەی لە چییەوە سەری هەڵداوەو چ پەیوەندییەکی بە ئیمامەتەوە هەیە؟

لەوەڵامدا دەڵێین: یەکێك لەوبنەمایانەی شیعە دایاننـاوە بۆ ئیمامەت ئەوەیە کە ئیمامەت دەبێ لەوباوکەوە بۆ کوڕی گەورە بگوێزرێتەوە تەنها حەسەن و حوسەین نەبێت کە برا بوون و لەحەسەنەوە گوێزراوەتەوە بۆ حوسەین و پاشان لەنەوەکانی حوسەیندا بەوشێوەیەی لەسەرەوە باسمان کرد مایەوە واتە لەباوکەوە بۆکوڕی گەورە.

زۆربەی مێژوو نوسیانیش ڕایان وایە کە حسن العسکری منداڵی نەبووە بۆیە پاش مردنی سەروەت و سامانەکەی بۆ جەعفەری برای ماوەتەوە، وەلەبەرئەوەیە شیعە ڕایان لە جعفر نییە و بەدرۆزن و پیاو خراپ لەقەڵەمی دەدەن چونکە پاش حسن العسکری لافی ئیمامەتی لێداو میراتەکەی لە نێوان ئەوو دایکیدا دابەشکرا[1]

هەروەها وتمان ئیمامەت لەپاش حوسەین لەبراوە بۆ برا ناگوێزرێتەوە لەبەرئەوە شیعە جارێکی تر کەوتنە هەڵوێستێکی سەختەوە و کەوتنە تەنگژەیەك و کێشەیەکی گەورەوە، ئەویش ئەوەیە کە حسن العسکری منداڵی نییە وە ئیمامەتیش لەبراوە بۆ برا ناگوێزرێتەوە ! چی بکەن و چۆن خۆیان لەم تەنگژە و کێشەیە ڕزگار بکەن؟

لێرەوە زاناکانیان چیرۆکی لەدایك بوونی محمد و غەیب بونیان داهێناو بەوشێوەیە قفڵیان لە ئیمامەت داو خۆیان لەو زۆرانبازی و مل ملانێیەی لەسەر ئیمامەت ڕووی دەدا ڕزگار کرد و کۆتایی یان بەو کێشەیە هێنا.

---

[1] ئەڵبەتە فکرەی مەهدی و غەیبەت و گەڕانەوە هەموو لە ئیسلام و ئاینەکانی تردا ئەصڵێکیان هەیە بەڵام نەك بەم شێوەیەی کە شیعە دایهێناوە ئەم شێوازەی شیعە دایهێنا لە ترسی هەڵوەشاندنەوەی قەواعیدی ئیمامەت بوو کە دەبێ پاش هەموو ئیمامێك کوڕی گەورەی ببێتە ئیمام، ئەی ئەگەر نەکوڕی گەورەی هەبوو نە بچووك ئەوکاتە چ بکەن؟ لێرەوە فکرەی مەهدی و غەیب بوونیان بەوشێوەیە داهێنا کە ئێستا زانراوە.

بەڵام لەمڵاوە دەرگایەکی تریان کردەوە بۆ لادان و لەدین دەرچوون ئەویش مەسەلەی پەیوەندی کردنە بەمەهدیەوە و پەیدابوونی دەرگاکانی مەهدییە کە ئەمیش بۆخۆی کێشەیەکی تازەی خستە ناو موسوڵمانانەوە و لەورێگایەوە دەیان دەجالو فێڵباز پەیدا بوون و چەندین پێڕو کۆمەڵی لادەر پەیدابوون کە دواهەمیان بابیەو بەهائیە بوون!!.

بەڕاستی شەیتان زۆر زانەو ئەزموونی زۆرە، چۆن هەموو جارێك بە بلیمەتانە شوێن کەوتووانی خۆی لەوکێشانە رزگار دەکات کە تێی دەکەون!!

(وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّاً شَيَاطِينَ الْأِنْسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُوراً)(الأنعام: الآية١١٢)

(أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزّاً) (مريم:٨٣)

٧) زیادەڕەوی لە ئیمامەکاندا(الغلو في الأئمة):

ئەو بیروباوەڕەی شیعە دروستی کردووە دەربارەی ئیمامەت لەوەی کە ئیمامەت کۆڵەکەیەکی گرنگە لەکۆڵەکەکانی ئیمان و یەکێکە لە بنچینەکانی دین و هەروەکو پێغەمبەرایەتی دەبێ خوا دیاری بکات چەند پرسیارێك لە مێشکدا دروست دەکات.

یەکەم: ئەوانەی کە خوا هەڵیاندەبژێرێ بۆ ئیمامەت سیفەتەکانیان چییە؟

دووەم پرسیار ئەوەیە کە بۆچی واداکۆکی لەسەر ئەو دوازدەکەسە دەکەن و دەڵێن هەرئەوانە شیاوی ئیمامەتن و خواو پێغەمبەری خوا تەنها ئەوانی دیاریکردووە بۆ ئیمامەتی موسوڵمانان لەدوای پێغەمبەری خوا، ئەوان چ جیازییەکیان هەبوو لەخەڵکی تر وە چ تایبەتمەندێتییەکیان هەبوو؟

شیعە بۆ ئەوەی پاساو بێننەوە بۆ دەست گرتن بەبیرۆکەی ئیمامەت و بەئیمامەکانیانەوە کۆمەڵێك سیفەتیان داوەتە پاڵیان و بۆئەوەی خەڵکی

قەناعەت بەوشتانە بکەن کە دەیلێن دەربارەیان کۆمەڵێك فەرموودەیان هەڵبەستووە بەسەر زمانی پێغەمبەر و ئیمامەکانیانەوە کە گوایە هەموو ئەو شتانە ئەوان خۆیان وتوویانە نەك شیعە.

ئو سیفەتانەش لەباوەڕ پێکراوترین کتێبیاندا باسکراوە کە لەسەرووی هەموویانەوە کتێبی (الکافی)یە لە نووسینی ابو یعقوب الکلینی کە ساڵی ٣٢٨ ی کۆچی مردووە. ئە سیفەتانەش بەکورتی ئەمانەن:

١) ئیمامەکان (معصومن).

لەهەڵەو گوناهی گەورەو بچووك و هیچ شتێك لە خۆیانەوە ناڵێن و هەرچیەك بڵێن لەلای خواوەیە.

٢) ئیمامەکانیان غەیب دەزانن وزانستی پێشوو کۆتایی( علم الأولین و آخرین)یان پێیە و زانستی چی بووەو چی دەبێت لەداهاتووداو ئێستا چی هەیە(علم ماکان و مایکون وماهو کائن) یان پێیە.

٣) هەموو کتێبە ئاسمانییەکان دەزانن هەرە بەوزمانانەش کە پێی دابەزیون.

٤) پلەو پایەیان لەهەموو پێغەمبەران و مەلائیکەکان بەرزترە لەوانە پێغەمبەرانی أولی العزم کە (نوح و ئیبراهیم و موسی و عیسی)ن جگە لە محمد سەلامی خوایان لیّ بێت وەلە مەلائیکە نزیك کراوەکانی لای خوا کە جبرائیل و میکائیل وئیسرافیل و عزرائیل سەلامی خوایان لێبێت.

٥) دەزانن کەی دەمرن و مردنیشیان بەدەستی خۆیانە.

٦) خاوەنی خیلافەتی( تەشریعی و تەکوینین).

تەشریعی بەمانای ئەوەی ئەوان دەبێ ئیمامی خەڵکی بن‌و لەهەموو شتێکی شەرعدا خەڵکی بۆلای ئەوان بگەڕێتەوە و حوکمڕانی موسوڵمانان بەدەستی ئەوان بێت.

وەخیلافەتی تەکوینی بەمانای ئەوەی کە هەموو گەردیلەیەك لەگەردیلەکانی ئەم گیتی و بوونەوەرە لەژێر دەسەڵاتی ئەواندایە و دەسەڵاتیان بەسەریاندا هەیە.بڕوانە کتێبی الحکومه الاسلامیه ی ئیمام خومەینی.

٧) عەلی کوڕی ئەبی تالیب لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا دەوەستێت و دۆستەکانی خۆی لەدوژمنانی جیادەکاتەوە و ئەوان دەنێرێ بۆ بەهەشت و ئەمانیش بۆ دۆزەخ (أنا قسیم الله بین الجنه والنار).

٨) عەلی کوڕی ئەبی تالیب مەلائیکەی تایبەت هاتووە بۆ لای و قسەی لەگەڵدا کردووە هەروەها فاتیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) ماوەی شەش مانگ مەلائیکە هاتووە بۆلای و دڵنەوایی کردووە و عەلی گوێی لێ بووە و هەرچی یەکی وتووە لە کتێبێکدا نوسیویەتەوە پێی دەوترێت (مصحف فاطمة).

هەروەها مەلائیکە بۆلای ئیمامەکانی تریشیان هاتووە و قسەی لەگەڵدا کردوون.

٩) عەلی هەندێك سیفەتی هەبووە پێغەمبەریش نەیبووە و پێغەمبەر خۆزگەی پێ خواستووە، وەکو ئەوەی عەلی فاتیمە ژنێتی پێغەمبەر ژنی وەکو فاتیمەی نییە، وەحەسەن و حوسێن کوڕینی پێغەمبەر کوڕی وەکو ئەوانی نییە، وە فاتیمە دایکێتی پێغەمبەر دایکی وەکو ئەوی نییە وە پێغەمبەر خەزورێتی وە پێغەمبەر خۆی(ﷺ) خەزوری وای نییە!!

١٠) ئیمامەکان پێش بەدی هێنانی بوونەوەر کۆمەڵێك نوور بوون لەژێر سێبەری عەرشی خوادا.

١١) پلەی ئیمامەت لە پلەی پێغەمبەرایەتی بەرزترە..

ئەمانە و چەندین شتی تر کە هەریەك لەوانە بەسە بۆ ئەوەی مۆرکی شرکیان بەسەردا بنێین،وە بۆ هەریەك لەو بیروبۆچوونە گەندەڵانە دەیان بگرە سەدان فەرمودەیان بەسەر زمانی پێغەمبەرو ئیمامەکانیانەوە هەڵبەستووە ئەویش بەمەبەستی ئەوەی قەناعەت بەشوێنکەوتوانیان بکەن دەست بەرداری مەزهەبەکانیان نەبن.

هۆیەکی تری سەرەکی کەوای کردووە ئەم هەموو سیفەتانە بدەنە پاڵ ئیمامەکانیان و ئەم هەموو پاڵەوانێتیانەیان بۆ دابتاشن و ئەو هەموو درۆو دەلەسانەیان بۆ بکەن و ئەو هەموو بوختانە بەسەرزمانی پێغەمبەرو ئەو پیاوانەوە بکەن ئەوەیە کە سەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکرو عومەر و خیلافەتی هەندێك لە خەلیفەکانی ئەمەوی و عەبباسی نموونەی دادپەروەری و حوکمی ئیسلامی بوون و هیچ درێغی و کەم تەرخەمییەکیان نەکردووە وە هیچ نوقسانی و کەم و کورتییەك لەفەرمانڕەواییان بەدی نەکراوە،ئەوە وای کردووە کە شیاوی ئەو پیاوانە بۆ ئەو شوێنە بسەلمێنێت و هیچ کەسێك نەتوانێ ڕخنەیان لێ بگرێت بەتایبەت سەردەمی ئەبو بەکر و عومەری کوڕی خەتتاب و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و هەندێکی تر بەڕادەیەك کە خەڵکی قەناعەت بێنن کە خەلیفە هەرگیز لەوە باشتر نابێت و لەوەندە زیاتر هیچ شتێك بۆ خەلیفە و ئیمامی موسوڵمانان پێویست نییە.

لێرەدا پێویستی دەکرد هەندێك سیفەت بدەنە پاڵ ئیمامەکانیان بۆ ئەوەی بیکەنە پاساوێك بۆ درێژەدان بە بیروباوەڕەکەیان و ڕەتکردنەوەی فەرمانڕەوایی هەموو کەسێکی تر هەرچەندە فەرمانڕەواییەکەی باش و داد پەروەرانە بێت و خەڵکی لەژێر سایەیدا بحەوێنەوە..

لەڕاستیدا مەبەستی سەرەکی ئەوانەی بانگەشەیان بۆ ئەو ئیمامانە دەکرد حوکم گرتنەدەست بوو، واتە مەبەستێکی سیاسی دونیایی بوو. بەڵام

بەرگێکی ئاینییان لێ پۆشی بوو، وە ئەوەی ئەوانە دەیانکرد دە شوبهێتە ئەوەی کە ئەمڕۆ حزبە سیاسییە تەیارەکان دەیکەن بەرامبەر بە بەرژێمەکان بەرەختە لێگرتن و پروپاگەندە لێکردن و پەیانی درۆدان بەخەڵك و داتاشینی سیفەتی پاڵەوانێتی و سۆپەرمانی بۆ سەرکردەکانی خۆیان.

بەهەرحاڵ ئەگەر ئەم زیادەڕەوییەی شیعە تەنها لەلایەن عەوام و نەفامو نەخوێندەوارەکانیانەوە بووایە گلەییمان لێ نەدەکردن چونکە بەهەمیشەیی یەکێك لە هۆکانی زیادەڕەوی نەزانییە وەکو ئیبن خلدون دەڵێت:

خەڵکی عەوام هەمیشە مەیلیان بەلای زیادەڕەویدایە.

بەڵام کێشەکە لەوێدایە کە زاناکانیان لەنەفامەکانیان توندڕەوترن لەوبوارانەدا و هەرچییەك لەوبابەتە هەیە هەمووی فەرموودەی درۆیان بەسەر زمانی پێغەمبەر و ئیمامەکانەوە بۆهەڵبەستەوە و بۆیەیەکی شەرعییان پێداوە!!

شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئەم زیادەڕەوییەی شیعە دەربارەی ئیمامەکانیان لەئاستێکی تیۆری (نظری)دا ناوەستێت بەڵکو لەبواریکردەیی و ژیانی ڕۆژانەشیاندا ڕەنگ دەداتەوە.زاناکانیان بنەما تیۆرییەکە یان بۆ داڕشتووەن و عەوامەکانیش بەکردەوە تەرجەمەیان کردووە.

بوارەکانی ئەم زیادەڕەوییەش زۆرن هەر لە هاوار پێکردن و داوای یارمەتی و بەدەمەوە هاتن و چارەسەرەوە تا خولانەوە بەدەوری قەبرەکانیاندا و قوربانی بۆ نەزردان و تاوانی منداڵ بەعبد علی عبد الحسین و عبد العباس و بڕینی سەدەها و هەزارەها کیلۆمەتر بۆزیارەت کردنی قەبرەکانیان و جنێودانو لەعنەت کردن لەهەرکەسێك کە مەزندەی ئەوەی لێبکەن ناحەزیان بوویێت.

# پێشەکی نووسەر

بەناوی خواوەندی گەورە، سوپاس‌و ستایش بۆ خواو درود لەسەر پەیامبەری خوا.

دوای ئەوەی لەماڵی پێشەوایەتی گەورەی شیعەدا لەدایکبووم لەسەردەستی گەورەترین پێشەوای ئاینی جیهانی شیعە لەسەردەمی دیارنەمانی گەورەوە[1] تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ خوێندمو پێگەیشتم و ڕەوشتی ئیسلامیم وەرگرت، ئەویش باپیرەمان پێشەوای گەورە سەیید ئەبولحەسەنی موسەوییە کە دەربارەی وتراوە:

"ئەوانی پێش خۆی لەبیر بردەوەو، ئەوانی دوای خۆیشی ماندوو کرد"[2]

لە ژیانگەیەکی وادا دەژیام کە پڕ بوو لەو قسانەی دەربارەی شیعەو شیعەگەریتی دەوترێت و لەو یاروەدۆخانەی باس دەکرا لەسەر ناکۆکی مەزهەبی نێوان شیعەو سوننە کە سەدەها ساڵە بەردەوامە، ئازاری ئەو جیاوازییە تاڵانەی نێوان شیعەو موسوڵمانانی تر دەژیام‌و دەرەنجامە خراپەکانیم لەنزیکەوە دەبینی، وە لە ژێر سایەی ئەو هەنگاوە بوێرانەی

---

([1]) بەگوێرەی عەقیدەی شیعە (موحەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەری) کە پێی دەڵێن موحەممەدی مەهدی لە ساڵی ٢٦٠ی کۆچی لەتەمەنی ٥ ساڵیدا لەبەرچاو ونبووە، لە ساڵی ٢٦٠ تا ٣٢٩ی کۆچی پێی دەوترێت سەردەمی دیارنەمانی بچوك (الغيبه الصغرى) کە گوایە تێیدا مەهدی پەیوەندی هەبووە بە نوێنەرەکانییەوە کە چوار نەفەربوون بەدوای یەکدا هاتوون ١ـ عثمان بن سعيد العمري، ٢ـ محمد بن عثمان بن سعيد العمري، ٣ـ حسين بن روح، ٤ـ علي بن محمد السمري کە ساڵی ٣٢٩ کۆچی دوایی کردووە لەدوای ئەوەوە سەردەمی دیارنەمان گەورە (الغيبه الكبرى) دەستی پێکرد کە چیتر کەس نەیتوانیوە پەیوەندی پێوە بکات.

[2] )خاوەنی ئەم قسەیە پێشەوای کۆچکردوو (شيخ محمد الحسين كاشف الغطاء)ە.(نووسەر).

باپیرەمان ئیمامی گەورە دەینا بۆ زاڵبوون بەسەر ناڕەحەتییەکانی ڕێگای دامەزراندنی پەیوەندییە ڕاستەکانی نێوان شیعەو سوننە بۆ گەیشتن بە یەکبوونی گەورە لەنێوان ئەو دوو تایەفەیەدا کە لەگەڵ سیاسەتەکانی داگیرکەرانی جیهانی ئیسلامیی کە عەقڵە داخراوەکانو دەمارگیرەکانو بازرگانانی تایەفەگەرێتی قێزەون کۆمەکی دەکەن لەیەك دەدەن، دەستم کرد بە تێگەیشتن لەمەترسیو پیرۆزی ئەو ئەرکە لەهەمانکاتدا.

باوەڕم بەم مەسەلەیە دوای ئەوە زیادی کرد کەزانیم هۆی کوشتنی باوکم لەنێوان نوێژی ئێوارەو خەوتناندا لەناو مەرقەدی ئیمامی عەلیدا لەنەجەف لەسەردەستی تاوانبارێك لەجلی مەلایەتیدا کەوەکو کار سەری بڕی لەکاتی نوێژکردندا، پلانێکی ئیمپریالیزمی بوو بۆ ئەوەی سەید ئەبولحەسەنی باپیرم ساردکاتەوە لەکارەچاکسازییەکانی، بەڵام سەید ئەبولحەسەن لەبەر ڕەزامەندی خوا دانی بەخۆیداگرتو بەرزترین نمونەی نیشانداو پەندێکی وای بە چاکسازان دادا کە تائێستا مێژووی شیعە لەیادی نەکات،ئەویش بەخۆشبوون لەبکوژی جگەرگۆشەکەیو خۆشەویستترین کەس بەلایەوە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە چاکسازان گەردەلولو زریانەکان نایانهەژێننو دژوارییەکان لاوازیان ناکەنو رقو تۆڵەسەندنەوە ئاڕاستەیان ناکەنو وەکو کێوی بەرز دەمێننەوە بەرگری دەکەن لەو بیروباوەڕانەی دەیانەوێت لەناو کۆمەڵگەدا جێگری بکەن.

دوای هەموو ئەمانە شتێکی ئاسایی بوو کە بیرۆکەی ڕادانە مەیدان بۆ ڕاستکردنەوەی شیعە لەهەندێك بیروباوەڕیان بەکردار لەخەیاڵدا سەرهەڵبدات بەتایبەتی ئەو بیروباوەڕو کردەوانەی بوونەتە هۆی ناکۆکی لەگەڵ لایەنە ئیسلامییەکانی تردا کەلە هەمان کاتیشدا ناکۆکن لەگەڵ ڕۆحی ئیسلامو

لۆژیکی دروستداو تاکو ئێستا بوونەتە شوم بەسەر مەزهەبی شیعەوەو بوونەتە هۆی شێواندنی ناویانو سڕینەوەی نیشانەکانیان نەك تەنها لە جیهانی ئیسلامی بەڵکو لە دونیادا بەگشتی.

لەهەمان کاتدا لەو باوەڕەدام کەباسکردنی هۆکان بەس نین بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە بەڵکو پێویستە چارەسەرە کردەییەکانیش پێشکەش بکرێن کە داوا لە شیعە دەکەم لەسەرتاسەری دونیادا ئەگەر چاکەی دونیاو دوارِۆژیان دەوێت دەستی پێوە بگرن، من خۆم گەیشتمە ئەنجامێکی یەکلاکەرەوە لەکاتی بەدواداچوونی ناکۆکی نێوان شیعەو لایەنە ئیسلامییەکانی تردا، ئەویش ئەوەیە کە ناکۆکی نێوانیان بەهۆی جێنشینی دوای پەیامبەرەوە (ﷺ) یان ئەوەی عەلی لەوانی تر شیاوترە نییە، چونکە دەبینین شیعەی زەیدی کە تایەفەیەکی گەورە پێکدێننو ملیۆنەها کەس دەبن باوەڕیان بەشیاوتری عەلی بۆ جێنشینی پەیامبەر (ﷺ) هەیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستیو برایەتی باڵی کێشاوە بەسەر پەیوەندی نێوان ئەوانو مسوڵمانانی سوننەدا، کەواتە هۆی سەرەکی ناکۆکی نێوان شیعەی ئیمامیو لایەنە ئیسلامییەکانی تر مەسەلەی جێنشینی پەیامبەر نییە، بەڵکو هەڵوێستی شیعەیە لە خەلیفە ڕاشیدەکانو قسە پێوتنیانە، ئەو شتەی کە لای شیعە زەیدییەکانو لایەنەکانی تردا نییە، ئەگەر بهاتبایە شیعەی ئیمامیش ڕێوشوێنی زەیدییەکانیان هەڵگرتایە جیاوازییەکان کەم دەبوونەوەو ڕووبەری ناکۆکییەکانیش تەسکتردەبوونەوە، بەڵام شیعەی ئیمامی کەوتە گیانی خەلیفە ڕاشیدەکان بە بریندارکردنو کەمکردنەوە لە پلەوپایەیانو لەوێشەوە کێشەو ناکۆکییەکە سەری هەڵدا.

من شەوو ڕۆژ لەخوا دەپاڕامەوە کە زانیاریو بەرچاوڕوونیو هێزو سەرکەوتنم پێببەخشێت بۆ گەیاندنی پەیامی ڕاستکردنەوە، ئەو پەیامەی کەهەر لەتەمەنی لاوییەوە چاوم تێبڕیبوو، ئەنجامەکەشی ئەم کتێبەیە:

(شیعەو ڕاستکردنەوە: ململانێی نێوان شیعەو تەشەییوع) کەئەمڕۆ پێشکەشی شیعەکانی هەموو شوێنو سەردەمێکی دەکەم.

ئەم کتێبە: بانگەوازێکە بۆ شیعە لە باوەڕێکی ڕەها بەخواو پەیامی ئیسلامی هەمیشە زیندوو و هێزی مسوڵمانانو ڕێزی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە، بانگەوازێکە بانگەشە دەکات ڕێگای چاکسازییە گەورەکان بۆ کۆتایی هێنان بەناکۆکی مەزهەبی نێوان شیعەو موسوڵمانانی تر بۆ هەتاهەتاو تا ڕۆژی قیامەت، هاوارێکە بۆخواو بۆ بەخەبەرهێنانەوەی شیعە لەخەوێکی قووڵی هەزارو دووسەد ساڵە، چیرۆکی ململانێیەکی تاڵە لەنێوان مسوڵماناندا تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ. بانگەوازی ژیریو ئیمانە بۆ شیعە بۆ ئەوەی تۆزی ساڵانێکی زۆر لەخۆیان بتەکێننو شۆڕشێکی بێووچان بەرپابکەنو چاوەڕوانی ئەو سەرکردە مەزهەبییانە نەکەن کە بوونە هۆی ئەم دواکەوتنە گەورەیە لە ژیانی ئاینیو فیکریو کۆمەڵایەتیدا. بەم شێوەیە بەئەرکی سەرشانی دەزانم کە ئامۆژگاری ملیۆنەها شیعە بکەم ئەم کتێبە بخوێننەوە:

"هەرکەسێك دوای ڕێی ڕاست بکەوێت ئەوا بۆخۆیەتیو هەرکەسێکیش گومڕا بێت ئەوا بڵێ من تەنها ئاگادارکەرەوەم" (وَأَن أَتْلُوَ الْقُرْآن فمن اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَا أَنَا مِنَ الْمُنذِرِينَ) (النمل: ٩٢).

# ئیمامەت و خیلافەت (پێشەوایەتی و جێنشینی)

ململانێی نێوان شیعەو تەشەییوع لەوکاتەوە دەستی پێکرد کە شیعە مانای تەشەییوعیان گۆڕی لەخۆشویستنی ئیمامی عەلی‌و کەس‌و کارییەوە بۆ زەم کردنی خەلیفە ڕاشیدەکان‌و ناشیرین کردنیان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ،وە ناشیرینکردنی ئیمامی عەلی‌و کەسوکارەکەی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ.

**تێبینی:**

مەبەست لە (شیعە): شوێنکەوتوانی مەزهەبی شیعەیە، وە لە (تەشەییوع) هەواداریی ئیمامی عەلی‌و نەوەکانی‌و بەشیاوترو لەبەرتر زانینیانە بۆ جێنشینی پەیامبەرو پێشەوایەتی موسوڵمانان.

نووسەر لەیەکی جیا کردوونەتەوە لەبەرئەوەی وادادەنێ کە شیعەکانی ئەمرۆ جیاوازن لە شیعەکانی زەمانی حەزرەتی عەلی‌و نەوەکانی‌و مەسەلەکە دەرچووە لەهەوادارای‌و بەشیاوتر زانینی عەلی کەلەسەدەکانی یەکەمدا هەبوو بۆ هەڵگرتنی کۆمەڵێك بیروباوەڕ کە دواتر سەری هەڵداوە.

**ئیمامەت‌و خیلافەت (پێشەوایەتی‌و جێنشینی)**

- بیرۆکەی جێنشینی تا سەدەی چوارەمی کۆچی.
- شیعەو تەشەییوع.
- ڕاستکردنەوە.

## بیروباوەڕی شیعەی دوانزە ئیمامی لە جێنشینیدا:

هەرچەند قووڵ دەبمەوە لە شیعەو تەشەییوع‌و بیروباوەڕی شیعەی دوازدە ئیمامی دەبینم کەلێنێکی زۆر گەورە هەیە لە نێوان شیعەو تەشەییوعدا کە هەندێك جار دەگاتە دژایەتییەکی زەقی وا کەبەڕوونی دەبینم تەشەییوع

شتێکەو شیعە شتێکی تر، وە هەرچەند ڕۆدەچم لە مێژووی ململانێی نێوان شیعەو تەشەییوع ئەو سێ سەردەمەم دێتە بەرچاو کە ئەم ململانێیەی تێدا پەیدابوو وسەری هەڵدا، سەردەمی یەکەم کەسەردەمی سەرهەڵدانی ململانێی فیکری بوو دوای دیارنەمانی گەورە (الغیبە الکبری)و ڕێگەی خۆشکرد بۆ سەردەمی دووەم ئەویش سەردەمی دەرکەوتنی دەوڵەتی سەفەوی بوو لەسەر دەستی دامەزرێنەرەکەی کە شائیسماعیلی سەفەوی بوو ساڵی ٩٠٧كو دامەزراندنی دەوڵەتی شیعی لە ئێران، پاشان سەردەمی سێیەمو کۆتایی، ئەویش سەردەمی ئەو ململانێیەیە کە لە ژیانی هاوچەرخماندا دەیبینین لەنێوان بۆچوونە شیعەییە نوێکانو تەشەییوعدا.ئەو بۆچوونانەی کە باڵی کێشاوە بەسەر کۆمەڵگەی شیعەداو دەرەنجامی ترسناكو غەمناکی وای لێکەوتووەتەوە کە نە لەزەوی وە نە لە ئاسماندا جێی نابێتەوە.

وە بۆ ئەوەی خاڵ بخەینە سەر پیتەکان لەم پەیامە چاکسازییەماندا پێویستە بیرو بۆچوونەکان بەشێوە ڕاستەقینەکانی خۆیان باس بکەین پاشان ڕێگە ڕوونبکەینەوە بۆ ئەوەی خوێنەر بەرچاو ڕوون بێت لەڕەوشو بارودۆخی خۆی.

پێشەوایەتیو (ئیمامەت) بەردی بناغەیە لەمەزهەبی شیعەی ئیمامیو زەیدیو ئیسماعیلیدا[1]و هەرچی شتی تر هەیە کە مایەی جیاوازیو

---

١. زەیدییەکان باوەڕیان وایە کە ئیمامەت لە زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلییەوە لق و پۆ دەکاتەوەو ئیسماعیلییەش لەو باوەڕەدان کە ئیمامەت لە ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری صادقەوە لقە پۆ دەکاتەوە.(نووسەر)

زەیدییەکانو ئیسماعیلییەکان دوو تاقمن لە شیعە جیاواز لەیەکترو لە شیعەی دوازدە ئیمامی.

---

زەیدییەکان شوێنکەوتووی زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیبن وباوەڕیان وایە کە زەیدی کوڕی عەلی ئیمامە نەك (محمد الباقر)ی ئامۆزای‌و مەرجیان بۆ ئیمامەت ئەوەیە کەدەبێ ئیمام لەنەوەی فاتیمە بێت ئیتر نەوەی حەسەن بێت یان حوسەین گرنگ نییە،وە دەبێ ئەو کەسە بانگەشە بۆ ئیمامەتی خۆی بکات‌و لەپێناویدا کۆشش‌و شۆڕش بکات وەکو زەید کە لە شۆڕشێکدا کوژرا نەك لە ماڵەوە دانیشێ وەکو محمد الباقر.

ئیسماعیلییەکانیش دیسانەوە تاقمێکی شیعەن بەڵام لەو باوەڕەدان کە ئیمام لەدوای جەعفەر الصادق لەنەوەکانی ئیسماعیلی کوڕیدایە کە کوڕە گەورەی باوکی بوو وە باوکی ئەوی بە ئیمام دەستنیشان کردبوو لە دوای خۆی بەڵام لە ژیانی باوکیدا کۆچی دوایی کرد، ناکۆکییەکی گەورە کەوتە نێوان شیعەکانەوە کە ئایا ئیسماعیل ئیمام بووە یان نا، ئەگەر نا،چۆن باوکی ئەوی دەستنیشان کردبوو، پاشان ئەگەر ئەو نییە دەبێ کێ بێت، کوڕی دووەمی جەعفەر ناوی عەبدوڵلا بوو، هەندێك وتیان (عبدالله)یە، لەوە تاقمێك پەیدابوو پێیان دەوترا (الافطحیة) چونکە عەبدوڵلا پێی دەوترا (عبدالله الأفطح).

ئیسماعیلییەکانیش بوون بە دوو بەشەوە، هەندێکیان وتیان ئیسماعیل نەمردووەو دێتەوەو ئەو ئیمامی مەهدییەو دیارنەماوەو دەگەڕێتەوە، هەندێکی تریش لەوانە وتیان ئیمامەت لەنەوەکانی ئیسماعیلدا بەردەوام دەبێت‌و ئیمام دوای جەعفەر لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلدا بەردەوام دەبێت.

تاقمێکی تر قەناعەتیان بە ئیمامەتی عبدالله الافطح نەبوو وە باوەڕیان بە ئیمامەتی ئیسماعیلیش نەبوو وتیان ئیمام دوای جەعفەر الصادق موسای کازمە.

هەندێکی تر سەرگەردان بوون‌و نەیاندەزانی چی بکەن‌و بۆکوی بچن، هەندێکی تر بنەماکانی شیعەیان لەدڵدا لەق بوو وگەڕانەوە بۆ ناو ئەهلی سوننە.

لەڕاستیدا دوای مردنی هەموو ئیمامێك ئەم سەرگەردانییە ڕووی دەکردو شیعەو چەندین تاقمیان لێ جیادەبوویەوە، ئەم جیاوازییەو ناکۆکییەی لەنێوانیاندا ڕوویدەدا گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ژمارەو ناوی ئیمامەکان ئەلای خواوە وە نە لەڕێی پەیامبەرەوە دەستنیشان نەکراوە بەپێچەوانەی ئەوەی کە شیعە دوازدە ئیمامییەکانی ئەمڕۆ بانگەشەی بۆ دەکەن‌و دەیانەوێت وەکو شتێکی یەکلاکراوە بیخەنە پێش چاوی خەڵکی.(وەرگێڕ)

گفتوگۆیە لەنێوان لایەنە ئیسلامییە جیاجیاکاندا لەم بنچینەوە سەرچاوەی گرتووە.

شیعەی ئیمامی باوەڕیان وایە کە جێنشینی دوای پەیامبەر (ﷺ) دەبوایە لەعەلیو دوای ئەو لەنەوەکانیدا بێت تا دەگاتە ئیمامی دوازدەهەم کە موحەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەریو نازناوی مەهدی لێنراوە،وە پەیامبەر (ﷺ) ئاماژەی بەجێنشینی عەلی داوە لەدوای خۆی لەچەندین شوێندا بەڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ،کە بەناوبانگترینیان لەشوێنێکدایە پێی دەوترێت (غدیرخم)[1] لەکاتی گەڕانەوەی لە حەجیماڵئاوایی کە بەیعەت بۆ عەلی لەخەڵکی وەرگرتو فەرمووی: "من كنت مولاه فهذا علي مولاه، اللهم وال من والاه وعاد من عاداه"[2]

---

[1] غدیر خم: "غەدیر" واتە چاوگە یان کانی ئاو، "خوم" شوێنێکە لەنێوان مەککەو مەدینە ئاوی لێبوو "غدیر خم": واتە چاوگەی ئاوی خۆم.
لەم شوێنەدا پەیامبەرو یارانی لەکاتی گەڕانەوە لە حەجی ماڵئاوایی لایانداوە بۆ ئیسراحەت، لەوێدا هەندێك کەس گلەیی لە عەلی دەکەن لەسەر دابەشکردنی هەندێك دەستکەوتی شەڕ کە ئەوکاتە عەلی لێپرسراوی بەحرەین بوو لەلایەن پەیامبەرەوە، پەیامبەریش (ﷺ) بەرگری لە عەلی دەکاتو دەستی بەرزدەکاتەوەو دەفەرموێت "من كنت مولاه فهذا علی مولاه"
شیعەکان داستانی زۆریان لەسەر ئەم ڕووداوە هەڵبەستووەو قسەی زۆریان خستووەتە سەر قسەکانی پەیامبەر بەمەستی سەلماندنی جێنشینی ڕاستەوخۆی ئیمامی عەلی لەدوای پەیامبەرو ئەم دەقەشیان بە شێوەیەك ڕاڤەکردووە کە دیسانەوە خزمەت بەو مەبەستەیان بکات: بەمانای پێشەواو جێنشین ڕاڤەیان کردووە.(وەرگێڕ)

[2] مولی (مەولا) یەکێکە لەو وشانەی کە بەعەرەی پێی دەوترێت (المشترك اللفظي) کە چەندین مانای هەیە کە هەندێکیان پێچەوانەی ئەوی ترن بۆ نمونە بەمانای خزمەتکارو ژێردەستو کۆیلەی

ئازادکراو دێت وە هەروەها بەمانای سەروەرو لێپرسراوو دۆستو لایەنگرو خۆشەویستو پشتیوانیش دێت.

شیعەکان دەڵێن وشەی (مولى) لێرەدا بەمانای لەبەرتر و بەرپرسو سەروەر دێت، سوننەش دەڵێن بەمانی دۆستو خۆشەویستو لایەنگر دێت.

لەو حاڵەتانەشدا کە وشەیەك چەند مانایەك هەڵگرێت پشت بە شتی تر دەبەسترێت لەدەرەوەی وشەکەوە بۆ دیاریکردنی ماناکەی کە بە عەرەبی پێی دەوترێت(قرینة خارجیة).

سوننە دەڵێن مومکین نییە ئەو وشەیە بەمانای سەروەرو بەرپرس بێت چونکە یەکەم بۆنەی وتنەکەی بۆ بەرگری کردن بووە لە عەلی لەبەرامبەر کسانێکدا کە گلەییان لێکردووە، ئەویش فەرموویەتی هەرکەسێك من بەدۆستو خۆشەویستی خۆی دەزانێت با عەلیش بەدۆستو خۆشەویستی خۆی بزانێت.

دووەم تەواوکەری فەرمودەکە باس لە خۆشەویستیو رقو دوژمنایەتی دەکات "اللّهم وال من والاه وعاد من عاداه " واتە:خوایە ئەو کەسەت خۆشبوێت کە ئەوی خۆش دەوێت ولایەنگری دەکات وە دوژمنایەتی ئەو کەسە بکە کە دوژمنایەتی دەکات، دەبینی لێرەدا باس لە گوێڕایەڵیو ملکەچی ناکات، بەڵکو باس لەخۆشەویستیو رقو لێبوونەوە و دۆستایەتی و دوژمنایەتی دەکات.

تەنانەت ئەو زیادەیەی تریش کە شیعە دەیخەنە سەر کە دەڵێت:

"وأدر الحق معه حیث دار" واتە:عەلی رووی لەهەرکوێیەك کرد ڕاستی لەگەڵدا بگێڕە، پەیوەندی بە جێنشینییەوە نییە بەڵکو تزایەکە پەیامبەر دەیکات بۆ عەلی بۆ ئەوەی لەسەر ڕێی ڕاست بێت.

هەڵوێستەکانی داهاتووی عەلیش ئەوە دەسەلمێنن کەلەسەر ڕێی ڕاست بووە کاتێك بەیعەتی بە خەلیفەکانی پێش خۆی داوەو هاوکاری کردوونو ڕاوێژکاری دڵسۆزیان بووەو کچی پێداونو منداڵەکانی بەناویانەوە ناوناوە.

سێهەم: لەرووی لۆژیکەوە نەگونجاوە کە مانای پێشەوایەتیو سەرگەورەیی لێوەربگیرێت چونکە ناگونجێ موسوڵمانان لەهەمانکاتدا دوو سەر گەورەیان هەبێت، بەتایبەت کە یەکێکیان پەیامبەربێت.

چوارەم: مێژووو واقیعی موسوڵمانان پێمان دەڵێن موسوڵمانان لە سەردەمی پەیامبەردا وەکو بەرپرسێك یا دەسەڵاتدارێك تەماشای عەلییان کردبێت تەنانەت لەرێزی ڕاوێژکارە یەکەمەکانی پەیامبەریشدا نەبووە.

ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەژدەی زیلحیججەی ساڵی ١٠ کۆچی بوو کە شیعە ساڵانە لەهەر شوێنێکدا بن لەم ڕۆژەدا ئاهەنگ دەگێڕنو ناویان لێناوە (جەژنی غەدیر).

لایەنە ئیسلامییەکانی تر باوەڕیان وایە کە پەیامبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد بەبێ ئەوەی کەسێك بکات بەجێنشینی خۆی بەڵکو شتەکەی بۆ ڕاوێژی نێوان مسوڵمانان بەجێهێشت لەسەر ڕێنمایی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە:

(وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ) (الشورى: ٣٨ )

(موسوڵمانان کارەکانیان بەڕاوێژ ئەنجام دەدەن لەنێوان خۆیاندا).

(وشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ) (آل عمران: ١٥٩ )

(ڕاوێژ بەبرواداران بکە لە کارەکاندا).

ئەمە کورتەی ناکۆکی نێوان ئەم دوو لایەنەیەو هەرلایەنەو بۆچوونی خۆی هەیەو بەڵگەی خۆی هەیە لەسەر بۆچوونەکانیو زانایانی هەر لایەنە سەدان کتێبی درێژو کورتیان نووسیوە لەسەر ئەم بابەتەو ئەو هەموو کتێبانە بەدرێژیو پانتاییان ڕۆڵێکو سودێکیان نەبووە بۆ ترازاندنی شیعە لەبیروباوەڕەکانیان دەربارەی جێنشینی یان ترازاندنی سوننە لەوەی بەشیاوتری دەزانن بۆ پەیڕەویکردن. بەڵام کێشە گەورەکە لەوەدایە کە ئەم

---

پێنجەم: ئەگەر مەبەست لەم فەرموودەیەو لەم ڕووداوە جێنشینی پێغەمبەر بوایە ئیمامی عەلی لەو کاتەی خەڵکی بەیعەتیان بە ئەبوبەکرو پاشان بە عومەرو پاشتریش بەعوسمان دا ناماژەی بۆ دەکردو بەبیری دەهێنانەوە کە پێغەمبەر (ﷺ)لە فلانە بۆنەدا ئاوها شتێکی فەرمووە، ئاماژەنەکردنی عەلی بۆ ئەو فەرمودەو ڕووداوە ئەوە دەگەیەنێت کەکەس بەو شێوەیە لێکینەداوەتەوە کە پاشتر شیعەکان لێکیانداوەتەوەو بەمانای جێنشینی ڕاڤەیان کردووە.

دیارە ئەوان لە عەلی باشترو زیاتر لەمەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) تێدەگەن!!(وەرگێڕ)

ناکۆکییە فیکرییە لەم ئاستەدا نەوەستا بەڵکو لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتو دوورکەوتنەوە لەسەردەمی پەیامبەر شێوازێکی مەترسیداری وەردەگرت، ئەگەر بهاتایە ناکۆکییەکە لەم ئاستەدا بوەستایە مەسەلەکە ئاسان دەبوو وە جیهانی ئیسلامی لەو مێژووە درێژەیدا ئەو هەموو بەڵاو کارەساتەی بەخۆیەوە نەدەبینی کە لەئەنجامی ئەو لقو پۆپانەی لەمەسەلەی جێنشینیەوە سەرچاوەیان گرت ڕوویاندا.

وەکو لە پێشەکی کتێبەکەدا ئاماژەمان پێدا جیاوازی بیروباوەڕ لە سنووری لێکۆڵینەوەی زانستیو جیاوازی بیروباوەڕ چووە دەرەوەو سروشتێکی توندوتیژی وەرگرت دوای ئەوەی کە شیعە دەستیان کرد بەزەمو قسەی ناشیرین وتن بە خەلیفە ڕاشیدەکانو خێزانەکانی پەیامبەر بەبەکارهێنانی دەستەواژەگەلێکی زۆر توندو ڕەقو ناشیرین کەلە موسوڵمانێکی سادەوە بۆ موسوڵمانێکی هاکەزایی ناوەشێتەوە چ جای لەلایەنێکی ئیسلامییەوە بەرامبەر بە یارانو خێزانەکانی پەیامبەر (ﷺ). یارانێك کە پلەوپایەیەکی بەرزو پیرۆزیان هەیە لەدڵی مسوڵمانانداو خێزانگەلێك کە خوا بەدایکی بڕواداران ناوی بردوون.

لێرەوە ناهاوسەنگی لەنێوان ئەم دوو لایەنەدا دەرکەوت لەشێوازی بیرکردنەوەو بیروباوەڕدا، لەکاتێکدا کە هەموو لایەنە ئیسلامییەکان (عەلی)یان خۆش دەوێتو وەکو خەلیفەکانی پێش خۆی ڕێزی لێدەگرنو ڕێز لەکەسو کاری پەیامبەر (ﷺ) دەگرنو درودیان لەسەر دەدەن لەهەموو نوێژەکانیاندا لەڕۆژو شەودا، شیعەکان هەڵوێستی تریان هەیە لە خەلیفەکانی موسڵمانان، هەڵوێستێکی پڕ لەتوندوتیژیو قسەی ناشیرینی برینداركەر کە دەرەنجامەکەی سەرهەڵدانی کاردانەوەی توند بوو لەلایەن زانایانی لایەنە

ئیسلامییەکانی ترەوە بۆ بەرگریکردن لە خۆشەویسترین‌و بەرێزترین خەلیفەکانیان‌و زاناو نووسەرانی سوننە کتێبی جۆراو جۆریان نووسی لەکورت‌و درێژ دەربارەی شیعەو تێیدا جارێك بەبێ بڕواو جارێکی تر بەدەرچوو لە ئیسلام ناویان دەبردن.

بەو شێوەیە بیرۆکەی جێنشینی ڕووبەرێکی گەورەی لەنووسینە ئیسلامییەکاندا داگیرکرد لەلای هەردوو لایەنەکەو تاکو ئێستاش پێنووسەکان دەنووسن‌و نووسراوەکان بڵاودەکرێنەوە وەکو ئەوەی مسوڵمانان بەهەموو چین‌و توێژەکانیانەوە لەم دنیایە پڕ لەڕووداوو ناخۆشییەدا هیچ کێشەیەکیان نەبێت جێنشینی نەبێت!.

لەڕاستیدا سەرگەردانییە گەورەکە لەو ڕێگایەدایە کە شیعە گرتوویەتەبەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەی جێنشینی کە ئەوپەڕی دژو ناکۆکە لەگەڵ ژیانی ئیمامی عەلی‌و ژیانی نەوەکانی کە پێشەوایانی شیعەن، لەبەرئەوە تووشی سەر سامی‌و سەرگەردانی دەبم کاتێك دەبینم دروشمی شیعە خۆشویستنی ئیمامی عەلی‌و نەوەکانێتی، بەڵام ژیانی عەلی‌و پێشەوایان لەنەوەکەی دەکێشن بە دیواردا‌و پشت گوێی دەخەن.

لێرەدا حەزدەکەم لەگەڵ شیعەکاندا بەزمانی خۆیان‌و لە چوارچێوەی بیروڕاکانی خۆیانەوە بدوێم بۆ ئەوەی ببێت بەبەڵگە لەسەریان، پێویستیش دەکات بڵێم کە من ڕووبەڕووی دوو شتی دژبەیەك دەبمەوە، یەکێکیان تەشەییوع‌و ئەوی تریان شیعەیە، لێرەوە دەستمکرد بە هەڵهێنجانی ئەوەی کە ئەو ململانێیەی ڕوویدا لەنێوان شیعەو تەشەییوعدا یەکسەر دوای دیارنەمانی گەورە هۆی سەرەکی هەموو ئەو لادانانەیە کەلەفکری شیعەدا ڕوویدا لەدوای دیارنەمانی گەورەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ، ئێمەش لەوباوەڕەداین

کەئەو لادانە هۆی ناکۆکی نێوان شیعەو لایەنە ئیسلامییەکانی ترە کە لەم کتێبەدا بەدرێژی باسی دەکەین هەریەکەو لەبەشی تایبەت بەخۆیەوە.

## بیرۆکەی جێنشینی لەسەردەمی پەیامبەردا (ﷺ):

ئەگەر بێتو بەشێوەیەکی تێرو تەسەل لەبارەی جێنشینی پەیامبەر بکۆڵینەوە لەسەردەمی پەیامبەرو دوای کۆچی دوایی دەگەینە دەرەنجامێکی چەسپێنراو کە دوو کەس ناکۆك نەبن لەسەری ئەویش ئەوەیە کە بیرۆکەی شیاوتری‌و لەپێشتری بۆ جێنشینی پەیامبەر (ﷺ) ڕاستەوخۆ دوای فەوتی پەیامبەر سەری هەڵدا، ئەوەتا عەبباسی مامی پێغەمبەر (ﷺ) لەوکاتەی کە خەریکی شۆردن‌و کفن کردنی پەیامبەرن بە عەلی دەڵێت: "دەستت بێنە با بەیعەتت بدەمێ بۆ ئەوەی خەڵکی بڵێن مامی پەیامبەر بەیعەتی دا بەکوڕی مامی پەیامبەر"[1]

---

[1] قسەی عەبباسی مامی پێغەمبەر بە عەلی‌و وەڵامەکەی عەلیش بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوە کە مەسەلەی دەقی خوایی یان فەرموودە لەسەر جێنشینی عەلی وە یا بەیعەت لەگەردنی خەڵکیدا بۆ عەلی نەبووە ئەگینا عەبباس هەوڵی ئەدەدا دەستپێشخەری بکاتەو بەیعەت بەعەلی بدات بۆ ئەوەی ڕێگە لەخەڵکی بگرێت لەبیرکردنەوە لە جێنشینی پێغەمبەرو وەڵامەکەی عەلیش تەنها ئەوە دەگەیەنێت کە خۆی بەشیاوتر زانیوە لەخەڵکانی ترو وایزانیوە خەڵکیش بەهەمان شێوە بۆی دەڕوانن، بەڵام واقیع دەریخست کە خەڵکی هەمان تێڕوانینیان بۆی نەبوو، واقیعی کردەییش دەریخست کە ئەبوبەکرو عومەر لەو لێهاتووتربوون لەفەرمانڕەواییدا.

ئەگەر دەقێك لەسەر عەلی هەبوایە یان بەیعەتێك لە گەردنی کەسدا هەبووایە ئاماژەی پێوە دەدا نەك بڵێت مەگەر کەس هەیە چاوی تێ بېڕێت؟

ئەو کاتە دەیوت: مەگەر من بەدەقی قورئان‌و فەرموودە جێنشینی پێغەمبەرتیم ولەغەدیری خومدا هەموو بەیعەتیان نەداومەتێ؟.

ئیمامی عەلی دەڵێت:

"ئایا کەسی تر جگە لەمن چاوی تێدەبڕێت؟ پاشان من ناچمێت لە پشتی دەرگاوە بەیعەتم پێ بدرێت"[4]

موسوڵمانان لە سەقیفەی بەنی ساعیدە کۆبوونەوە بۆ ئەوەی لەمەسەلەی جێنشینی پەیامبەر بکۆڵنەوە، ئەنسارییەکان بە موهاجیرەکانیان وت:

"منا أمیر ومنکم أمیر": فەرمانڕەوایەك لەئێمەو یەکێك لەئێوە.

خەریك بوو ئاژاوە لەنێوان کۆبووانندا ڕوویدات ئەگەر عومەری کوڕی خەتتاب مەسەلەکەی نەبڕیبایەوەو بەیعەتی بە ئەبوبەکر نەدایە، ئەوەبوو موسوڵمانان بەیعەتیان دا بە ئەبوبەکرو سەعدی کوڕی عوبادە کەسەرۆك هۆزی خەزرەج بوو بە توڕەییەوە کۆبوونەوەکەی بەجێهێشت چونکە خۆی بەلەپێشتر دەبینی بۆ جێنشینی، ئیمامی عەلیش تا ماوەیەك دواکەوت لەبەیعەتدان بەڵام لەدواییدا بەڕەزایەتی خۆی بەیعەتی بە ئەبوبەکردا، لەگەل ئەوەشدا بیرۆکەی لەپێشتری بۆ ئەو پۆستە لەدڵی عەلیو فاتیمەی زەهراو هەندێك لە یارانی عەلیو بەنی هاشمدا مابوویەوە،تەنانەت عومەری کوڕی خەتتاب بە ئیبن عەباس دەڵێت:

"سوێند بەخوا عەلی لە پێشترین کەس بوو بۆ جێنشینی پەیامبەر (ﷺ) بەڵام ئێمە لەدووشت دەترساین: کەمی تەمەنیو خۆشەویستی بۆ نەوەکانی عەبدولموتەلیب"[1]

---

ئاماژەنەکردنی عەلی بەدرێژایی ژیانی بۆ ئەو مەسەلەیە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم بیرۆکەیە زاییدەی ئەو سەردەمە نەبووە بەڵکو دواتر داهێنراوە، عیسا چەند ئاگای لێبووە کە خوایە یان کوڕی خوایە عەلیش ئەوەندە ئاگای لێبووە کە جێنشینی پێغەمبەرە.(وەرگێڕ)

٥.لەگەڵ پەراوێزی چوارەمدا باسمان کرد.(وەرگێڕ)

جارێکی تر گوێمان لە عومەر دەبێت لەسەرە مەرگیدا ئاماژە بۆ عەلی دەکاتو دەڵێت:

"سوێند بەخوا ئەگەر کاری خۆتانی بدەنە دەست دەتاخاتە سەر رێگای راستو رەوان"[2]

لێرەوە دەتوانین بڵێین بیرۆکەی هەواداری بۆ عەلی بەو مانایەی پێشتر ئاماژەمان پێیدا[3] دوای مردنی پەیامبەر (ﷺ) سەری هەڵداو بەو شێوەیە بەردەوام بوو تا سەدەی سێهەمی کۆچی[4] کە تەشەییوع بەو مانایە دەهات

---

شرح نهج البلاغة ج١ ص١٢٤

ئەمەش لەو قسە هەڵبەستراوانەن کە شیعە دایانهێناوە ئەگینا نە تەمەنی عەلی ئەو کاتە ئەوەندە کەم بوو کە رێگرییێت لەبەردەم ئەوەی بکرێت بە خەلیفە وە نەخۆشەویستی خزمانی خۆی کە خزمی پێغەمبەریش بوون بەربەستێك بوو لەبەردەمیدا چونکە ئەبوبەکر و عومەریش خزمانی پێغەمبەریان لە پێش خزمانی خۆیانەوە دادەناو لە هەموو شتێکدا پێشیان دەخستن. بەراستی قسەی درۆو هەڵبەستراو هەر لەدوورەوە شایەتی لەسەر خۆی دەدات.( وەرگێڕ)

[2] شرح نهج البلاغة ج١/ ص٦٤.

[3] بەمانای ئەوەی کە لەوانی تر لە پێشترو شیاو ترە بۆ جێنشینی پەیامبەر.(وەرگێڕ)

[4] مەسەلەی هەواداری بۆ عەلی لەناو یارانی پێغەمبەرداو تا سەردەمی عوسمانیش بەو شێوەیە نەبوو کە نووسەر باسی دەکات بەڵکو تا هەڵبژاردنی عوسمانیش هەوادارانی ئەو سێ خەلیفەیە زیاتر بوون بەتایبەتی خەلیفەی یەکەمو دووەم وە هەوادارانی عەلی بە شایەتی خۆیان کە دەڵێن دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر هەموو هاوەڵان هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام چوار کەس نەبێت(سەلمانو ئەبوزەڕو میقدادو عەماری کوڕی یاسر) کەمینەیەکی زۆر کەم بوون کە بە پەنجەکانی یەك دەست دەژمێردران، تەنانەت لە دوای مردنی عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێك عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ڕاپرسی دەکرد زۆربەی مسوڵمانان دەنگیان بۆ عوسمان دەدا وە بیرۆکەی شیاوتری عەلیو بیرۆکەی هەموو پێغەمبەرێك دەبێ جێنشینێکی هەبێت لەداهێنانی عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء بوو لە کۆتایی سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا عەبدوڵڵا کابرایکی جوولەکە بوو لە سەردەمی

کە عەلی لە پێشترو شیاوترە لە خەڵکانی تر بەڵام مسوڵمانان بۆ پەیڕەوی لەو فەرمانەی خوا کە دەفەرموێت: (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ) (الشورى: ٣٨ ) ڕازی بوون بەوەی ئەبوبەکر بکەن بە پێشەوای خۆیانو ئیمامی عەلیش وەکو ئەوانی تر بەو کارە ڕازی بوو و وەکو خەڵکانی تر بەیعەتیداو دواتریش هەمان هەڵوێستی هەبوو لەگەڵ هەردوو خەلیفەی تر: عومەری کوڕی خەتابو عوسمانی کوڕی عەففانو بەیعەتی دانیو کاتێك ڕاوێژکیان پێدەکرد دڵسۆزانە ڕاو بۆچوونەکانی خۆی بۆ دەردەبڕین.

## تەشەیوع (هەواداری) لەسەدەی دووەمی کۆچیدا:

لەسەرەتای سەدەی دووەمی کۆچییەوە هەواداری بۆ عەلی دەستی کرد بە پێکهێنانی مەزهەبێکی فیقهی کە ئەویش مەزهەبی ئەهلی بەیتە، وە ئەم مەزهەبە لەوکاتەدا بەڕوونی دەرکەوت کە مەزهەبە فیقهییە گەورەکانی وەکو مالیکیو شافیعیو حەنەفیو حەنبەلی سەریانهەڵداو قوتابخانەی ئەهلی بەیت لە ئیمام جەعفەری صادقدا کە ئیمامی شەشەمی شیعەکانە خۆی نیشاندا، ئەو بیرۆکەیەی کە پشتیوانی لەمەزهەبی ئەهلی بەیت دەکرد بریتی بوو لەوەی کە دەیگوت: ئەگەر بێتو ئیمامی عەلی لە پێشتر بێت بۆ جێنشینی پەیامبەر لەخەڵکانی تر کەواتە نەوەکانیو جەعفەری صادق کەسەکێك بوو

---

عوسماندا موسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند و بیرۆکەی هەموو پێغەمبەرێك جێنشینێکی هەیە لە داهێنانی ئەو بوو، دەیوت هەروەکو چۆن یوشەع بن نون جێنشینی موسا بوو بەهەمان شێوە عەلی جێنشینی پێغەمبەر بوو بەڵام ستەمی لێکراو بەرکنار کرا.(وەرگێڕ)

لەزاناترینی سەردەمی خۆی لە پێشترن لەزانایانی تر بۆ پەیڕەولێکردن لەمەسەلە ئاینییەکاندا[1]

بەو شێوەیە قوتابخانەی فیقهی جەعفەری سەری هەڵدا لەسەردەمی جەعفەری صادقدا کەوانەکانی لەشەرعو زانستەکانی تردا لەمزگەوتی مەدینەدا دەوتەوە.

ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێبدرێت ئەوەیە کە هەواداری بۆ عەلیو ئەهلی بەیتەکەی دوای کوشتنی ئیمام حوسەین شێوازێکی ترسناکو دژواری وەرگرت، ئەو ڕووداوەی کە کاردانەوەیەکی زۆر توندی دروستکرد لەجیهانی ئیسلامیداو ئەنجامە ڕاستەوخۆکەی ڕووداني چەندین شۆڕشی یەك لەدوای یەك بوو کە بوونە هۆی ڕوخانی دەوڵەتی ئەمەویو دامەزراندنی خیلافەی عەبباسی.

وەکو دەزانین شۆڕشگەلێکی زۆری یەك لەدوای یەك ڕوویاندا بەناوی هەواداریو پەیڕەوی لەعەلیو ئەهلی بەیتەکەی، لەوانە شۆڕشەکەی موختاری

---

[1] ئەڵبەتە ئەمە بەبۆچوونی شوێنکەوتوانی ئەو مەزهەبیە نەك سەرجەم موسوڵمانان چونکە ئاشکرایە کە شوێنکەوتوانی مەزهەبەکانی تر لەوانەی مەزهەبی جەعفەری زیاترنو هیچ بەڵگەیەکیش بەدەستەوە نییە کە جەعفەری صادق لە پێشەوایانی مەزهەبی ئەهلی سونتە زاناتر بێتو ئەو قسەیش کە دەدرێتە پاڵ ئەبو حەنیفە کە گوایە وتوویەتی ئەگەر ئەو دوو ساڵە نەبوایە کە لەخزمەت جەعفەردا بووم دەفەوتام بێ بناغەیەو هەڵبەستراوی شیعە خۆیانە ئەگینا ئەبو حەنیفە دوو ساڵ لەمەدینە نەماوەتەوە و هیچ یەکێك لەو سەرچاوانەی باسی ژیانی ئەبوحەنیفە دەکەن ئاماژەیان بەم شتە نەداوە ، پاشان ئەگەر ئەمە ڕاست بێت مانای وایە ئەوانە زۆر دۆست و خۆشەویستی یەك بوون و لە یەك سەرچاوەوە شتیان وەرگرتووە ، ئیتر ئەم جیاوازییە لە چییەوە سەریهەڵدا (وەرگێڕ)

سەقەفیو موصعەبی کوڕی زوبەیرو زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەین کە بەشەهیدکردنی خۆیو یارانی کۆتایی هات. هەروەها ئەو شۆڕشەی کە عەبباسییەکان بەروبوومەکەیان دوورییەوەو خیلافەتی ئەمەوییان لەرۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامیدا بۆ هەتاهەتایە لەناوبرد بەناوی هەواداریو لایەنگریو پەیڕەویکردن لەنەوەکانی عەلیو ئەهلی بەیتی پەیامبەرەوە دەستی پێکردو ئەبو موسلیمی خوراسانی بانگەوازی بۆ پەیڕەوی کردن لە ئەهلی بەیت دەکرد لە سەرەتای شۆڕشەکەیدا بەڵام دواتر لە چیرۆکێکی زانراودا کە لە کتێبەکانی مێژوودا باسکراوە چووە پاڵ عەباسییەکان.

پێشەوایانی شیعە لەسەردەمی عەباسییەکاندا رێزێکی زۆریان لێدەگیرا لەلایەن موسوڵمانانەوەو بیرۆکەی لەبەرتریو شیاوترینیان بۆ جێنشینی بە بیری زۆرێك لەخەڵکیدا دەهاتو ئەگەر ڕای گشتی موسوڵمانان لەسەر لەبەرتری ئەهلی بەیت نەبوایە مەئمونی عەبباسی ئیمام (عەلی ڕەزا)ی هەڵنەدەبژارد بۆ جێنشینی دوای خۆی، بەڵام ئەوە بوو عەلی ڕەزا لەسەردەمی مەئموندا کۆچی دوایی کردو خیلافەت لە عەباسییەکاندا بەردەوام بوو، کەواتە بیرۆکەی هەواداری عەلیو ئەهلی بەیتەکەیو لایەنگری کردنیان بەرواڵەتی جیا جیا لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا دەردەکەوت ولەوکاتەدا پشتیوانانێکی دڵگەرمی هەبوو.

لەو پێشەکیانەوە ئەوە هەڵدەهێنجێنین کە بیرۆکەی هەواداریو لایەنگری لە عەلیو نەوەکانی لە سێ سەدەی یەکەمی کۆچیدا هەبووە، وە ئەم بیرۆکەیە لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت دەبوونەوە:

یەکەم: عەلی لەوانی تر لەبەرتر بوو بۆ جێنشینی پەیامبەر بەڵام موسوڵمانان بەیعەتیان بە خەلیفەکانی تر داو عەلیش بەیعەتی دانێو

دواتریش موسوڵمانان دوای عوسمان بەیعەتیان بە عەلی داو هیچ تەمومژێك لەسەر ڕەوایەتی جێنشینی خەلیفە ڕاشیدەکان نییە لە ئەبوبەکرەوە تا عەلی.

دووەم: دەرخستنی دوژمنایەتی لە ئەمەوییەکان بەهۆی هەڵوێستی معاویە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبو کوژرانی ئیمامی حوسەین لەکارەساتی تەف (الطف)داو جنێوداتی خەلیفە ئەمەوییەکان بە عەلی لەسەر مینبەر بۆ ماوەی پەنجا ساڵ تا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ڕایگرت[1].

---

[1] مەسەلەی جنێودان بە عەلی لەسەر مینبەر یەکێکە لەو درۆیانەی کە شیعە ئەوەندە دووپاتیان کردۆتەوە وەکو مەسەلەیەکی جێگیری لێهاتووە ئەگینا دەبوایە مێژوو کە هیچ شتێکی نەشاردۆتەوە چەند نمونەیەك لەو جنێوانەو لەو جنێو فرۆشانەو لەو شوێنانەی ئەو جنێوانەیان تێدا دەدرا بۆ بهێنایینایەتەوە نەك تەنها ئەوەندە بوترێت کە لەسەر مینبەرەکان جنێو بە عەلی دراوە.بەپێچەوانەوە مێژوو ئەم قسەیە بەدرۆ دەخاتەوەو پێمان دەڵێت کە تانانەت معاویە کە چەند ساڵ شەڕی بووە لەگەڵ عەلیدا دانی بەگەورەیی‌و پیاوچاکی‌و خواپەرستی عەلیدا ناوەو کاتێك باسیان کردووە گریاوەو خوڕ خوڕ فرمێسك بەچاوەکانیدا هاتۆتە خوارەوە، پاشان ڕێزنانی خەڵکی لە ئەهلی بەیت‌و نەوەکانی عەلی لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا گەورەترین بەڵگەیە لەسەر هەڵبەستراوی ئەم قسەیە .تەنانەت لەکاتی شەهیدکردن‌و دوای شەهیدکردنی حوسەین‌و کەسوکارەکەشیدا کەس نەیوێراوە قسەیەکیان پێ بڵێت بەڵکو بەپێچەوانەوە هەواداری خەڵکی هەمووی لەگەڵ ئەهلی بەیتدا بووە بۆیە ئەو هەمرو شۆڕشە دژی ئەمەوییەکان بەرپاکرا.جگە لەمانە ئەو ئاشتی نامەیەی لە نێوان حەسەن و معاویەدا ڕوویدا کۆتایی بە شەڕە قسەی نێوان حزبی عەلی و حزبی معاویە هێنا تا هاتنی یەزید و شەهید کردنی حوسەین ڕەزای خوای لێبێت ، ئەو کارەساتەش ببوە گەورەترین خاڵی لاوازی دەسەڵاتی بەنی ئومەییەو خواخوایان بوو لە بیری خەڵکی بچێتەوە نەك بەخۆیان بچن بیوروژێنن چونکە دەیانزانی موسوڵمانان چەند هاوسۆزن لە گەڵ ئەهلی بەیت بە گشتی و حوسەین بەتایبەتی خاڵێکی تری گنگ ئەوەیە کە دوای شەهید کردنی حوسەین بە ماوەیەك عبد الله ی کوڕی زوبەیر دەستی گرت بەسەر حیجازو یەمەنداو ماوەی حەوت ساڵ بە دەستییەوە بوو و شەڕ لە نێوان ئەوو ئەمەوییەکاندا بەردەوام بوو بۆیە ئەمەوییەکان مەبەستیان بوو بەرەکانی تری شەڕ

سێهەم: گەڕانەوە بۆ لای ئەهلی بەیت لە حوکمە شەرعییو مەسەلە فیقهییەکاندا[1]

چوارەم: ئەهلی بەیت، بەتایبەت پێشەوایان لەنەوەی حوسەین لەبەرترن بۆ جێنشینی لە ئەمەوییەکانو عەباسییەکان.

---

لەسەر خۆیان دابنێن تا شۆڕشەکەی عبد الله دادەمرکێننەوەو حیجاز و یەمەن دەخەنەژێر دەستیانەوە جگە لە چەندین شۆڕشی تر وەکو ئەوەی عبدالرحمن ی کوڕی ئەشعەث و موختاری سەقەفی و خەواریجەکان و هتد  وە بەڵگەی تریش لەسەر ئەوەی کە ئەو قسانە هەڵبەستەن ئامۆژگارییەکانی عبد الملك ی کوڕی مەروان بوو  بۆ کوڕەکانی کە پێی وتن  خۆیان لە خوێنی نەوەی پێغەمبەر دووربخەنەوە چونکە ڕشتنی خوێنی ئەوان لەلایەن یەزیدەوە بوو بە هۆی لەبن هاتنی نەوەی معاویە  واتە ئەوانەی دوای یەزید لە قەوارەی هەڵەی یەزید گەیشتبوون و دەیانزانی چەند لە سەریان کەوتووە بۆیە بەهەر نرخێك بوو دەیانویست لە بیری خەڵکی ببەنەوە نەك برینیان بکولێننەوە و خەڵکی لە خۆیان بوروژێنن  دواتریش لەو ڕووداوەی نێوان زین العابدین و خەلیفە هیشام دا دەردەکەوێت کە خەڵکی چەند هاوسۆز بوون لە گەڵ نەوەی پێغەمبەرداو چەنیان ڕێز لێدەگرتن.(وەرگێڕ)

[1] ئەم قسەیەش بێ بناغەیە چونکە ئەو کاتەی کە محمد الباقر و جەعفەری صادق لە مەدینە بوون ئیمامی مالکیش  لە مەدینە بووە و ناوبانگی لەوان زیاتر بوو وە خەڵکی زیاتر ڕوویان تێدەکرد و ئەو وتەیە باوبوو کە : تا مالیك وەستابێ کەس لە مەدینە فەتوا نادات ، کتێبی (الموطأ ) یش کە دانراوی ئیمامی مالیکە شایەتە لەسەر ئەم ڕاستییە و لەسەر ئەوەی کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) لە ئیمامی مالیك وەردەگیران و فەتوا لەو وەردەگیرا

جگە لە ئیمامی مالیك( عطاء بن رباح) و (قاسم بن محمد بن ابي بكر) و (سعيد بن المسيب )و چەندین زانای تر لە محمد الباقر و جعفر الصادق بەناوبانگترو زاناتر بوون .(وەرگێڕ)

## سەرەتای لادان لە فیکری شیعیدا:

دوای ڕاگەیاندنی فەرمیی دیارنەمانی ئیمامی مەهدی ساڵی ٣٢٩ك شتگەلێکی سەیر ڕویاندا لەبیرکردنەوەی شیعەدا ناوی دەنێم ململانێی نێوان شیعەو تەشەییوع،یان سەردەمی لادان.

یەکەمین شت لەم لادانە هزرییە سەرهەڵدانی ئەو بۆچوونانە بوو کە دەیوت جێنشینی دوای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ عەلی بوو بەدەق و فەرمانی خوایی وهاوەڵان ژمارەیەکی کەمیان نەبێت هەموو سەرپێچی ئەو فەرمانە خواییەیان کرد بە هەڵبژاردنی ئەبوبەکر، لەهەمانکاتدا بۆچوونی تر سەری هەڵدا کە دەڵێت پێشەوایەتی (ئیمامەت) تەواوکەری ئیسلامە، بەڕادەیەك کە هەندێك لە زانایانی شیعە پێشەوایەتی و دادوەرییان (الامامە والعدل) خستەپاڵ سێ بنەما سەرەکییەکانی ئاین کە بریتین لە: یەکتاپەرستی و پەیامبەرێتی و زیندووبوونەوە، هەندێکیشیان دەڵێن ئەوانە لەبنەماکانی مەزهەبن نەك ئاین، وە ڕیواتگەلێکی زۆر پەیدابووکە برینداركردنی خەلیفە ڕاشیدەکان و هەندێك لە خێزانەکانی پەیامبەری تێدابوو.

شایانی باسە تەنانەت لەسەردەمی خیلافەتی معاویەشدا کە فەرمانی دەدا بەجنێودان بە عەلی لەسەر مینبەرەکان و دوای کوشتنی ئیمام حوسەین و سەرهەڵدانی ئەو شۆڕشانەی بانگەشەیان بۆ تۆڵە سەندنەوە دەکردو لەو سەردەمانەی کە تەشەییوع خیلافەتی ئەمەوی دەهەژاندو پشتی دەشکاندو ڕێگای خۆش دەکرد بۆ خیلافەتی عەبباسی هیچ شوێنەوارێکی ئەم بۆچوونە نامۆیانە نەدەبینرا کە کتوپڕ دوای دیارنەمانی گەورە لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا سەری هەڵدا.

ئەو بۆچوونانەی کە هەندێك لەڕاوییەکانی شیعەو هەندێك لە زانایانی مەزهەب بەشدارییان کرد لە بڵاوکردنەوەو چاندنی لە مێشکی خەڵکانی سادەی شیعەدا، لەهەمان کاتدا بیرۆکەی تەقییە سەری هەڵدا کە فەرمانی دەدا بە شیعەکان بەڕواڵەت وزارەکی شتێك بڵێنو لەناخداو لەنێوان خۆیاندا شتێکی تر بۆ پاراستنی ئەو بۆچوونە نوێیانەی کە پێویستیان بە شاردنەوە هەبوو چ بۆ بڵاوکردنەوەی لەناو ئەوانەی متمانەیان پێدەکەن وە یا بۆ پاراستنیان لەدەسەڵات، وە بۆ ئەوەی ئەم بۆچوونە نامۆیانە پشتیوانێکی ئاینییان هەبێتو کەس نەتوانێت گومانیان لەسەر دروست بکات زاناکانیان ئەم ڕیوایەتانەیان دایە پاڵ ئیمامەکانی شیعە بەتایبەت هەردوو ئیمامی باقرو صادق، وە بۆ چەسپاندنو جێگیرکردنی ئەم ڕیوایەتانەو ڕێگرتن لە لێکۆڵینەوە لەناوەڕۆکەکانیانو وەرگرتنیان بەبێ سێو دوو بیرۆکەی پاکێتیو دووری لەهەڵەو گوناه (عصمە) هاتەکایەوە بۆ ئەوەی ببێتە پشتوانێکی تر بۆ ئەوەی ئەم ڕیوایەتە نامۆیانە بکرێنە فەرمودەی پیرۆز کەملکەچی بن بێ وتوێژو توێژینەوەو ڕەت کردنەوە. ئەم بۆچوونە نامۆیانە لەمەودا لەبەشی تایبەتدا باس دەکەینو وتوێژیان لەسەر دەکەین، بەڵام ئێستا دەگەڕێینەوە بۆ باسی پێشەوایەتیو جێنشینی بۆ ئەوەی وتوێژ لەسەر ئەو گۆڕانکاریانە بکەین کەڕاویو زانایانی مەزهەب دایانهێنا دوای دیارنەمانی گەورە.

ئەگەر دادپەروەرانە بەدوای ئەو ڕیوایەتانەدا بچین کەڕاوییە شیعەکان هێناویانە لەو کتێبانەی لەنێوان سەدەی چوارەمو پێنجەمی کۆچیدا نووسیویانە دەگەینە دەرەنجامێکی زۆر غەمناك ئەویش ئەوەیە کە ئەو هەوڵانەی هەندێك لە ڕاوییەکانی شیعە داویانە بۆ ناشیرینکردنی ئیسلام کۆششگەلێکن بە قورسیی زەویو ئاسمانەکان، وە من وای بۆ دەچم کە ئەو

کۆششانە بەمەبەستی چەسپاندنی بیرو باوەڕەکانی شیعە نەبووبێ لەدڵی خەڵکیدا بەڵکو مەبەستیان بەدکاری‌و خراپەکاری بوویێت بەرامبەر بە ئیسلام‌و هەرچییەك پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەبێ.

وە کاتێك ورد دەبینەوە لەو ڕیوایەتانەی دراونەتە پاڵ ئیمامەکانی شیعەو لەو توێژینەوانەی بڵاوکراونەتەوە دەربارەی جێنشینی‌و بریندارکردنی هەموو یارانی پەیامبەرو هەڵتەکاندنی سەردەمی پەیامبەرو ئەو کۆمەڵگا ئیسلامییەی کەلەژێر سایەی پەیامبەرێتیدا دەژیا بۆ ئەوەی لەبەرترو شیاوتری عەلی‌و ئەهلی بەیتەکەی بسەلمێنن بۆ خیلافەت‌و بۆ ئەوەی بەرزی پلەیان‌و گەورەییان بسەلمێنن دەبینین ئەو ڕاوییانە بەشێوەیەکی زۆر توندو سەختتر لەو خراپەیەی بەرامبەر یاران‌و خەلیفەکان کردویانە بەرامبەر بە عەلی‌و ئەهلی بەیتەکەی کردویانە.

بەکورتی شێواندنی هەموو شتێك پەیوەندی بە پێغەمبەرو سەردەمەکەیەوە هەیە، هەرلە ئەهلی بەیتەکەیەوە تاکو یارانی، لێرەدا موچوڕکە بە لەشمدا دێت‌و سەرسامی دەمگرێت‌و ئەم پرسیارەم بۆ دروست دەبێت: ئایا ئەو ڕاوییانەی شیعەو فەرمودەناسەکانیان ڕوخاندنی ئیسلامیان لەژێر پەردەی خۆشەویستی ئەهلی بەیتدا نەگرتۆتە ئەستۆ؟

ئەم ڕیوایەتانە (فەرمودانە)ی دراونەتە پاڵ پێشەوایانی شیعە کە کەڵە پیاوانی ئیسلام‌و زانایانی ئەهلی بەیتن چی دەگەیەنن؟

ئەم فەرمودانەی داویانەتە پاڵ پێشەوایانی شیعە کە دژو پێچەوانەن لەگەڵ ژیانی ئیمامی عەلی‌و ئیمامەکان لە نەوەی عەلی چی دەگەیەنن، جگە لەوەی کەزۆرێك لەو ڕیوایەتانە دژو ناکۆکن لەگەڵ ژیری‌و سروشتی مرۆڤدا؟

گومانم نییه لەوەی کە هەندێك لەزانایانی فەرمودەی شیعەو لە پشتیانەوە فەقیهەکانیان دوای ئەوەی بە فەرمیی دیارنەمانی گەورە ڕاگەیەندرا دەستیان کرد بەم دەست درێژییە بۆ سەر پێشەوایانی شیعەو دانانی فەرمودە بەسەر زمانیانەوە. لە ئیمامی مەهدییەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: "هەرکەسێك لافی بینینی من لێبدات لە ئەمڕۆ بەدواوە باوەڕی پێمەکەنو بەدرۆی بخەنەوە"[١]

بەو شێوەیە هەموو دەرگاکان داخران لەڕووی پەیوەندی کردن بە ئیمامەوەو پرسیارکردن لە ڕاستی ئەو ڕیوایەتانەی دەدرێنە پاڵی یان پاڵ باپیرانی لە پێشەوا پاکەکان، بەو شێوەیە بوار ڕەخساو جادە چۆڵ بوو بۆ ئەوانەی لەبۆسەدابوون بۆ تەشەییوعو ئیسلامو پێنووسەکانیان خستەکار بۆ نووسنی هەرشتێك دڵیان دەیەوێتو ئارەزووی دەکەن.

بۆ ئەوەی ڕوونتر بێ حەز دەکەم خاڵ لەسەر پیتەکان دابنێمو لەجێنشییەوە دەست پێبکەم بۆ ئەوەی ببینین کە هەرچیان گێڕاوەتەوە دەربارەی خەلیفەکانو یارانی پەیامبەر (ﷺ) بەتوندی دژ بەیەكو پێچەوانەیە لەگەڵ ژیانی ئیمامی عەلیو ئەهلی بەیتەکەیدا.

دوای ئەوەی دەبینین چۆن ئەو فەرمودە گێڕەوانەو هەندێك لە زانایانی شیعە بۆ پتەوکردنی بۆچوونەکانی خۆیانو بێبایەخ کردنی هەڵوێستە ڕاشکاوەکانی ئیمامی عەلیو نەوەکانی کە ئەو شتانە بەدرۆ دەخەنەوە کەدراوەتە پاڵیان چۆن بەشێوەیەکی سەیرو پێچاوپێچ ئەو هەڵوێستانەیان پێچەوانە کردەوە کەلە ڕواڵەتدا جوانو لەناوەڕۆکدا ناشیرینن بۆ ئەوەی بۆچوونەکانی خۆیان بەوشێوەیەی دەیانەوێت بسەلمێنن.

---

[١] سیرة الائمة الاثنی عشر ج٣، ص٥٧٠ هاشم الحسینی.

## هەڵوێستی ئیمامی عەلی لەجێنشینی:

کەمێك لەمەوبەر وتمان تەشەییوع بەمانای خۆشەویستیو هەواداری ئیمامی عەلیو ئەهلی بەیتەکەیو لەپێشتری ئەوو وەچەکەی بۆ جێنشینی دێت، لەو باوەڕەشدام کەسێك نییە نەزانێت ئەو هۆیانەی پاڵیان بەهەندێکەوە ناوە بچنە سەر ئەم بیروباوەڕە چین. لەوانە:

ئیمامی عەلی لەماڵی پەیامبەردا پێگەیشتو گەورەبوو وەکو خۆی بەم شێوەیە باسی دەکات:

"ئێوە پێگەی من لە پەیامبەر دەزانن لە ڕووی خزمایەتی نزیكو ڕێزو خۆشەویستی تایبەتەوە، ئەو کاتێك منداڵ بووم دەیخستمە کۆشیو دەیگوشیم بە سنگیەوەو دەیخستمە ناو نوێنەکەی خۆیو جەستەم بەر جەستەی دەکەوتو بۆنی خۆی دەدامێ (بۆنی ئەوم دەگرت)و پاروی دەجوو ودەیکردە دەممەوە، نە درۆیەكو نەکردەوەیەکی نەشیاوی لێ نەبینیم"[1]

ئیمام بەردەوام دەبێت لەدەرخستنی پلەوپایەی خۆی لای پەیامبەرو دەڵێت" "ساڵانە کە پەیامبەر گۆشەگیر دەبوو لە ئەشکەوتی حەڕڕا جگە لەمن کەس نەیدەبینی، لەو ڕۆژەدا ماڵێکی تر نەبوو موسوڵمان بێت پێغەمبەرو خەدیجە نەبێت، منیش سێهەمیان بووم، ڕوناکی نیگام دەبینیو بۆنی پەیامبەرێتیم دەکرد، گوێم لە زایەڵەی شەیتان بوو کاتێك نیگا دابەزی بەسەر پەیامبەردا (ﷺ) وتم: ئەی پەیامبەری خوا ئەو زرنگەیە چییە؟ فەرمووی: ئەوە شەیتانە بێ ئومێد بوو لەوەی چیتر بپەرسترێت، هەرچیەك

[1] نهج البلاغه ج٢، ص١٥٧.

من دەیبیستمو دەیبینم تۆش دەیبیستیو دەیبینی تەنها ئەوەندە هەیە کە تۆ پەیامبەر نیت بەڵام هاوکاری منیو ڕوو لە باشیت"[1]

باجارێکی تر گوێ لە ئیمام بگرین: "پەیامبەر (ﷺ) کاتێ کۆچی دوایی کرد سەری لەسەر سنگم بوو، وە ڕۆحی لەسەر ناو لەپم دەرچوو و هێنام بەدەموچاویدا، ئەرکی شۆردنی خرایە ئەستۆی منو مەلائیکەش یارمەتیدەرم بوون، ناوەوەو دەرەوە جمەیان دەهات لە مەلائیکە، کۆمەڵێك دادەبەزینو کۆمەڵێك سەردەکەوتن بۆ ئاسمان، هەر نوێژیان لەسەر دەکرد تا ناشتمان، جا کێیە ئەو کەسەی لەپێشترە لەمن بۆ ئەو بە زینوویی و مردوویی، جا باش دڵو چاوتانم بۆ بکەنەوە"[2]

---

ئەمە پێچەوانەی بیروباوەڕی ئیسلامییە، نەعەلی وە نەکەسی تر نەیاندەتوانی ئەو شتانەی پێغەمبەر دەیبینیو دەیبیست ببینو ببیستن چونکە ئەو شتانە تایبەتن بە پلەی پێغەمبەرایەتییەوە.(وەرگێڕ)

[2] ئەم قسەیەی دراوەتە پاڵ ئیمامی عەلی کە گوایە سەری پێغەمبەر لەسەر سنگی عەلی بووەو ڕۆحی لەسەر ناو لەپی ئەودا دەرچووە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە زۆرێك لە شتەکانی نهج البلاغە هەڵبەستراون بەسەر زمانی ئیمامی عەلییەوەو دوورن لە ڕاستییەوە چونکە بە ڕیوایەتی ڕاست سەلمێنراوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ژوورەکەی عائیشەو سەری لەکۆشی عائیشەدا بوو کاتێ‌کۆچی دوایی کرد وە بۆ ئەوەی دڵنیا بیت لەڕاستی ئەم ڕیوایەتەی ئەهلی سوننە کە لە بوخاریو موسلیمدا هاتووە لەوەی شیعە کە لە نهج البلاغەدا هاتووە بڕۆ بەدرێژی چیرۆکی کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) بخوێنەرەوە، دەبینی ڕیوایەتەکەی سوننە کە دەڵێن لای حەزرەتی عائیشە کۆچی دوایی کردووە تەواوترو تۆکمەترە چونکە بە دووروودرێژی باسی دوا ساتەوەختەکانی ژیانی پێغەمبەر دەکات (ﷺ)و دواتریش کە مسوڵمانان دەکەونە گفتۆ لەسەر شوێنی ناشتنی پێغەمبەر (ﷺ) بە پشت بەستن بەو فەرمودەیەی کە دەڵێت پێغەمبەران لەو شوێنەدا دەنێژرێن کە تێیدا دەمرن ، لە ژوورەکەی عائیشە دەینێژن.

جارێکی تریش باسی خۆیو نزیکی لە پایەمبەرەوە دەکات لەو نامەیەی بۆ والیەکەی لە بەسرە عوسمانی کوڕی حەنیف دەینێرێت کە تێیدا هاتووە "من بۆ پەیامبەر وەکو برا بۆ براو بازوو بۆ قۆڵ وابووم"

دوای ئەم هەمووە مێردی فاتیمەی زەهراو باوکی حەسەنو حوسەینو پاڵەوانی مسوڵمانانو یەکێك بوو لە گەورەترین بنیاتەرانی ئیسلامو بەدڵو زمانو خوێنو ئارەقەی بەرگری لە پەیامبەرو پەیامەکەی کردووە لەکاتێکدا هێشتا باڵق نەبوو بوو وە ویستی خوا وا بوو لەماڵی خوادا لەدایك بێتو لەماڵی خواشدا شەهید بکرێت.

وێنە گەشەکەی عەلیو کۆششەکەیو جێگەی لەدڵی ئیسلامدا ئەو کاتە پتەوتر دەبێت کە ئەو فەرموودە زۆرو ڕاستانەی فەرمودەناسانی شیعەو سوننە گێڕاویانەتەوە لە خۆشەویستی پەیامبەر بۆیو لە چۆنێتی مارەکردنی فاتیمە لێی. پەیامبەر (ﷺ) بەفەرمانی ئاسمان فاتیمەی لە عەلی مارەبڕیو هەموو خوازبێنیکەرانی تری بەم قسەیە ڕەتکردەوە: "من چاوەڕوانی بڕیاری خوام لەبەشوودانی فاتیمەدا"

کاتێك بڕیاری خوایی دابەزی ئەو زەواجە پیرۆزە لەنێوان عەلیو فاتیمەدا ڕوویدا[1]

ئەمەش یەکێکە لەو بەلگانەی کە شیعە هەوڵیانداوە دان بە هیچ چاکەیەکی یارانی پێغەمبەردا نەنێنو هەمووی قۆرخ کەن لە عەلیدا.(وەرگێڕ)

[1] ئەم ڕیوایەتەش لەهەڵبەستنی شیعە خۆیەتی وەکو ئەوەی کە ئەگەر ئەم شتانە نەڵێن خەڵکی ڕێزو پلەوپایەی فاتیمەو عەلی نازانن، ئەم جۆرە ڕیوایەتانەش هەربۆیە هەڵبەستراون بۆ ئەوەی پیرۆزییەکی تایبەت بدەن بەو کەسایەتییانە زیاتر لەوەی کە خوا پێی داون.(وەرگێڕ)

لەشەڕی خەندەقیشدا پەیامبەر بەدوو ڕستە باسی عەلی دەکات کەبەرامبەر هەموو ئەو فەرمودانەیە کە لەباسی چاکەکانی عەلیدا هاتوون، بەڕاستی هەرپیتێك لە پیتەکانی ئەو وشە نەمرە پرشنگدارانە نیشانێکی پەیامبەرانەیە کە موحەممەد (ﷺ) بەسنگی عەلییەوە هەڵی دەواسێت، ئەوە نیشانێکە بە جیهادو دڵسۆزیو گڕوابوون بەخوا پلەو پایەیەکی هەمیشەیی بەخشی بەتەمەنی ڕۆژگارو لە زیندووڕاگرتنی گەورە پیاواندا. دوو ڕستەکە لە ماوەی سەعاتێك یان کەمێك زیاتر لە سەعاتێکدا لەزمانی پەیامبەرەوە دەرچوو، ئەویش کاتێك عەلی دەرپەڕی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنی ئیسلامو پاڵەوانی بێبڕواکان عەمری کوڕی عەبدو ود کە بەتەنها ڕووبەڕووی چەندین جەنگاوەر دەبوویەوە، پەیامبەر لەوکاتەدا فەرمووی: "خوایە وا ئیسلام هەمووی دەرپەڕی بەرووی هەموو بێباوەڕیدا"

وە کاتێك عەمر بەزێنرا بە شمشێری عەلی پەیامبەر (ﷺ) فەرمووی "ئەو لێدانەی عەلی لەڕۆژی خەندەقدا لە پەرستشی هەموو ئینسو جن چاکترە"[1]

ئەوەی وە دووی ژیانی پەیامبەری بەڕێزو ئیمامی عەلی بکەوێت دەگاتە دەرەنجامێك کە ئەو پەیوەندییەی موحەممەدی دەبەست بە عەلییەوە زۆر بەهێزتر بوو لەپەیوەندی خزمایەتی، ئەوە پەیوەندییەکی ڕۆحی بوو کە ڕەگەکەی لە ئاسمانو لقەکەی لە دڵی پەیامبەرو ئامۆزاکەیدا بوو بۆیە بەلامانەوە سەیر نەبێت ئەگەر لەعەلیدا بۆنو بەرامێکی پەیامبەرێتی بەدی

[1] ئەمیش یەکێکە لە ریوایەتە نا لۆژیکییەکانی شیعە، چۆن کوشتنی یەك بێباوەڕ لەپەرستشی ئینسو جن باشترە؟.(وەرگێڕ)

بکەین، ئەوە پەیامبەرە (ﷺ) بەم وشە ئەمرانەی بەرگری لە پەیامەکەی دەکات لەبەرامبەر بێباوەڕەکاندا: "سوێند بەخوا ئەگەر خۆر بخەنە دەستی ڕاستمو مانگ بەدەستی چەپم بۆ ئەوەی دەست لەم بانگەوازە هەڵگرم دەستی لێ هەڵناگرم"

ئەوەش عەلییە بەرگری لەبیرو باوەڕی خۆی دەکاتو دەڵێت: "سوێند بەخوا ئەگەر هەر حەوت هەرێمەکە (مەبەستی ئەستێرەکانە)و ئەوەی لەژێر سایەیاندایە بمدرێتێ بۆ ئەوەی سەرپێچی خوا بکەم بەوەی دەنکە جۆیەك لە مێرولەیەك زەوت بکەم نایکەم".

دوای هەموو ئەوانەی باسمان کردو گێڕامانەوە شتێکی ئاساییە ئەگەر عەلی خۆی لەکەسانی تر لە پێشتر بزانێت بۆ جێنشینی پەیامبەر (ﷺ)،هەروەها شتێکی ئاساییە ئەگەر کۆمەڵێك لەخەڵکی هەبن بەتوندی باوەڕیان بەو مەسەلەیە هەبێتو ئەو بیرۆکەیە هەوادارو لایەنگرو پشتیوانانی بۆ پەیدابێت، هەروەها شتێکی ئاساییە ئەگەر لە دڵو زمانی پەیامبەردا (ﷺ) ئەوە بخوێنینەوە کە بەڵگە بێت لەسەر جێنشینی عەلی دوای مردنی خۆی[1]

---

بەپێچەوانەوە، ئەوەی ژیاننامەی پێغەمبەر بخوێنێتەوە بەڕوونی بۆی دەردەکەوێت کە جێنشینی پێغەمبەر دوای خۆی ئەبوبەکرەو پاشان عومەر، بەبەڵگەی ئەوەی کە لە ژیاندا وەزیری دەستەڕاستودەستە چەپی بوون ولەهەموو ڕووداوێکدا قسەیان هەبوو لەگەڵ ئەو فەرمودانەی کە ئاماژە بۆ ئەبوبەکر دەکات دوای خۆی وە دانانی ئەبوبەکر بە پێش نوێژ لەکاتی نەخۆشییەکەیداوناردنی بۆ ئەنجامدانی حەج بە موسوڵمانان و پاشان ناردنی عەلی بەدوایدا و لە ژێر ئەمارەتی ئەودا بۆ گەیاندنی سەرەتای ئایەتەکانی سورەی التوبە کە تایبەت بوو بە بت پەرستانەوە (وەکو ڕاگەیەنەر نەك وەکو ئەمیر)و چەندین بەڵگەی واقیعی تر.(وەرگێڕ).

## ئیمامی عەلی بەیعەتی خەلیفەکانی پێش خۆی بەڕەوا دەزانێت:

بەڵام ئایا هەموو ئەمانە کە خاڵی سەرەکیو بەردی بناغەن لەهەموو ئەو شتانەی کەوابەستەن بە ئیمامەت (پێشەوایەتی)و لقو پۆپەکانیانەوە ئەوە دەگەیەنن کە دەقێکی خوایی هەیە بۆ دەستنیشانکردنی عەلی بۆ جێنشینی پەیامبەر (ﷺ) یان ئەمانە حەزێك بوون لە حەزە تایبەتەکانی پەیامبەر (ﷺ)؟.

ئیمامی عەلی دەیوت: هیچ دەقێك نییە لە ئاسمانەوە لەسەر جێنشینی ئەو، وە یارانی عەلیو ئەوانەی هاوچەرخی بوون هەمان بیرو بۆچوونیان هەبوو، وە ئەم بۆچوونە تا سەردەمی دیارنەمانی گەورە بەردەوام بوو، ئەویش ئەو سەردەمەیە کە تێیدا گۆڕانکاری لەبیروباوەڕی شیعەدا ڕوویداو هەموو شتێکی سەرەو ژێر کرد.

جارێکی تر دەڵێین جیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەوەی کە عەلیو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون باوەڕیان وابێت کە عەلی لەکەسانی تر لە پێشتر بوو بۆ جێنشینی پێغەمبەر و مسوڵمانان کەسێکی تریان هەڵبژارد لەگەڵ ئەوەی کەعەلی لەو باوەڕەدا بێت کە جێنشینی مافێکی خوایی خۆیەتی و لێی زەوت کراوە.

ئێستاش با گوێ بیستی ئیمام عەلی بین کەبەوپەڕی ڕوونیو ڕاشکاوییەوە دەربارەی ئەم مەسەلەیە بۆمان دەدوێتو ڕەوابوونی هەڵبژاردنی خەلیفەکانو نەبوونی دەقی ئاسمانی لە سەر جێنشینی دەسەلمێنێت: " من هەر ئەوکەسانە پەیمانیان پێدام کە پێشتر پەیمانیان بە ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان دابوو لەسەر هەمان ئەو شتانەی پەیمانیان پێدابوون، پاش ئەوە نەبۆ ئامادەبووان هەبووە کەسێکی تر هەڵبژێرن وە نە بۆ ئەو کەسانەی لەوێ نەبوون ئەو بەیعەتە ڕەت

بکەنەوە، ڕاوێژیش تەنها بۆکۆچکەروپشتیوانانە، ئەگەر ئەوان لەسەر کەسێك کۆك بوونو کردیانە پێشەوای خۆیان ئەوە ئەو کارە ( ئەو کەسە)جێی ڕەزامەندی خوایە، هەرکەسێکیش لەو ڕێککەوتنە بچێتە دەرەوە بە ڕەخنە یا توانج تێگرتن ئەوا دەبێ بیگێڕنەوە بۆ ئەو شتەی لێی دەرچووە (واتە بچێتەوە سەر ڕای ئەوان)، ئەگەر ڕازی نەبوو دەبێ لەگەڵیدا بجەنگن لەبەر ئەوەی ڕێچکەیەکی تری گرتووە جیاواز لەوەی کە موسوڵمانان گرتوویانە "(واتە یەکڕیزی موسوڵمانانی شکاندوە)[1]

پێش ئەوەی باسی هەڵوێستی ئیمامی عەلی بکەم بەرامبەر خەلیفەکانی پێش خۆیو پێش ئەوەی بەدرێژی بچینە ناو ئەم باسەوەو وتەکانی ئیمامی عەلی بەبەڵگە بێنینەوە کە ئەم هەڵوێستەش گرنگیەکی زۆری هەیە لەدەرخستنی ڕاستیو ڕۆشنکردنەوەی ڕووداوەکە،ناچارین بەدرێژتر دەربارەی

---

[1] نهج البلاغه ج٣ ص٧.=

= ئەمە گەورەترین بەڵگەیە کە خیلافەت بە هەڵبژاردنە نەك بەدەستنیشانکردن لەلایەن پێغەمبەرەوە یان لەلایەن خواوە، وە ئەگەر شیعە مەبەستیان شوێنکەوتنی ڕاستی بێت ئەم قسەیەی ئیمامی عەلییان بەسە بەڵام ئەفسوس هیچ بەڵگەیەکی شەرعی و عەقڵی سەرانی شیعە وەرناگێڕێتەوە لەو سەرلێشێواویەیان( وماتغني الآيات والنذر عن قوم لا يؤمنون)يونس١٠١. شیعە لێکدانەوەی سەیریان هەیە بۆ خۆ دەربازکردن لە دەلالەتەکانی قسە و هەڵوێستەکانی ئیمامی عەلی - لێرەدا کە ئیمامی عەلی بنەمایەك ڕادەگەیەنێ لە بنەماکانی چۆنێتی هەڵبژاردنی خەلیفە لە نامەیەکدا کە بۆ معاویەی دەنێرێ ، بێ ئەوەی هیچ تەقییەیەکی تێدا بێت چونکە حاڵەتەکە حاڵەتی دەرخستن و ڕوون کردنەوەو یەکلاکردنەوەی مەسەلەیەکی هەستیارە کە شەرعییەت بوونی خەلیفەیە ، شیعە دەڵێن ئەو قسەیەی بۆ بێتوێڕینی معاویە بوو نەك بۆ سەپاندنی بنەمایەك (وەرگێڕ)

حەزەکانی خودی پەیامبەر لەگەڵ ئەو لایەنە ئاسمانییەی کە بەفەرمانی خواو بەنیگای خوایی دەریدەبڕیو ڕایدەگەیاند بدوێین:

## جیاوازی نێوان فەرمانە خواییەکانو حەزە تایبەتەکانی پەیامبەر (ﷺ):

جیاکردنەوەی ئەم دوو لایەنە لە کەسایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەشدارییەکی گەورە دەکات لەنیشاندانی وێنەیەکی ڕوون دەربارەی لایەنی خواییو لایەنی کەسێتی لە پەیامبەردا (ﷺ) وە ئەگەر ئەوە بزانین کە پەیامبەری بەڕێز هەوڵیداوە جیاوازی بخاتە نێوان لایەنە خواییەکە لە قسەکانیداو ئەو قسەو کردەوانەی پەیوەندیان بە ئاسمانەوە نەبووەو وەکو مرۆڤێك کردوویەتی گەورەیی پەیامبەرو گەورەیی دەروونی پیرۆزیان بۆ دەردەکەوێت.

قورئانی پیرۆز کاتێك بەم شێوەیە دەربارەی پەیامبەر (ﷺ) دەدوێت:
(وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى* نْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى* عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى) النجم ٣,٤,٥ (ئەو بە ئارەزووی خۆی قسە ناکات بەڵکو ئەوە نیگایەکە لەخواوە بۆی دێت، کەسێکی بەتوانا فێری دەکات).

بێگومان مەبەستی ئەوەیە کاتێك پەیامبەر قورئان دەخوێنێتەوەو ئایەتە خواییەکانو ئەو فەرمانانەی بەسەریدا دابەزیوە ڕادەگەیەنێ ئەوە بەو نیگاو وتە خواییەی دابەزیوە بەسەر دڵیدا قسە دەکات، ئەمەش مەرجێکە لەمەرجەکانی باوەڕ بوون بە ئیسلامو بەپەیامی موحەممەد (ﷺ)و بە قورئانی دابەزیو بۆ سەر پەیامبەر (ﷺ).

بەڵام قورئان جیاوازی سەرەکی لەنێوان ئەوەی کەحەزێکە لەحەزە تایبەتەکانی پەیامبەرو ئەوەی فەرمانی خواییە بەشێوەیەکی روونو ڕاشکاوی یەکلایی کردووەتەوە لەو ئایەتانەی گلەیی لە پەیامبەر دەکەنو ئەوانەی رێگە لە پەیامبەر دەگرن لە ئەنجامدانی شتانێك کە حەزی دەکرد بیانکات، با پێکەوە ئەم ئایەتە روونانە بخوێنینەوە:

١- ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ (المائدة: ٦٧).

واتە: ئەی پەیامبەر ئەوەی دابەزیوە بۆت لەلایەن پەروەردگارتەوە رایبگەیەنە، ئەگەر ئەو کارە نەکەیت ئەو کاتە تۆ پەیامەکەی خوات نەگەیاندووە،خواوەندیش دەتپارێزێت لەخەڵکی).

٢- ﴿وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ (الكهف: ٢٤ ).

(یادی پەروەردگارت بکە ئەگەر لەبیرت چوو "إن شاء الله" بکەیت) واتە هەرکاتێك بیرت کەوتەوە إن شاء الله بکە).

٣- ﴿سَنُقْرِؤُكَ فَلا تَنسَى* إِلَّا مَا شَاء اللَّهُ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَى﴾ (الأعلى: ٦,٧ ).

(هەرچیمان پێ خوێندیتەوە لەبیری ناکەیت مەگەر ئەوەی خوا بیەوێت، ئەو هەرچی ئاشکراو نهێنی هەیە دەیزانێت).

٤- (وَلاَ يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ) (آل عمران: ١٧٦ ).

(خەفەت بەو کەسانە مەخۆ کەپەلەو پێشبڕکێ دەکەن لەبێباوەڕیدا).

٥- (ولاَ تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ) (الحجر: ٨٨ ).

(خەفەت بۆ بێبڕواکان مەخۆو باڵت نەوی بکە بۆ بڕواداران).

٦ـ ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ﴾ (الأنفال: ٦٧ ).

(بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە دیلی هەبێت، مەگەر وەختێ لەسەر زەوی بەتەواوی بوو‌بێتە خاوەن دەسەڵات).

٧ـ ﴿عَفَا اللّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ﴾ (التوبه: ٤٣ ).

(خوا بتبەخشێ، بۆچ ئیزنتدان، ڕاوەستابای هەتا بۆت ڕۆشن ببوایە کامیان ڕاستنو درۆزنەکانیش بناسی).

٨ـ ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ (التوبة: ١١٣ ).

(بۆ پەیامبەرو ئەوانەی بڕوایان هێناوە نییە داوای لێخۆشبوون بکەن بۆ بت پەرستان یا خزمی خۆشیان بن دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە ئەوانە ئەهلی دۆزەخن).

٩ـ ﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ﴾ (الأحزاب: ٣٧ ).

(بیرت بێتەوە کاتێك بەو کەسەی کە خوا چاکەی لەگەڵدا کردووەو تۆش چاکەت لەگەڵدا کردووە دەتوت ژنەکەت ڕاگرەو تەڵاقی مەدەو لەخوا بترسێ، شتێکت لەدڵی خۆتدا شاردبوەوە کەخوا دەریدەخات، لەقسەو تانەی خەڵکی دەترسی، خوا شیاوترە لێی بترسە).

١٠ـ ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّى* أَن جَاءهُ الْأَعْمَى* وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى* أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ الذِّكْرَى* أَمَّا مَنِ اسْتَغْنَى* فَأَنتَ لَهُ تَصَدَّى* وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا

يَزَّكَّى* وَأَمَّا مَن جَاءكَ يَسْعَى* وَهُوَ يَخْشَى* فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّى* كَلاَّ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ) (عبس ١-١١).

(ناوچەوانی گرژ کردو ڕووی وەرگێڕا، لەبەرئەوەی نابیناکە هات بۆلای‌و قسەکەی پێبڕی، تۆ چوزانیت بەڵکو ئەو بیەوێت خۆی پاککاتەوە لەگوناه، یان بیری بکەوێتەوەو پەندو ئامۆژگاری وەرگرێ، ئەو ئامۆژگارییەی تۆ قازانجی پێدەگەیەنێ، بەلام ئەو کەسەی کە خۆی بێ نیازو بێ مەبەستە، تۆ بەرۆکی دەگریت‌و لەگەڵیدا خەریك دەبیت، تۆ هیچت لەسەر نییە ئەگەر ئەو خۆی پاك نەکاتەوەو دەست لە بێباوەڕی هەڵنەگرێ، بەلام ئەو کەسەی کە پەلە دەکات بۆ هاتن بۆلای تۆو لەخوا دەترسێ، تۆ خۆتی لێ هەڵەو بێئاگا دەکەیت، نەخێر وامەکە ئەمانە پەندو بیرخستنەوەن، هەرکەسێك بیەوێت‌و حەز بکات ئامۆژگاری لێوەردەگرێت).

١٢- (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ) (الكهف: ١١٠ ).

(بڵێ من مرۆڤێکم وەکو ئێوە نیگام بۆ دێت کە پەرستراوی ئێوە تاك‌و تەنهایە).

١٣- (إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ) (الزمر: ٣٠ ).

(تۆ دەمری‌و ئەوانیش دەمرن).

هەرکەسێك لەم ئایەتانە وردبێتەوە بەدڵنیاییەوە دەزانێت کە قورئانی پیرۆز زۆر پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە پەیامبەری خوا (ﷺ) فریشتەو ڕەگەزێکی ئاسمانی نەبووە، وە نە بەدیهێنراوێکە لەدەرەوەی ئەم گێتییەو لەدەرەوەی سروشتی ئەم گێتییە بەڵکو ئەو مرۆڤێکە وەکو هەموو مرۆڤەکان دەخواو دەنوێت‌و نەخۆش دەکەوێت‌و چاك دەبێتەوە ڕق هەڵدەگرێ‌و

خۆشەویستی دەنوێنیو ژن دێنیو منداڵی دەبێ بەگوێرەی یاسا سروشتییەکانی گێتیو ئەوەی لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا ڕوو دەدات بەسەر ئەویشدا ڕوودەدات. ئاشکراشە کە جەخت کردن لەسەر ئەم لایەنە مرۆڤانەیە لە پەیامبەردا بۆ سەلماندنی ئەوە بووە کە هەرچی شتێك لە پامبەرەوە دەردەکەوێت ئەوە ناگەیەنێت کە نیگا یا وتەی خوایین یا فەرمانی ئاسمانی بێت، لایەنە خواییەکە لە پێکهێنانی پەیامبەر (ﷺ) خۆی ئاشکرای دەکردو ڕایدەگەیاند کە نیگای بۆ دەهاتو داوای لە نووسەرانی نیگا دەکرد وتەکانی خوا بنووسنەوە.

هەرکەسێك لەئاکاری پێغەمبەر (ﷺ) بکۆڵێتەوە بەڕوونی بۆی دەردەکەوێت کە ئەو وەکو لەمەوبەر باسمان کرد بەهەموو توانایەکیەوە هەوڵی دەدا جیاوازی لەنێوان لایەنی ئاسمانیو لایەنی زەمینی لەکەسی پەیامبەردا دەربخاتو زەقی بکاتەوە، وە ئەمە گەورەترین نیشانەو بەڵگە بوو لەسەر بەهێزی دەروونی پەیامبەرو ڕاستگۆیی لە پەیامەکەیداو دڵسۆزی بۆ پەروەردگاریو مەزنی کەسایەتییەکەی، ئەمانەش ئاکارێکن هیچ نێردراوێکی ئاسمانیو مەزنێکی زەمینی ناگاتێ، ئەم ڕۆڵە دیارو مەزنەی پەیامبەر دەیبینی بۆ ئەوەبوو کەلەو شێوەدا دەرکەوێت کە خوا تایبەتمەندی کردووە پێیو ئەو سیفەتانەی پێی بەخشیوەو باسی کردووە (ئەوە مرۆڤێکە خواردن دەخواتو بەبازاڕدا دەگەڕێت)بەڵام موژدەدەرو ورياکەرو بەئاگاهێنەرە خوا بۆ هەموو دونیای ناردووە. کاتێك ئایەتەکانی گلەیی دادەبەزین بەسەریدا بەوپەڕی ئەمانەتو دەستپاکییەوە دەیخوێندەوە بۆ خەڵکی،.وە کاتێك ئایەتەکانی ستایشو پیاهەڵدان دادەبەزین بەسەریدا لە پێگەی بەندایەتییەوە دەیخوێندەوە، ئەو نە بەخوێندنەوەی ئایەتەکانی گلەیی

هەستی بە کەمایەتیو شکاندن دەکرد وە نەبەدابەزینی ئایەتەکانی ستایش تووشی فیز زلیو لەخۆبایی بوون دەبوو.

بەم شێوەیە ئایەتەکانی گلەییو ئاگادارکردنەوە هێزێکیان بە پەیامبەر دەبەخشی کەمتر نەبوون لەهێزی ئایەتەکانی ستایشو پیاهەڵدان، بۆیە سەیر نییە ئەگەر پەیامبەر وشەگەلێکی بەسەردا دابەزێت بەسەر هیچ یەکێك لەپەیامبەرە خاوەن هێزو ورەکان (أولی العزم)ی پێش خۆیدا دانەبەزیوە:

(وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ) (القلم: ٤ ).

(بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی).

ڕۆڵی دیارو بەرچاوی پەیامبەر لەسنووری جیاکردنەوەی پێگەی ئاسمانی لە پێگەی مرۆڤیی خۆیدا نەوەستا بەڵکو زۆر لەوەی بەخەیاڵی مرۆڤدا دێت زیاتر ڕۆیشت، ئەوە بوو کاتێك پیاوێك ترس دایگرت لە پەیامبەر کاتێك چاوی پێکەوت، پەیامبەر (ﷺ) پێی فەرموو:

(هێور بەرەوە من کوڕی ژنێکم گۆشتی وشکەوە بووی دەخوارد).

ئەم مەزنییە ڕۆحییە (دەروونییە) لە خۆنەخوێندەوە سنوورەکانی زەویو ئاسمانی تێپەڕاندو لەگەورەترین ڕواڵەتەکانیدا دەرکەوت کاتێك کە ڕۆژی مردنی ئیبراهیمی کوڕی پەیامبەر ڕۆژ گیراو خەڵکی وتیان "لەبەرمردنی کوڕەکەی پەیامبەر ڕۆژ گیرا" پەیامبەر (ﷺ) گوێی لێبوو خەڵکی چیان وتووە یەکسەر کۆی کردنەوەو چووە سەر مینبەرو فەرمووی: "ڕۆژو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، بەمردنی کەس ناگیرێنو ئیبراهیمیش بەخواستو بڕیاری خوا مرد".

بەو شێوەیە پەیامبەر (ﷺ) هەموو ڕواڵەتێك لەڕواڵەتەکانی پیرۆزی لەخۆی دوورخستەوە بۆ ئەوەی بەندایەتی خۆی بۆ خوا بسەلمێنێت وە ئەو مرۆڤێکە سودو زیانی خۆی بەدەست نییە:

(قُل لاَّ أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرّاً وَلاَ نَفْعاً) (يونس: ٤٩ ).

(بلێ من سودو زیانی خۆمم بەدەست نییە).

وە پەیامبەر لە بەندایەتی خۆی‌و پەرستشی خۆی بەشێوەیەك زیاد دەكات كەخوا پێی بفەرموێت:

(طه* مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى) (طه: ١-٢)

(ئەی موحەممەد ئێمە قورئانمان نەناردۆتە خوارەوە بۆ سەر تۆ بۆ ئەوەی دووچاری ناڕەحەتی‌و غەم‌و پەژارە ببی).

## ئازادی فیكری‌و كۆمەڵایەتی لەسەردەمی پەیامبەردا (ﷺ):

ڕووی دووەمی تەواوكەری ژیانی پەیامبەر (ﷺ) لە شتێكی تردا بەگەشی دەردەكەوێت ئەویش ئازادی فكری‌و كۆمەڵایەتییە كە پەیامبەر (ﷺ) بەخشیبووی بە یارانی‌و بە موسوڵمانان، بەڕاستی مرۆڤ سەری نەوازشە دادەنەوێنێت بۆ گەورەیی پەیامبەر (ﷺ) كاتێك سەرنجی ئەو سەردەمە دەدات‌و ئەو ئازادییە فیكری‌و كۆمەڵایەتییە دەبینێت كە پەیامبەر بەخشیبووی بە مسوڵمانان، ئەمەش لایەنی تەواوكەری ئەو ڕێگایە بوو كە پەیامبەر گرتبوویە بەر بۆ جیاوازی خستنە نێوان كەسایەتی ئەوەوە وەكو نێردراوێكی خوا وە موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا وەك مرۆڤێك، ئەگەر توێژەرو لێكۆڵەرەوە مێژووییەكان لەم لایەنەی سەردەمی پەیامبەر (ﷺ) بكۆڵنەوەو سیاسەتی كۆمەڵایەتی پەیامبەر تاووتوێ بكەن تێگەیشتنی زۆرێك لەو شتە ئاڵۆزانەی پەیوەندییان بە سەردەمی پێغەمبەرو دوای مردنییەوە هەیە بۆ ئاسان دەبێت‌و زۆرێك لەناكۆكییە فیكری‌و مەزهەبییەكانی نێوان موسوڵمانان كە جارێك بووەتە هۆی خوێن ڕشتن‌و جارێكی تر هۆی جنێوو تانەو تەشەر لەیەك گرتن چارەسەر دەكرێت.

پەیامبەر (ﷺ) ئازادییەکی فیکریو کۆمەڵایەتیو یەکسانییەکی وای بەخشیبوو بە موسوڵمانان هەر لەسەرەتای بانگەوازەوە تا دوا ڕۆژی ژیانی پیرۆزی کەلەهیچ سەردەمێکی ترو لای هیچ میللەتێکی ترو تەنانەت لەم سەردەمەشدا لای پێشکەوتووترین میللەتان لەڕووی دیموکراسیو ئازادییەوە نەبینرێت.

باوەڕ ناکەم لەمێژووی دیموکراسییەتو یەکسانیدا لەکۆنو نوێدا هەبووبێت سەرکردەی گەلێكو بنیاتنەری ئوممەتێكو پێشەوایەکی فیکری لەگەڵ یارانیدا لەشێوەیەکی بازنەییدا دابنیشێت بۆ ئەوەی کۆڕەکەی لای سەرەوەو لای خوارەوەی نەبێتو هەموو یەکێك لەدانیشتوانی ئەو کۆڕە یەکسان بن لەگەڵیدا وەکو ئەوەی پێغەمبەر دەیکرد بەڕادەیەك کاتێك عەرەبێکی بیابان نشین دەهات بەسەریاندا پێغەمبەری لە یارانی جیا نەدەکردەوەو دەیپرسی کامە موحەممەدە؟ یاران ئاماژەیان بۆ دەکرد کە ئەوە خۆیەتی.

ئەوە بەسە بۆ شانازیو گەورەیی کە پرۆتۆکۆلەکانی دیموکراسی لەسەردەمی چوونە سەرمانگو ئەستێرەکان بیرۆکەی مێزی بازنەیی بۆ کۆبوونەوەی پاشاو سەرۆکەکانیان لەکۆڕەکانی پەیامبەرەوە وەربگرن.

پەیامبەر گەر تەوقەی لەگەڵ پیاوێکدا بکردایە دەستی بەرنەدەدا تاوەکو ئەو کەسە خۆی دەستی پەیامبەری بەرنەدایە وەکو ڕێزلێنانێك بۆ بەرامبەرەکەی، پەیامبەر (ﷺ) وەکو عەلی کوڕی ئەبی تالیب باسی دەکات لەسەر زەوی نانی دەخواردو وەکو کۆیلە دادەنیشتو پێڵاوەکەی بەدەستی خۆی چاك دەکردەوەو بەدەستی خۆی پینەی دەکردو سواری گوێدرێژی بێکۆپان دەبوو وخەڵکیشی لە پشتی خۆیەوە سواردەکرد. ئەم دیموکراسیو

ئازادییە دەگەیشتە چلەپۆپەی کاتێك کە زۆرێك لەخەڵکی دەیانقواستەوەو لە سنووری ڕێزو شەرم دەردەچوون بەرامبەر بە پەیامبەر (ﷺ)و ئەویش بەوپەڕی ئارامیو لەسەرخۆییو ڕووخۆشییەوە دانی بەخۆیدا دەگرت، تاکار گەیشتە ڕادەیەك خوا قورئان دابەزێنێ و گلەییان لێبکات لەسەر ئەو جۆرە ڕەفتارانەیان، تەنانەت ئایەتە قورئانیەکانیش ڕێگرییەکی تەواوی نەکرد لەو جۆرە مامەڵانە لەگەڵ پەیامبەردا بەڵکو سەرزەنشتی کردنو بەنەزانێ ناوزەدی کردن، یان باجێکی خۆبەخشانەی دانا بۆ ئەوانەی لە سنووری ڕێزگرتنی شیاو بۆ پەیامبەر دەردەچن بەڵام خوا هیچێك لەوانەی حەرام نەکرد، با پێکەوە ئەم ئایەتانە بخوێنینەوە:

١ـ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ* إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ* وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّى تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْراً لَّهُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (الحجرات: ٢-٥ ).

(ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە دەنگتان بەرزمەکەنەوە بەسەر دەنگی پەیامبەرداو بەو دەنگە بەرزەی قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن لەگەڵ پەیامبەردا مەیکەن نەوەکو کردەوەکانتان بەتاڵ بێتەوە بەخۆتان نەزانن، ئەو کەسانەی دەنگیان نزم دەکەنەوە لەخزمەتی پێغەمبەردا ئەوانە خوا دڵیانی یەکلایی کردوّتەوە بۆ خواناسی، ئەوانە لێبوردنو پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە، ئەوانەی لەدەرەوەی ژوورەکانەوە بانگت دەکەن زۆربەیان نەفامن، وە ئەگەر دانیان بەخۆیاندا بگرتایە تا دەهاتیە دەرەوە بۆلایان چاکتر بوو بۆیان، خواش لێبوردەو بەبەزەییە).

٢ـ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً ذَلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (المجادلة: ١٢ ).

(ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە ئەگەر دووبەدوو چپەتان لەگەڵ پەیامبەردا کرد لە پێشدا شتێك ببەخشنەوە، ئەوە بۆ ئێوە چاکترو پاکترە، ئەگەر نەشتانبوو ئەوا خوا لێبوردەو بەبەزەییە).

لەو بڕوایەدام پێویست دەکات لەم بەشەدا باسی ڕووداوێکی تر بکەم کە لە ژیانی پێغەمبەردا ڕوویدا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەبوو بەخاتوو عائیشەی دایکی بڕواداران، ئەویش ڕووداوی بوختان هەڵبەستن بوو (إفك) بۆ عائیشە.

ئەوەی بەدووی چیرۆکی ئیفك بکەوێت وێنەیەکی تەواوی بۆ دەردەکەوێت لە ئازادییەکی تەواو کە موسوڵمانان هەیانبوو لە قسەو بیرکردنەوەو ڕادەربڕین، هەرکەسێك مێژووی ئەو سەردەمە بخوێنێتەوە کە بوختانەکەی تێداکراو بلاوبوویەوە لەمەدینەو بوو بە قسەو باسی خەڵکی لەکۆڕو کۆبوونەوەکانیانداو ئەو هەواڵە غەماویانە دەگەیشتنە گوێی پەیامبەر (ﷺ)ئەویش هیچ شتێکی وای لێ بەدەرنەکەوت بۆنی تووڕەیی لێبێت لە یارانی یان لەخەڵکی مەدینە، گومانیشی تێدا نییە کە پەیامبەر (ﷺ). دەیزانی ئەو بوختانەی بۆ عائیشەی خۆشەویسترین خێزانی دوای خەدیجەو کچی هاوەڵی ئەشکەوتی‌و نزیکترین یارانی هەڵبەستراوو بێبنەمایە بەڵام نەیویست دەسەڵاتی خۆی بەکاربهێنێت وەکو سەرکردەیەك یان سنوور بۆ ئازادی خەڵکی دابنێت لەدەربڕینی بۆچوونی خۆیان، مێژوو بە هیچ شێوەیەك ئاماژەی بەوەنەداوە کە پەیامبەر (ﷺ) داوای لەیارانی کردبێت دەست لە باسکردنی ئەو مەسەلەیە هەڵگرن یان ڕێگەی لێگرتبن یان شتێکی وای

لێدەرکەوتبێت ئەوە بگەیەنێت کە تووڕەیە لێیان لەبەر ئەو قسانەی بە چپەو ئاشکرا دەیانکرد دەربارەی دایکی بڕواداران، یان لێکۆڵینەوەی کردبێت لەگەڵ ئەوانەی گومان لێکراوبوون لە بڵاوکردنەوەی ئەو تۆمەتو بوختانە لەگەڵ ئەوەی کە پەیامبەر (ﷺ) دوژمنو ناحەزی زۆربوو لە جولەکەو دووڕووەکانو ئەوانەی لە بۆسەدا بوون بۆی بەڵام بەهیچ شێوەیەك بوونی ئەوانەی لەناو مسوڵماناناندا نەکردە بیانوویەك بۆ ئەوەی داوا لە مسوڵمانان بکات دەست هەڵگرن لەو باسە بۆ ئەوەی باری شانی سوك بکەنو برینەکانی قوڵتر نەکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە کێشەکەی زۆر بە ئارامیو هێمنی چارەسەرکرد، تەنانەت ڕاوێژی بە عەلیو زەیدی کوڕی حاریسەو هەندێك لە یاراتی کرد لە چۆنێتی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، نەك لەگەڵ بوختانچییەکاندا بەڵکو لەگەڵ دایکی بڕواداراندا.

لەگەڵ ئەوەی کە کاریگەری ڕووداوەکە سەخت بوو لەسەر خاتوو عائیشەو باوکیو خێزانەکەی، ئەوە بوو عائیشە نەخۆش کەوتو لاوازبوو و کەوتە جێگاوە. ئەم هەرا کۆمەڵایەتییە نامۆیە دڵی پێغەمبەری دەگوشی بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا سیاسەتی خۆی نەگۆڕی لە سنوور دانان بۆ ئازادییە کۆمەڵایەتییەکان،یان خەڵکی ناچار بکات لەسەر بێدەنگیو خۆهەڵنەقورتان لەوەی لە کۆڕو کۆبوونەوەکانی مەدینەدا ڕوودەدات، لێرەدا ویستو دەسەڵاتی خوایی دەرکەوت بۆ ئەوەی سنوورێکی ئاسمانی دابنێت بۆ ئەو بریندارکردن و تۆمەتە بێ بنەمایانەی هەندێك دەیاندایە پاڵ هەندێکی تر بەبێ شایەتو بەبێ بەڵگە، ئەوەبوو خوا ئەم ئایەتانەی دابەزاند بەسەر دڵی پەیامبەردا (ﷺ):

"ئەو کەسانەی ئەو بوختانەیان هەڵبەست دەستەیەکن لەخۆتان، پێتان وا نەبێ ئەوە خراپە بۆتان، بەڵکو قازانجە بۆ ئێوە، هەریەك لەوانە بەپێی بەشداری لەو تاوانەدا تاوانی لەسەر نووسراوە، ئەوەشیان کەپشکی سەرەکی ئەو تاوانەی لە ئەستۆ گرت سزای سەختی بۆ هەیە" سورەتی النور، ١٠.

بەو شێوەیە پەروەردگار پاکێتیو بێتاوانی عائیشەی ڕاگەیاندو سنوورێکی بۆ ئازادی بریندارکردنو ناوزڕاندنی خەڵکی دانا.

لێرەدا دەمانەوێت شتێك هەڵێنجێنین کە گرنگترە لەم ڕووداوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو کۆمەڵگەیەی ئازادی ڕادەربڕینو ئازادی قسەکردن چ ڕاست بێت یان هەڵە بگاتە ئەو ئاستەی ڕەچاوی پیرۆزیو شکۆمەندی ئەو پەیامبەرە نەکات کە ڕزگاری کردن لە گومڕاییو تیاچوونو ڕێنمایی کردن بۆ بەختەوەری دونیاو قیامەتو هەموو ڕێگە چاکەکانی پێ نیشان دان، تا بگاتە ڕادەیەك پێویست بکات ئایەتی قورئان دابەزێت بۆ تەمێ کردنی ئەو کەسانەی بەو کارە هەستان لەو کۆمەڵگەیەدا:

ئایا دەکرێ بۆ پەیامبەر لە ئاوها کۆمەڵگەیەکدا زۆر لەخەڵکی بکات شتێك بکەن بەدڵیان نەبێت ئەگەر ئەو شتە لەلایەن خواوە نەبێتو بەدەقێکی قورئانی نەبێت کە لەبەرامبەریدا ئازادییە فکرییەکانو کۆمەلایەتییەکان دەتوێنەوەو تاكو کۆمەل لەبەرامبەر فەرمانە خواییەکاندا ملکەچو گوێڕایەڵی بەولاوە هیچی تریان بۆ نییە؟

پەیامبەر (ﷺ) دەیتوانی کۆمەڵگەیەك دروست بکات لەبڕواداران کە ملکەچی ویستەکانی ئەوبنو لەفەرمانی دەرنەچن، بەڵام ئاوها کارێك پێچەوانەی ئەو پەیامە بوو کە لەپێناویدا هاتبوو، ئەویش نەهێشتنی هەموو بەندایەتییەکانو ئەو دابونەریتانەی پێوەی بەندن بەندایەتی خوای تاكو تەنها

نەبێت. وەکو دەزانین ئیسلام هاتووەو پەیامبەر نێراوە بۆ لەناوبردنی هەموو ئەو بیرو بۆچوونو پاشماوە نەفامییانەی کە گرنگترین دیاردەکانی بریتی بوو لە پەرستنی مرۆڤ بۆ مرۆڤو ملکەچی مرۆڤ بۆ مرۆڤ، بەو شێوەیە ئیسلام خەڵکی لە تاریکایی کۆیلایەتی فیکریو جەستەیی دەرهێنا بۆ ڕووناکیو ئازادی، بۆیە ئەو کۆمەڵگە ئیسلامییە ساوایە لەم ئاینە تازەیەدا هەموو هۆکارو بنەماکانی ژیانو ڕێزی تاكو مرۆڤی تێدادەبینی.

ئیسلام ئەو پەیامە ئاسمانییەیە کە ئەو کۆمەڵگە چینایەتییەی پێکهاتبوو لە ئاغاو کۆیلە گۆڕی بە کۆمەڵگەیەکی یەکگرتووی پێکهاتوو لە خەڵکانێکی یەکسان لەبەردەم خوادا کە تێیدا هیچ کەسێك لەهیچ کەسێکی تر بەڕێزترو لەبەرترنییە لای خوا بەخواناسیو خواپەرستی نەبێت:

(إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللّهِ أَتْقَاكُمْ) (الحجرات: ١٣ ).

(بەڕێزترینتان لای خوا ئەوەتانە کە زیاتر خواپەرستە).

وە لە دەرەنجامی ڕزگاربوون لە پەرستنی بتەکانو خوا جیاجیاکانو ڕزگاربوون لەسەرانی قوڕەیشو چوونە ژێر دروشمی بەندایەتی خوای تاكو تەنها ئەو ئازادییە بوو کەخوا بەخشی بە موسوڵمانان کە لە سایەیدا کۆمەڵگەی ئیسلامیی نوێ ئازادی ڕادەربڕینو بیرکردنەوەی بەخۆیەوە بینی بەو مەرجەی ئەو ئازادییە نەبێتە مایەی خەشمو توڕەیی خوا، وە کاتێك کۆمەڵگەی ئیسلامی ویستی ئەو بەربەستانە ببەزێنێ کەلەسەر ئازادی ڕادەربڕین دانرابوو پەیامبەر (ﷺ) ڕێگەی لێنەگرت بۆ ئەوەی سەردەمی ملکەچییان بۆ سەرەك هۆزەکان بەبیر نەهێنێتەوە بەڵکو چاوەڕوانی فەرمانی ئاسمانو دابەزینی نیگا بوو، ئەوەبوو فەرمانی خوایی دابەزی بە پابەندکردنی موسوڵمانان بەڕەوشتی بەرزو بڵاونەکردنەوەی شتی نەشیاو لەناو بڕواداراندا.

"ئەوانەی حەزدەکەن خراپە لەناو بڕواداراندا بڵاوبێتەوە سزایەکی سەختیان بۆ هەیە لەدنیاو دوارۆژدا" النور، ١٨[1]

هەروەها فەرمانی پێدان بەرەچاوکردنی ڕێزی مسوڵمانانو ناو نەزڕاندنیان بە قسەی بریندارکەرو جنێوی پیس:

"ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە با هەندێکتان گاڵتە بە هەندێکی ترتان نەکەن چونکە بۆی هەیە ئەوانەی گاڵتەیان پێدەکرێت لەگاڵتەکەران چاکتربن، هەروەها ژنانیش گاڵتەبەیەکتری نەکەن چونکە بۆی هەیە گاڵتە پێکراوان لەگاڵتەپێکەران چاکتربن‌و ناوو ناتۆرەو تەشەر لەیەکتر مەگرن، دوای بڕوا هێنان لەڕێ لادان زۆر ناپەسەندە، ئەوەشی پەشیمان نەبێتەوەو دەست لەو کارە هەڵنەگرێت، ئەوانە ستەمکارن، ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە دوورکەونەوە لەزۆرێك لەگومانەکان چونکە هەندێك گومان بردن گوناهە،وە لەکاروباری یەکترمەکۆڵنەوە و لە پاشەملەش بەخراپە باسی یەکتر مەکەن، ئایا کەسێك لە ئێوە حەز دەکات گۆشتی براکەی بە مردوویی بخوات؟ دیارە قێزتان لێدەبێتەوە، وە لەخوابترسن، خوا پەشیمانی قبوڵەو دلۆڤانە" الحجرات ١١، ١٢[2]

---

[1] (إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ) (النور : ١٩ ).

[2] (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ* ا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ) (الحجرات : ١١-١٢ ).

بەوشێوەیە گەورەیی پەیامبەر (ﷺ) بەهەموو شکۆیی‌و پیرۆزییەکەوە دەردەکەوێت بەوەی کە تەنها ئەو شتە بڵاو دەکاتەوەو دەسەپێنێ کە خوا ویستوویەتی‌و لەوە زیاتر داوای هیچی تریان لێناکات.

## لێرەدا دەگەڕێمەوە بۆ بابەتی جێنشینی‌و دەڵێم:

ئەگەر پەیامبەر (ﷺ) بەرگری لە خێزانی خۆی نەکرد لەگەورەترین تۆمەتدا کە لەلایەن کۆمەڵێکەوە ئاڕاستەکراو سوور دەیزانی بوختانەو خێزانەکەی بێتاوانە بۆ ئەوەی خەڵکی نەگێڕێتەوە بۆ سەردەمی نەفامی‌و گوێڕایەڵی بێ سنووری ئاغاو سەرۆکەکان، ئایا کارێکی لۆژیکییە زۆر لە ئوممەتەکەی بکات بۆ ئەنجامدانی شتێك ئەگەر فەرمانێکی خوایی لەسەر نەبێت؟ وە ئەگەر پەیامبەر (ﷺ) حەزێکی خۆیی هەبووبێت بۆ دانانی عەلی لەدوای خۆی هەروەکو ئەو فەرموودانەی هەردوولا (شیعەو سوننە) لە ڕێگای ڕاستەوە گێڕاویانەتەوە[١]، بەڵگەن لەسەری بەڵام زۆری لێنەکردوون لەسەر

---

بوونی ئەبوبەکر لەو لەشکرەدا لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکاندا ئاماژەی پێنەدراوە وە ڕووداوەکانیش ئەوە دەگەیەنن کە ئەو لەو لەشکرەدا نەبووە چونکە ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی تێدا کرد بەیانییەکەی ئەبوبەکر لەخزمەتیدا بوو کاتێك بینی پێغەمبەر باری تەندروستی باشە ئیزنی خواست بچێتەوە بۆ لای ئەو خێزانەی کەلە سەنح بوو(گەڕەکێك بوو لە قەراغی مەدینە)، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) نەگەیشتە چێشتەنگاو حاڵی تێکچوو وکۆچی دوایی کرد بەڵام لەشکرەکەی ئوسامە لەناوچەی جورف بوو کە لە دەرەوەی مەدینە بوو، جا ئەگەر ئەبوبەکر لەو لەشکرەدا بووایە دەبوایە ئەویش لە جورف بوایە یان بگەڕایەوە بۆ جورف نەك بۆ سەنح.ئەگەر لە حاڵەتێکیشدا ئەبوبەکر لەو لەشکرەدا بوویێت ئەمە هیچ لە نرخی ئەو کەم ناکاتەوە بەڵکو یەکەم ئەوپەڕی دەسەڵاتی پێغەمبەر دەردەخات بە سەر کۆمەڵگەکەیدا و دووەم ئەوپەڕی گوێڕایەڵی موسوڵمانان

قبولکردنی ئەو خەلیفەیە بەھەمان ئەو ڕێگایەی کە زۆری لە خەڵکی نەکرد دەست لە قسەکردن ھەڵگرن لەسەر خۆشەویسترین خێزانی یان دەست ھەڵگرتن لەمامەڵەکردن لەگەڵیدا بە شێوەیەك کە شیاو نییە بۆ پەیامبەری خوا کاتێك دەنگیان بەسەر دەنگیدا بەرزدەکردەوە یان لەبەردەستیدا چپەیان دەکرد تاوەکو ئایەتە پیرۆزەکان دابەزین‌و فەرمانیان بەخەڵکی دا بە ئەدەب‌و ڕێزەوە ھەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەی ئازادییەکی وای پێبەخشیون کە ھەندێك کەس بەشێوەیەکی نەگونجاو سوودی لێوەرگرن.

جارێکی تر بەوردی دەڕوانینە سەردەمی پەیامبەرو ئەو ئازادییەی کۆمەڵگەی ئیسلامیی تازەپێگەیشتوو تێیدا دەژیا دەبینی ئازادی گەیشتە ڕادەیەك سنوور ببەزێنێت‌و بگاتە قۆناغێکی دژواری وا پەیامبەر تووڕە بکات، چونکە دەرچوون بوو لە ھەموو دابونەریتێکی ڕەچاوکراو لەگوێڕایەڵی سەرکردەی گشتی لەکاتی شەڕدا: نووسەرانی ژیاننامەی پەیامبەر کۆکن لەسەر ئەوەی کە پەیامبەری خوا کاتێك ئەو نەخۆشییەی گرت کە کۆچی دوایی کرد تێیداناردی بەدوای ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریسەو پێی وت: "بڕۆ بۆ ئەو شوێنەی باوکتی تێدا کوژرا ھێرشیان بکە سەر ئەوا کردمی بەسەرکردەی ئەم لەشکرە، ئەگەر خوا سەری خستی بەسەریاندا زۆر مەمێنەرەوەو ھەواڵگر بڵاوبکەرەوەو چەند تیمێك پێش خۆت بخە"

---

دەردەخات بۆ پێغەمبەری خوا (د.خ) .ئەم مەسەلەیەشە لە کتێبێکی سەربەخۆدا چارەسەرمان کردووە بە یارمەتی خوا دەکەوێتە بەر دەستتان.(وەرگێڕ)

کەسێك نەما لە گەورە موهاجیرو ئەنصارەکان لەو لەشکرەدا بەشداری نەکات، لەوانە ئەبوبەکردو عومەر[1]، خەڵکانێك ڕەخنەیان گرتو وتیان: "هەرزەیەکی وا دەکاتە سەرکردە بە سەر گەورە کۆچکەرو پشتیوانەکاندا".

پەیامبەر (ﷺ) کاتێك ئەم قسانەی بیست توڕەبوو و سەری بەستەوەو چووە سەر مینبەرو فەرمووی: "ئەی خەڵکینە ئەو قسانە چین هەندێکتان دەربارەی فەرماندەیی ئوسامە دەیکەن؟ ئەگەر ئەمڕۆ ڕەخنە لە فەرماندەیی ئەو دەگرن ئەوا پێشتر ڕەخنەتان لێگرتین لەسەر دانانی باوکی بەفەرماندەی لەشکر، سوێند بەخوا زەید شیاو بوو بۆ فەرماندەییو ئوسامەی کوڕیشی دوای خۆی شیاوە بۆی وە ئەو دووە لە خۆشەویستترین کەسانن بەلای منەوە، ئامۆژگاری یەکتر بکەن لەبارەیەوە چونکە ئەو لە پیاوە چاکەکانی ناو ئێوەیە"

بەو شێوەیە دەبینین دڵی پەیامبەر (ﷺ) گەورەتربوو لەوەی فەرمان بدات بە سزادانی کەسانێك ڕەخنەیان دەگرت لەو سەرکردایەتییەی هەڵیبژارد بۆ لەشکرەکەیو زیادەڕەوییان کرد بەسەر دەسەڵاتی فەرماندەی گشتیدا کەلەهەمان کاتدا پەیامبەری خواو دامەزرێنەری ئوممەتو بنیاتنەری سەروەریو سەرکردەیەکی سەربازی مەزن بوو کە ئیمامی عەلی بەم شێوەیە

[1] ئەم ڕیوایەتە ئەگەر چی لەڕووی ناوەرۆکەوە دژایەتی نییە لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیدا بەڵام سەرچاوەکەی باوەڕپێکراو نییە کە بریتییە لە (شرح نهج البلاغه، ابن أبی الحدید) ج٣ ل١١٤ وە هەروەها لەگەڵ واقیعی سەردەمی پێغەمبەردا ناگونجێت چونکە بەدرێژایی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) شتێکی وای نەکردووە کە خەڵکی وا بزانن پێغەمبەر زەمینەسازی بۆ عەلی دەکات بۆ ئەوەی ببێتە خەلیفە وە هەرچی شتێك شیعە دەیڵێن لەو بارەیەوە ئەو لێکدانەوەیە هەڵناگرێت بەڵکو شیعە بەزۆر بەو ئاقارەیدا دەبەن.(وەرگێڕ)

باسی دەکات: "ئەگەر شەڕ گەرم بوایە خۆمان دەدایە پاڵ پێغەمبەرو لەو کاتانەدا کەس لەو نزیکتر نەبوو لەدوژمنەوە"

پێغەمبەرێکی وا لەبەردەم ڕەفتارێکی وا مەترسیداردا سەرزەنشتی کەسی نەکردو هەڕەشەی لەکەس نەکردو تۆمەتی لادانو دەرچوون لە ئیسلامی نەدایە پاڵ هیچ کام لەوانەی ڕەخنەیان لە هەڵبژاردنی ئوسامە گرت تەنها ئەوە نەبێ کە لەکۆتایی بەرگرییەکەیدا لە ئەسامە پێی فەرموون شتی باش بڵێن لە بارەیەوە چونکە ئەو یەکێکە لە پیاوە باشەکانی ناو ئێوە.

هەموو ئەم هەڵوێستانەی پەیامبەر (ﷺ) بۆ ئەوە بوو کە بیسەلمێنێ بۆ موسوڵمانان کە هەڵبژاردنی ئوسامە بە فەرمانی خوایی نەبوو، ئەم هەڵبژاردنە هیچ پەیوەندییەکی بە ئاسمانو نیگاوە نییە بەڵکو هەڵبژاردنێکە لەلایەن خودی پێغەمبەرەوەو هەڵقوڵاوی شیاوێتی ئوسامەو حەزی پەیامبەرە بۆ هەڵبژاردنی ئەو بۆ سەرکردایەتی لەشکری موسوڵمانان، وە توڕەیی پەیامبەر (ﷺ) لەبەر ئەو قسانەی کردیان دووچاری لێپرسینەوەیەکی دوا ڕۆژی یان سزایەکی خواییان ناکات، بۆیە لە قسەکانیدا هۆیەکانی هەڵبژاردنی ئەو سەرکردە لاوەی ژماردو داوای لە مسوڵمانان کرد دوای ئەو لەشکرە بکەون.

لێرەدا ریوایەتێك باس دەکەین کە ئیبن عەباس لە خەلیفە عومەرەوە دەیگێڕێتەوە بە ڕاشکاوی هەڵوێستی یارانی پەیامبەر دەردەخات دەربارەی حەزو ئارەزووەکانی پێغەمبەرو ئەو فەرمانە خواییانەی پێی ڕادەگەیاند، ئیبن عەباس دەگێڕێتەوە دەڵێت: "لەیەکێك لە گەشتەکانی عومەردا بۆ شام لەگەڵیدا بووم، ڕۆژێکیان بەتەنیا مایەوە بەسەر حوشترەکەیەوە دەڕۆیشت دوای کەوتم، پێی وتم: ئەی ئیبن عەباس گلەییم هەیە لە ئامۆزاکەت

(مەبەستی عەلی یە) داوام لێکرد لەگەڵمدا بێت بۆ شام ڕازی نەبوو، تا ئێستاش دەبینم زویرە، ئاخۆ بەبۆچوونی تۆ هۆی زویرییەکەی چییە؟

وتم: ئەی پێشەوای بڕواداران خۆت دەیزانی"

وتی: وا گومان دەبەم تا ئێستا دڵی تەنگە لەبەر لەدەستدانی خیلافەت.

وتم: هەر ئەوەیە، ئەو وا دەزانێ پەیامبەر ئەم کارەی بۆ ئەو ویستووە.

وتی: ئەی ئیبن عەباس وا پەیامبەریش ئەوەی ویست ئەی ئەگەر خوا ئەو شتەی نەوێت چی؟ پەیامبەر ئەوەی ویستو خودا شتێکی تری ویست.ویستی خوا جێبەجێی کراو ویستی پەیامبەر جێبەجێ نەکرا، ئایا هەرچی شتێك پەیامبەر ویستبێتی بووە؟ ئەو دەیویست مامی باوەڕ بێنێت بەڵام کەخوانەیوست باوەڕی نەهێنا"[1]

---

بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە( جیاوازی خستنە نێوان حەزەکانی پێغەمبەرو ئەو شتانەی کە وەکو فەرمان لە خواوە پێی ڕادەگەیەنرا و موسوڵمانان بۆیان نەبوو سەرپێچی لێبکەن) دوو ڕووداو باس دەکەین کە و یەکەمیان ابو داود لە سنن دا ریوایەتی کردووەو ماناکەی لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە ودووەمیان  بوخاریی ریوایەتی کردووە :

١. کەنیزەکێك هەبوو بە ناوی بورەیرە ، ژنی کۆیلەیەك بوو بە ناوی موغیث ، دوای ئەوەی ئازاد کراو بوو بە خاوەنی بریاری خۆی ، تەڵاقی خۆی لە موغیس وەرگرت ، موغیس ئەوی زۆر خۆش دەویست و ئەویش زۆر ڕقی لە موغیس بوو ، موغیس چوو بۆ لای پێغەمبەر بۆ ئەوەی قەناعەتی پێ بکات بگەڕێتەوە بۆ لای ، کاتێك پێغەمبەر قسەی لە گەڵ بورەیرەدا کرد لەو بارەیەوە بورەیرە پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانم پێ دەکەیت؟ فەرمووی نەخێر ، بەڵکو شەفاعەتی بۆ دەکەم . بورەیرە ڕازی نەبوو بگەڕێتەوەو پێغەمبەرو موسوڵمانانیش سەرزەنشتیان نەکرد.

٢.  بوخاری لە جابری کوڕی عبد الله ـ وە دەگێڕێتەوە کە کاتێك باوکی مرد قەرزی چەند کەسێکی بەلاوە بوو ، جابر بۆ لای  پێغەمبەر بۆ ئەوەی قسە لە گەڵ خاوەن قەرزەکاندا بکات لە

دوای هەموو ئەو شتانەی کە سەلماندمان بوونی دەقێکی خوایی لەبارەی جێنشینی ڕاستەوخۆی عەلی دوای پەیامبەر ڕووبەڕووی پێنج بەربەستی سەرەکی دەبێتەوە کە هەریەکێك لەوانە بەسە بۆ لەبن هێنانو هەڵتەکاندنی بیرۆکەکە لە بناغەوە، ئەم پێنج بەربەستەش ئەمانەن:

١ـ یارانی پەیامبەرو هەڵوێستیان لە جێنشینی.

٢ـ وتەکانی ئیمامی عەلی دەربارەی جێنشینی.

٣ـ بەیعەتدانی ئیمامی عەلی بە خەلیفەکانی پێش خۆی شەرعیەت بەخشینی بە خەلیفە ڕاشیدەکان.

٤ـ وتەکانی ئیمامی عەلی دەربارەی خەلیفەکانی ڕاشیدین.

٥ـ وتەکانی ئیمامانی شیعە (لەنەوەی عەلی) دەربارەی خەلیفە ڕاشیدەکان.

## ١ـ یارانی پەیامبەر (ﷺ)و هەڵوێستیان لە جێنشینی:

لە لاپەڕەکانی پێشودا وێنەیەکی ڕوونمان دانێ دەربارەی سەردەمی پەیامبەرو ڕادەی ئەو ئازادییە فیکریو کۆمەڵایەتییەمان خستەڕوو کە لەو کۆمەڵگە ئیسلامییە ساوایەدا پراکتیزە دەکراو ئەو ئایەتانەمان هێنایەوە کە بۆ سنووردارکردنی ئەو ئازادییە گوتاریو کۆمەلایەتییانەی ئازاردانی پەیامبەرو بریندارکردنی مسوڵمانانی تێدا بوو، وە پێویستە لەسەرمان بەڕوونیو ڕاشکازی بیلێین کە ئەو وێنەیەی کێشامان بۆ ئەو کۆمەڵگە

---

قەرزەکانیان خۆش بن ، پێغەمبەر (د.خ) قسەی لە گەڵدا کردن و داوای لێکردن لە قەرزەکانیان خۆش بن بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون ، موسوڵمانانیش سەرزەنشتیان نەکردن.(وەرگێڕ)

ساوایه وێنەی هەموو ئەو چین‌و توێژانە بوو کە لەمەدینەو دەوروبەریدا دەژیان‌و لەدەوری پەیامبەر (ﷺ) کۆبووبوونەوە کە دووڕوو دڵڕاگیراوو باوەڕ لاوازیان تێدابوو کە قورئان بەم شێوەیە باسی لێوەدەکردن: "عەرەبە بیابان نشینەکان وتیان باوەڕمان هێناوە، بڵێ ئێوە باوەڕتان نەهێناوە بەڵکو بڵێن ملکەچ بووین،وە هێشتا باوەڕ نەچووەتە دڵەکانتانەوە، وە ئەگەر گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکەن هیچێك لەکردەوەکانتان (پاداشتەکانتان) کەم ناکاتەوە، خودا بەخشندەو بەبەزەییە، بڕواداران ڕاستەقینە ئەو کەسانەن کە بڕوایان بەخواو پەیامبەرەکەی هێناوە وگومان‌و دوودڵیان نەکردووەو بە سامان‌و گیانیان کۆشاون لە پێناوی خودادا، ئەوانە کەسانی ڕاستگۆن، ئەی موحەممەد پێیان بڵێ ئایا ئێوە خوا فێری ئاینەکەی دەکەن لەکاتێکدا کە ئەو دەزانێ چی هەیە لە ئاسمانەکان‌و زەویداو بەهەموو شتێك زانایە. ئێوە منەتی موسوڵمان بوون بەسەر مندا مەکەن بەڵکو خوا منەتتان بەسەردا دەکات کە ڕێگای باوەڕداری پێ نیشان داون و خستنیە سەر ڕێگەی بڕواداری ئەگەر ڕاستگۆبن" حجرات ١٤-١٧.

هەرکەسێك لەم ئایەتە پیرۆزانە ورد بێتەوە بە دڵنیاییەوە دەزانێت کە لەناو ئەو زۆرینەیەی ئاماژەمان پێدا ئەو کۆمەڵە هەڵبژاردە ناوازەی تێدابوو لەیارانی پەیامبەر کەلەژێر پەرچەمی پەیامبەردا دەڕۆیشتن‌و بەخوێن‌و سامانیان بەرگریان لە ئیسلام دەکردو بەشداری پەیامبەریان دەکرد لە بنیاتنانی سەروەری ئیسلام‌و بەرگری لەو مەترسییانەی ڕووی تێدەکرد.

ئەوان ئەو گەورە یارانەی پەیامبەر بوون لە کۆچکردوان‌و پشتیوانان کەلەخۆشی‌و ناخۆشیدا لەگەڵیدا بوون‌و وەکو سێبەر لە پشتیەوە بوون‌و بەجێیان نەدەهێشت بۆ ئەوەی ببێتە پێشەنگێك بۆیان لە ژیانیانداو

بیشیپارێزن له دوژمنانو لەوانەی لەبۆسەدا بوون بۆ ئیسلام، قورئانیش وێنەیەکی گەشو پرشنگداری بۆ ئەم کۆمەڵە ناوازە هەڵبژاردەیە لە ئومەتی موحەممەد (ﷺ) کێشاوە کە هەر وشەیەکی پاکیو گەورەیی‌و بەرزی ئەو کۆمەڵگەیەو دڵسۆزی‌و وەفاداری‌و گیانفیدایی‌و لەخۆبوردەیی ئەو یارانە دەگەیەنێت بۆ ئیسلامو بەرگری لە پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ). باپێکەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە بخوێنێتەوە: "موحەممەد نێردراوی خوایەو ئەوانەی لەگەڵیدان توندوتیژن بەرامبەر بێباوەڕانو لەنێوان خۆیاندا بەبەزەیین، دەیانبینی بە بەردەوامی لە کڕنوشو سوژدە بردندان و داوای بەهرەو ڕەزامەندی خوا دەکەن، نیشانەیان بەناوچەوانیانەوە دیارە لەبەر زۆری سوژدەبردنیان، ئەوە نموونەیانە لە تەوراتدا (لەتەوراتدا وا باس کراون) لە ئینجیلیشدا نموونەیان وەکو تۆوێك وایە سەوز بوو‌بێت (چەکەرەی کردبێت)و قایم بووبێتو لەسەر قەدو لاسکی خۆی وەستا بێتو سەرنجی جوتیاران ڕاکێشێ بەلای خۆیدا، بۆ ئەوەی دڵی بێبڕواکانی پێ پەستو ناڕەحەت ببێت، خوا پەیمانی داوە بەوانەی بڕوادارو چاکەکارن بیانبەخشێتو پاداشتی زۆر گەورەیان بداتەوە"(الفتح: ٢٩ )[1]

---

[1] (مُحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَاناً سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً) (الفتح : ٢٩ )

بۆ زانینی پلەوپایەو ڕۆڵو ڕێزی یارانی پێغەمبەر ئایەتی زۆر هەن کە پێویستە باس بکرێنو لێك بدرێنەوە چونکە دەلالەتگەلێکی زۆریان هەیەو ئایەتی موحکەمن هەروەها پێویستە فەرمودەکانیش باس بکرێن بۆ ئەوەی وێنەیەکی پتەو دەربارەی ئەو سەردەمە بکێشرێت بۆ

پیا هەڵدانێکی تر هەیە بۆ ئەو سەردەمە پرشنگدارەو یارانی پەیامبەر (ﷺ) ئیمامی عەلی باسی دەکات وا لێرەدا دەیهێنینەوە: "یارانی پەیامبەرم بینی درودی خوای لەسەر بێت هیچ کەسێك (لە ئێوە) نابینم لەوان بچێت، ڕۆژیان لێدەبوویەوە سەرو قژ تێکچوو لەبەرئەوەی شەوەکەیان لە نوێژو پەرستشدا بردبووە سەر، جارێ بەنێوچەوانو جارێك بەڕوومەتیان، دەتوت لەسەر پشکۆی ئاگرن لەترسی گەڕانەوەیان بۆلای خوا، نێوچەوانیان وەکو ئەژنۆی حوشتری لێهاتبوو لەزۆری سوژدەبردن، ئەگەر یادی خوا بکرایە ئەوەندە فرمێسك بەچاوەکانیاندا دەهات تا سەرسنگیان تەڕ دەبوو، پشتیان چەمایویەوە وەکو چەمانەوەی دار لەڕۆژی ڕەشەبادا (لەبەر زۆری کڕنوشو سوژدە بردن) لەترسی سزاو بە ئومێدی پاداشت[1]

با جارێکی تر گوێ لە ئیمامی عەلی بگرین کە بەیارانی پەیامبەردا هەڵدەداو باسی باوەڕە ڕەهاو بێ سنوورەکەیان دەکات بە پەیامبەرو پەیامەکەی: "لەگەڵ پەیامبەردا بووین درودی خوای لێبێت باوكو کوڕو براو خۆمانمان دەکوشت، بەوە باوەڕو ملکەچیمانو سوریمان لەسەر بەردەوامیو ئارامیمان لەسەر سەختی ئازارو کۆششمان بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن زیاتر دەبوو، وادەبوو یەکێك لە ئێمەو یەکێك لە بێباوەڕان زۆرانبازییان

---

خوێنەر.بەڵام ئەوەی کە شیعە دەیکەن لە باسی هاوەڵانی پێغەمبەردا(د.خ) ئەوەیە کە دەچن هەموو ئەو ئایەتانەی ڕاستەوخۆ باسی هاوەڵانی پێغەمبەر دەکەن و دەلالەتەکانیان یکلاکەرەوەیە پشت گوێ دەخەن و هەندێك ئایەت دێننەوە کە هیچ بەڵگەیەکیان تێدا نییە لە سەر سەرزەنشتیان وەئەگەر هەشبێت ئایەتەکانی دوای خۆیان هەر لە هەمان سورەتدا لێخۆشبوونی خوایان پێ ڕادەگەیەنێ کەچی ئەمان دەستیا پێوە دەگرن بۆ مەحکوم کردنیان.(وەرگێڕ)

[1] نهج البلاغە ج١ ص١٩.

دەکرد وەکو دوویەران و بەدوای هەلێکدا دەگەڕان کامیان بادەی مەرگ بە بەرامبەرەکەی بنۆشێت.

جارێك سەرکەوتن بۆ ئێمە دەبوو جارێك بۆ دوژمنەکەمان،کاتێك خوا ڕاستگۆیی لە ئێمەوە بینی شکستی بۆ دوژمنانو سەرکەوتنی بۆ ئێمە نارد تاوەکو ئیسلام جێگیر بوو و پەرەی سەند، سوێند بێت ئەوەی ئێوە دەیکەن ئێمە بمانکردایە یەك کۆڵەکەی ئاین بەرز نەدەبوویەوەو یەك چڵی باوەڕ سەوز نەدەبوو، سوێند بەخوا ئەم ئیشەتان دەبێتە هۆی خوێن ڕێژیو پەشیمانی بەدواوە دەبێت"[1]

لێرەدا دەبێ ئەم پرسیارە بکەین: ئایا هاوەڵاتێکی ئاوها کە خوا ئەم ستایشو پیاهەڵدانە گەورانەیانە دەکاتو ئیمامی عەلی وا بە گەورەیی باسیان دەکات سەرپێچی دەقێکی خواییان کرد لە مەسەلەیەکدا کە

---

[1] نهج البلاغه ج١ ص١٠٣.

ئەم دوو قسەیەی ئیمامی عەلی باشترین شایەتین بۆ یارانی پێغەمبەر (ﷺ) ئیتر نازانم دوای شایەتی قورئانو پێغەمبەرو ئیمامی عەلی شیعە شایەتی کێیان دەوێت بۆ ئەوەی دان بە دڵسۆزیو پلەو پایەی هاوەڵاتی پێغەمبەردا بنێن. شایانی باسیشە ئیمامی عەلی لە کاتی فەرمانڕەوایی خۆیدا ئەم قسانەی کردووە ، واتە هیچ ترسێك لە ئارادا نییە وای لێبکات پێچەوانەی ڕاستی بڵێت یان ڕاستی بشارێتەوە، هەروەها لە کاتێکدا وتوویەتی کە نارەحەت دەبێت بە دەست دەوروبەرەکەیەوە لە ئەنجامی ئەو هەموو ئازارەی کە پێی دەگەیەنن و ئەوە وای لێدەکات سۆزی بۆ ئەو ڕۆژگارانە بجوڵێت کە لە گەڵ هاوەڵاندا لە خزمەتی پێغەمبەردابووەو بەو شێوەیە دەست بکات بە باس کر دنیان. واتە ئەم ستایشانەی ئیمامی عەلی بۆ یاران سێ دەلالەتیان هەیە ، یەکەم گەورەیی و دڵسۆزی و دینداری ئەو هاوەڵانە ، دووەم ناپابەندی دەوروبەرەکی و بێ گوێیی کردنی ئیمامی عەلی و بێتاقەتی ئەو لەدەست ئەوانەی بەناو پشتیوان لایەنگری بوون و سێهەم ناڕاستی ئەو قسانەی کە دەڵێت ناتەبایی هەبووە لە نێوان هاوەڵان و خزمانی پێغەمبەردا(وەرگێڕ)

دەستورێکە لەلایەن خواوە دابەزیوە ؟ ئەوان کە پارێزەرانی شەریعەتی خوایی‌و جێبەجێکەری بوون‌و لە پێناویدا قوربانییاندا بەهەموو هەرزان‌و گرانێك ئایا سەرپێچی ئەو دەستوورە خواییە دەکەن بە تایبەت ئەگەر ئەو بڕیارە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەرژەوەندی موسوڵمانان‌و دوارۆژی کارەکەیان‌و سەقامگیر کردنی ئەو بنەمایانە بێت کە پەیامبەر (ﷺ) نێرابوو بۆ سەقامگیر کردنیان.

دوای هەموو ئەمانە، ئێمە دەمانەوێت پەیامی ڕاستکردنەوە لەم کتێبەدا دوور لە ئارەزوو و دەمارگیری‌و نەریتی باوو باپیران بەجێ بێنین وئاڕاستەی چینی ڕۆشنبیرو خاوەنی بیرکردنەوەی ئازادی بکەین لەرۆڵەکانی شیعە، ئەوانەی کە ئومێدی ئەوەیان لێدەکەین بەدوای ڕاستکردنەوەدا بڕۆن، بۆیە پێیانی دەڵێم بچمە سەر خاڵی دووەم ئەویش وتەکانی ئیمامی عەلییە دەربارەی جێنشینی بۆ ئەوەی بەڕوونی ببینین چۆن ئیمام بەڕاشکاوی دەیگوت هیچ دەقێك لەلایەن خواوە نییە لەسەر جێنشینی.

## ٢- وتەکانی ئیمامی عەلی دەربارەی جێنشینی:

ئیمامی عەلی دەڵێت: "لێم گەڕێن‌و بڕۆن بەدوای کەسێکی تردا (بۆ جێنشینی)، ئێمە ڕوو لە کارێکی (باروودۆخێکی) جۆراوجۆرو ڕەنگاو ڕەنگین، ئەوەش بزانن کە ئەگەر وەڵامتان بدەمەوە (بەوەرگرتنی دەسەڵات) بەو ئاقارەتاندا دەبەم کە خۆم دەیزانم‌و گوێ لە قسەی قسەکەران‌و لۆمەی لۆمەکەران ناگرم، وە ئەگەر لێشم گەڕێن ئەوا من وەکو هەریەکێك لە ئێوەم، بەڵکو لەوانەیە لە ئێوە گوێڕایەڵترو هەڵکەوتەترم بۆ ئەو کەسەی کاری خۆتانی

دەدەنە دەست (دەیکەنە خەلیفەی مسوڵمانان)، وەمن وەزیریم باشترە بۆ ئێوە لەوەی کە پێشەوا (ئەمیر)بم"[1]

با جارێکی تر گوێی لێبگرین کە قسە لەگەڵ ئەهلی ڕاوێژدا دەکات: "باش دەزانن کە من لە کەسانی تر شیاوترم بۆ ئەم پۆستە، وە سوێند بەخوا بۆ ئەوەی کاری مسوڵمانان بەبێ کێشە بەڕێوەبچێت من ملکەچ دەبم با تەنها ستەمەکە لەسەر من بکەوێت بە نیازی پاداشتو چاکەی ئەوە لەلای خواوە"[2]

ئەوەتا ئیمامی عەلی لە شوێنێکی تردا وەڵامی یەکێك لەو هاوەڵانەی دەداتەوە کە لێی پرسی: چۆن خەڵکی ئەم کارەیان لە ئێوە دوورخستەوە لە کاتێکدا کە ئێوە لەبەرترین کەسن بۆی؟

"پرسیارت کرد بزانە: بێبەشکردنی ئێمە لەم پلەو پایەیە لەکاتێکدا کە ئێمە خاوەنی بەرزترین ڕەچەڵەکینو نزیکترین کەسین لە پەیامبەرەوە شتێك بوو کۆمەڵێكەبۆ خۆیانیان ویستو کۆمەڵێکی تریش بێنیاز بوون لێیو بڕیار بۆ خوایەو گەڕانەوە بۆلای ئەوە لەدوا ڕۆژدا"[3]

با پێکەوە چەند دەقێکی تر بخوێنینەوە لەوتەکانی ئیمامی عەلی کە تێیدا بەڕوونیو ڕاشکاوی بێنیازی خۆی لە جێنشینی دەردەخاو هەوڵیدەدا لەخۆی دووری بخاتەوە بەڵام دەشیزانی کە ئەو شیاوترین کەسە بۆ ئەو پۆستە، وە باسی ئەوەی نەکردووە کە دەقێك لەلایەن خواوە یان تەشریعێکی خوایی

[1] نهج البلاغة ج١ ص١٨٢.

[2] نهج البلاغة ج١ ص١٢٦

[3] نهج البلاغة ج٢ ص٦٤

لەسەر جێنشینی هەیە، دەڵێت: "سوێند بەخوا هیچ حەزێکم لە جێنشینی نەبووە و هیچ پێویستییەکم پێی نەبوو بەڵام ئێوە داواتان لێکردمو زۆرتان لێکردم بیکەم، کاتێکیش کەوتە دەستم سەیری کتێبی خوام کردو ئەوەی بۆی داناوینو فەرمانی پێداوین فەرمانڕەوایی پێ بکەین پەیڕەویم کردو ئەوەشی پەیامبەر کردوویەتی شوێنی کەوتم"[1]

لە شوێنێکی تردا دەڵێت[2]:

هەروەکو چۆن حوشتری کۆرپەلەبەر بۆ لای کۆرپەلەکەی دەچێت ئاوها ڕووتان تێکردم،دەتانوت دەستت بێنە با بەیعەتت بدەینێ، من مشتم دەنوقاند ئێوە دەتانکردەوە، دەستم لەناو دەستتان دەردەهێنا ئێوە بەزۆر ڕاتان دەکێشایەوە (بۆ ئەوەی بەیعەتم بدەنێ).

جارێکی تر ئیمام لە نامەیەکدا کە ناردویەتی بۆ مالیکی ئەشتەر دەڵێت:

"سوێند بەخوا نە بەدڵمدا وە نەبەخەیاڵمدا نەهاتووە کە عەرەب ئەم کارە لە کەسوکاری پەیامبەر هەڵکەنن و لەمنی وەرگێڕن دوای خۆیو هیچ شتێك سەرسامی نەکردم کۆبوونەوەی خەڵکی نەبێت لەسەر ئەبوبەکر بۆ ئەوەی پەیمانی بدەنێ، منیش دەستم گرتەوە"[3]

---

[1] نهج البلاغة ج٢ ص١٨٤.

[2] نهج البلاغة ج٢ ص٢٠.

[3] نهج البلاغة ج٣ ص١١٩.

لەو باوەڕەدانیم ئیمامی عەلی دوای ئەوەی کە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئیمامی ئەبو بەکرو ئیمامی عومەری بینی کە سەردەمی پتەو کردنی بنەماکانی ئاین و بڵاوکردنەوەی ئیسلام و فراوانکردنی ڕووبەری دەوڵەتی ئیسلامی وبەهێزی و یەکپارچەیی موسوڵمانان و سەقامگیربوونی دەسەڵاتی ئیسلامی و فەرمانڕەوای دادپەروەرانەی ئەو زاتانە و ژیانی زاهیدانەی خۆیان دوور ڕاگرتنی کەس و

کاریـیان لە دەست خستنە ناو کاروباری دەوڵەت و بێبەش کردنیان لە هەموو دەسکەوتێك کە لە ڕێی دەسەڵاتەوە دەستەبەر دەکرێت خۆی یا کەسێکی تری لەوان بە شیاوتر زانیبێت بۆ فەرمانڕەوایی و چاوەڕوان بوو بێت کەسێکی تر بتوانێت لەوە زیاتر پێشکەش بکات کە ئەوان کردیان.

ئەگەر کەسێك پێش گەیشتنە دەسەڵاتی هەریەك لەو خەلیفانە نەیزانیبایە کامیان لێهاتووترن بۆ فەرملنڕەوایی مافی خۆی بوو بەڵام دوای ئەوەی کە هەریەکەیان فەرمانڕەوایی کرد ئیتر جێگە بۆ ئەوە نامێنێتەوە لە ڕووی تیۆریەوە بەراورد لە نێوانیاندا بکەین و بڵێین لەوانەیە ئەمیان لەوی تریان لێهاتووتربێت لەبەر ئەوەی کە زانستی شەرعی زۆرتر دەزانێت یا لە پێغەمبەرەوە نزیکترە یا لە شەڕدا ئازاترە بەڵکو دەبێ لە ڕوانگەی حوکمەکەیانە هەڵسەنگێنرێن و حوکم لەسەر سەردەمەکەیان بدرێت نەك لە سەر کەسەکەیان ئێستە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە هەڵسەنگاندنمان بۆ خەلیفەکانی ئیسلام لە سەر بنەمای زانستی بێت نەك سۆزداری لەوانگەی ئەو دەسکەوتانەوە بێت کە بە دەستیان هێنا بۆ ئیسلام و موسوڵمانان و لە سەر بنەماکانی هەڵسەنگاندنی پیاوانی دەوڵت بێت نەك پیاوانی زانست یان عیرفان و زوهدو تصوف . ئەگەر خەڵکی جاران لە بەر نەبوونی ئەم زانستە مەنهەجییانەی کە ئەمڕۆ هەیەو لە بەر نەبوونی پێوەری زانستی پیاوی دەوڵەتیان بە پێوەری پیاوی زانست یا بە پێوەری پیاوی ئیرشاد یا بە پێوەری پیاوی جەنگ پێوابێ ، ئەمڕۆ چیتر نابێ ئەوە دووبارە بێتەوە . ئەگەر جاران خەڵکی لە خەلیفەیەکی وەکو حەزرەتی عوسمان لە بەر ئەوەی یەکێك لە هاوولاتیانی دوور خستۆتەوە یا لەبەر ئەوەی، کە یەك پلیکانە سەرکەوتووە بەسەر ئەوەی پێغەمبەردا لە کاتی خوتبە خوێندندا یا لەبەر ئەوەی کە لە سەفەری حەجدا نوێژەکانی کورت نەکردۆتەوە ، یا لەبەر ئەوەی کە ماڵەکەی خۆی بەخشیوە بەسەر خزمانیدا هەڵسابێتن ، ئەمڕۆ دەبێ ئەو هاەکێشەیە ڕاست بکرێتەوەو خەلیفە لەسەر بنەمای زانستی سیاسی و توانای جێبەجێ کردنی ئەو پرۆگرامەی کە پێشکەشی کردبوو پێش هەڵبژاردنی هەڵبسەنگێنرێت باری ئابووری وڵات و هاولاتیان و باری ئاسایش و ئازادیـە کەسایەتییەکان و پرۆژە خزمەتگوزارییەکان و پێشڕەوی زانستی و دابین کردنی مافەکانی تاکەکانی کۆمەڵ و ڕاگرتنی سەر بەخۆیی وڵات و پێش خستنی وڵات و هتد ئەگەر بێتو ئەو ڕەخنانەی لە حەزرەتی عوسمان دەگیراو بوو بە هۆی ئەو ئاژاوە گەورەیە ئەمڕۆ بکرێنە بنەما بۆ قبوڵ کردن یا ڕەت کردنەوەی هەر حوکمێك یەك حکومەت

دوای ئەوەی ئەم دەستەواژە ڕوونانەمان خوێندەوە لەبیروڕای ئیمامی عەلی لە پێشتربوونی بۆ جێنشینی دوای پەیامبەر (ﷺ) پێویستە وتەکانی بخوێنینەوە دەربارەی ڕەوایەتی خەلیفەکانی پێش خۆی بۆ ئەوەی بۆچوون‌و بیروڕای ئیمامی عەلی بزانین دەربارەی ڕاستی‌و ڕەوایی ئەو پەیمانەی پێیان دراوە، دەفەرموێت: "ئەم مەسەلەیە پەیمانێکە پیاچوونەوەی تێدا ناکرێت‌و ڕێگە بەهەڵبژاردنی تر نادرێت، ئەوەی پابەند نەبێت پێوەی یاخییەو ئەوەشی خاوەخاوی تێدا بکات ڕووپامایی کەرە"[1]

لەجێگەیەکی تردا دەڵێت: "ئەگەر ئێوە لەگوێڕایەڵی دەرچوون‌و سنووری خواتان بە ئاکاری نەفامی بەزاند، ئەوا خوا چاکەی خۆی لەگەڵ سەرجەمی ئەم ئوممەتەدا کردووە بەو خۆشەویستییەی کە لەسایەیدا دێن‌و دەچن‌و

---

دەمێنێ خەڵکی لێی ڕازی بێت یان پەساند بکرێت؟ وە ئەگەر ئەو بنەمایانە نیشانی میللەتان بدرێن و وەکو بنەمایەکی ئیسلامی پێشکەشی میللەتان بکرێت بزانە چۆن دەبینە گاڵتە جاڕی خەڵکی ! . لە بەرامبەر ئەوەشدا ئەگەر بێتو هەڵوێستی حەزرەتی عوسمان لە ئاژاوە گێڕان نیشانی خەڵکی بدرێت بزانە چ سەدایەکی دەبێ لە ناو میللەتانداو دەبێتە چ شکۆمەندییەك بۆ ئیسلام و چ دەرسێك بۆ مرۆڤایەتی! لێرەدا هەڵوێستی ئیمامی عوسمان گوزارش لە ڕۆحی ئیسلام دەدات و هەڵوێستی شارستانییانەی ئیسلام دەردەخات و هەڵوێستی ئاژاوەگێڕان گوزارش لە تێنەگەیشتن و مامەڵەی ناشارستانی خۆیان هەروەکو چۆن هەڵوێستی ئیمامی عەلی ڕۆحی ئیسلام و هەڵوێستی شارستانییانەی و هەڵوێستی خەواریجەکان گوزارش لە تێنەگەیشتن لە ڕۆحی ئیسلام و مامەڵەی ناشارستانی خۆیان دەردەخات. بە هەر حاڵ ئەم بابەتە لێکۆڵینەوەی زیاتری دەوێت و قسەی زۆر زیاتر هەڵدەگرێت ئێرە جێگەی نییە و هیوادارین بتوانین لە کتێبێکی سەربەخۆدا بە درێژی باسی بکەین و ئاسۆیەکی نوێ بۆ بیرکردنەوەی لۆژیکی بکەینەوەو موسوڵمانان لەو عەقڵییەتە ساویلکەیە لە هەڵسەنگاندنی مێژووی ئیسلامی و خیلافەتی ئیسلامی ڕزگار بکەین.(وەرگێڕ)

[1] نهج البلاغة ج٣ ص٨.

دەحەوێنەوە، ئەوە نیعمەتێکە هیچ کەسێك نرخەکەی نازانێت چونکە لەهەموو گرانێك گرانترەو لەهەموو گرنگێك گرنگترە، وە بزانن کە ئێوە دوای کۆچکردن بوونەوە بیابان نشینو دوای برایەتی پارچە چارپەبوون، لە ئیسلام تەنها ناوەکەی دەناسنو لە باوەڕ تەنها وێنەکەی"[1]

با جارێکی تر گوێبیستی ئیمامی عەلی بین کە ڕەوایی خیلافەتو ئیامەت دوویات دەکاتەوە دوای ئەوەی کە مسولمانان یەکدەنگییەکی بچوککراوەیان لەسەر کرد کە پێویست دەکات لەسەر کۆی مسولمانانو ئەو زۆرینەیەی ئامادەی هەلبژاردنەکە نەبوون گوێڕایەلی خەلیفەی هەلبژێردراو بکەن:

"بەگیانی خۆم ئەگەر ئیمامەت گرێنەدرێت (دانەمەزرێت) تا هەموو خەلکی ئامادە دەبن ئەوە شتێکی ئەستەمەو هیچ ڕێگایەك بۆ ئەنجامدانی نییە، دوای ئەوە نە ئەوەی ئامادەی هەلبژاردنەکە بووە بۆی هەیە پاشگەز ببێتەوە نە ئەوەشی لەوێ نەبووە بۆی هەیە کەسی تر هەلبژێرێت"[2]

٣- پەیمانی ئیمامی عەلی لەگەل خەلیفەکانو چەسپاندنی ڕەوایی خیلافەتەکەیان:

بەدرێژی باسی ئەو دەقانەمان کرد کە لە ئیمامی عەلییەوە گێڕدراوەتەوە لەسەر خیلافەتو نەهاتنی یەك وشە لەدەمیەوە دەربارەی بوونی دەقێکی خوایی لەسەر ئەو مەسەلەیە، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە بچینە سەر باسێکی تر ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر خیلافەت بەدەقی ئاسمانی بوایەو ئەو دەقانەش دەرحەقی عەلی بوونیان هەبوایە، ئایا لە توانای ئیمامی عەلیدا

---

[1] نهج البلاغة ج٣ ص١٥٤.

[2] نهج البلاغة ج٢ ص٨٦

هەبوو چاوپۆشی لەو دەقانە بکاتو پەیمان بدات بە خەلیفەکانی ترو ملکەچیان بێت لەمەسەلەیەکدا کە مافی خۆیان نییە؟

زانایانی شیعە لەو کتێبە زۆرەی نووسیویانە دەربارەی پەیمانی عەلی بە خەلیفەکان دوو پاساویان هێناوەتەوە:

هەندێکیان دەڵێن عەلی لەترسی ئەوەی ئیسلام تیا نەچێتو ناکۆکیو دووبەرەکی نەکەوێتە نێوان مسوڵمانانەوە دەستی لە مافی خۆی هەڵگرتو ملکەچی ئەو خەلیفانە بوو کە مافەکەیان زەوت کردبوو.

پاساوی دووەمیش ئەوەیە کە عەلی لە ترسی گیانی خۆی پەیمانی بەو خەلیفانەداو تەقییەی بەکارهێنا وەکو لەمەودوا لەچەندین شوێندا باسی دەکەین.

ئەوانەی پاساو بە ترسی ئیمامی عەلی لە تیاچوونی ئیسلام دێننەوە کە گوایە خەڵکی ئەو کاتە نۆ مسوڵمان بوونو ئیسلام هێزی پەیدانەکردبوو وبەتەواوی جێگیر نەبوو بوو بەیعەتی عەلی بە عوسمان هەڵیدەوەشێنێتەوە چونکە لەسەردەمێکدا بوو کە دەوڵەتی ئیسلامی زۆر بەهێز بوو،لە ڕۆژهەڵاتەوە تا بوخاراو لە ڕۆژئاواوە تا باکوری ئەفریقا باڵی کێشابوو وەدەوڵەتی خیلافەت فەرمانڕەوایی گەورەترین بەشی زەوی دەکرد لەو سەردەمەدا.

پاشان سەیرترینو گرنگترین شت لە مەسەلەی خیلافەتدا کە هیچ کەسێك لەوانەی قسەیان تێدا کردووە لە زانایانی شیعەو تاقمە ئیسلامییەکانی تریش باسیان نەکردووە ئەوەیە کە مەسەلەی خیلافەتیان بەشێوەیەکی سەربەخۆ باس نەکردووە بەڵکو بەستویانەتەوە بە ئیمامی عەلیو خەلیفەکانی پێش ئەوەوە، بەڕاستی ئەم لادانو شێواندنەی خیلافەت سەرسامو سەرگەردانی

کردووم چونکە ئەگەر بهاتبایە ئم مەسەلەیە بەسەربەخۆیی‌و دوور لەکەسێتی عەلی لێبکۆڵرایەتەوە ڕووبەڕووی بەربەستێکی گەورە دەبوویەوە کەهەموو ئەو بنەمایانەی دەڕووخاند کە لەسەردەمی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوعدا ڕوویدا.

ئەگەر بهاتبایە مەسەلەی خیلافەت بە شێوەیەکی سەربەخۆ لەبیروباوەڕی ئیسلامیدا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرایە بەبێ ئاوڕدانەوە لەو کەسەی کە دەیگرێتە دەست، مسوڵمانان ڕوو بەڕووی ئەو هەموو سەرگەردانی‌و ونبوونە نەدەبوون لە مەسەلەی خیلافەت‌و دەرئەنجامەکانیدا، ئەمەش بەردی بناغەیە لەو شتەی کە دەمەوێت بیگەمێ، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر خیلافەت یان ئیمامەت دوای پەیامبەر بەدەقێکی خوایی بوایەو فەرمانی خوایی لەسەر دابەزیبایە ئیتر چ مەبەست عەلی بووبێت یان کەسێکی تر هەموو ئەو قسانەی زانایانی شیعە دەیکەن وەکو پاساوێك بۆ ملکەچ بوونی عەلی بۆ خەلیفەکانی پێش خۆی‌و بەیعەت پێدانیان پوچەڵ دەبێتەوەو پەرش وبڵاودەبێتەوە، چونکە ئەگەر خیلافەت بەدەقی خوایی‌و فەرمانی خوایی بێت، هیچ کەسێك ناتوانێت دژی بوەستێت یان سەرپێچی بکات با هەر پلەو پایەیەکی هەبێت یان هەر پاساوو بیانوویەك بێنێتەوەو لەتوانای عەلی‌و کەسی تریشدا نەبوو دەقێکی خوایی کە لەرێی نیگاوە هاتووە بوەستێنێت ئەگەر موحەممەد (ﷺ) کە نێردراوی خوایە نەتوانێت‌و بۆی نەبێت سستی‌و خاوی بکات لە گەیاندنی پەیامە خواییەکە، یان بیشارێتەوە وەکو ئەم ئایەتە دەریدەخات: "ئەی پەیامبەر ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت دابەزیوە

بیگەیەنە بە خەڵکی، ئەگەر وانەکەیت ئەوا پەیامەکەت نەگەیاندووە، خواش دەتپارێزێت لەخەڵکی"[1]

چۆن کەسانی تر کە لەخوار پلەی ئەوەوەن دەتوانن چاو لە ئاستی دەقی خوایی داخەن (پشت گوێی بخەن) یان بیشارنەوە؟ چ فەرمانێکی خوایی لەم ئایەتانەی خوارەوە ڕوونتر ڕاشکاوترە کە دەربارەی گەیاندنی پەیامو نیگای خوایی دابەزیوە:

"وە ئەگەر باوەڕتان بە پەیامبەر نەکردو بەدرۆتان خستەوە ئەوا گەلانی پێش ئێوەش ئەو کارەیان کردووەو پەیامبەریش جگە لەگەیاندنو ڕوونکردنەوە هیچی تری لەسەر نییە"[2]

"ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا ئەوە ئێمە تۆمان بە پارێزەر نەناردووە بۆ سەریان، تۆ تەنها ڕاگەیاندنت لەسەرە"[3]

"لەوانەیە بتەوێت دەست هەڵگری لە گەیاندنی هەندێك لەوانەی بۆت دابەزیونو دڵتەنگ بی پێی لەبەر ئەوەی کە دەڵێن بۆچی گەنجینەو خەزێنەی بۆ نانێردرێتە خوارەوە یان فریشتەی لەگەڵدا نەهاتووە، تۆ تەنها ئاگادارکەرەوەی‌و خوا لەسەر هەموو شتێك چاودێرو سەرپەرشتیکارە"هود .١٢

بەستنی خیلافەت بە خەلیفەوەو جیانەکردنەوەیان لەیەکتر ڕێگەی خۆشکرد بۆ ڕاوییەکانی شیعە (وەکو وتمان) ئەوەی بیانەوێت بینووسن لەکاتی

---

[1] (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ) (المائدة : ٦٧ ).

[2] وَإِن تُكَذِّبُوا فَقَدْ كَذَّبَ أُمَمٌ مِّن قَبْلِكُمْ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ) (العنكبوت : ١٨ ).

[3] (فَإِنْ أَعْرَضُوا فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظاً إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا الْبَلَاغُ وَإِنَّا إِذَا أَذَقْنَا الْإِنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ الْإِنسَانَ كَفُورٌ) (الشورى : ٤٨ ).

ململانێی نێوان شیعەو تەشەییوعدا، ئیمامی عەلی شەریعەت دانەر نەبووەو لاقی ئەوەشی لێنەدەدا، وە لەبەرامبەر دەقدا هیچ جۆرە کۆششێك (جیهاد) ناکرێت تاوەکو لەبەرامبەر دەقی خیلافەتدا کۆشش بکرێت یان بێدەنگی لەئاستیدا بنوێنرێت یان هەڵوەشێنرێتەوە.

جا ئەگەر خیلافەت مەسەلەیەکی ئاسمانیو فەرمانێکی خوایی بێت ئەوە مافێکی گشتی موسوڵمانانو دەستوورێکی ئاسمانییە بۆیان بەبێ ئاوڕدانەوە لەو کەسەی کە دەبێت بە خەلیفە.

سەرەڕای ئەو باسە درێژەی دەربارەی خیلافەت کردمان وە لەگەڵ ئەوەی کە سەلماندمان کە ئەگەر ئەم مەسەلەیە بەدەقی خوایی بوایە کەس نەیدەتوانی هەرچەند پلەو پایەی هەبوایە پێچەوانەی ئەوە کاربکات یان پشت گوێی بخات یان نکۆڵی لێبکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاقمێکی زۆر لەزانایانی مەزهەبی شیعە ئەم ڕاستییەیان بەتەواوی پشتگوێ خستووەو بەیعەتی ئیمامی عەلییان بە خەلیفەکانی پێش خۆی بە تەقییە (خۆپاراستن) یا ترس یا زۆرلێکردن لێکداوەتەوە.

لێرەدا ڕۆڵی ئەو کەسانە دێت کەویستویانە ئیمامی عەلی تێکشکێننو کەسایەتییەکەی بڕوشێننو ناڕاستەوخۆ توانجی تێبگرن کە ئەنجامەکەشی ڕووخاندنی سەردەمی پەیامبەرو یارانێتی چونکە تاقەڕێگەیەك بۆ دەرخستنی سەردەمی پەیامبەرو گەورەیارانی بەو وێنەو ڕواڵەتە ڕەشو تاریکە بەوە دەبێت کە ئەو کۆمەڵگەیە تۆمەتبار بکرێت بەوەی کە لە فەرمانە ڕوونەکانی خوا دەرچوونو سەرپێچی بکەن، ئەویش بە نیشاندانی خیلافەت بەو شێوەیەی کە عەلی دەقی خوایی (قورئانی) لەسەرەو یارانی پەیامبەر هەموو سەرپێچی ئەو دەقانەیان کردووە لەگەڵ ئەوەی کە زانیویانە

دەقی وا هەیە پەیامبەر پێی ڕاگەیاندوون،پاشان بە نیشاندانی وێنەیەك دەربارەی ئیمامی عەلی کەخاوەنی ئەو مافەیە لە شێوەی کەسێکی فێڵبازی خۆڕێکخەری ماستاوچیو ترسنۆك کە ماوەی بیستو پێنج ساڵ لەڕواڵەتدا لەگەڵ خەلیفەکانی پێش خۆیدا بووە وەکو ڕاوێژکارێکی متمانەپێکراوو هاوڕێیەکی گیانی بەگیانیو ڕۆچوو لە ستایش کردنیانداو بێژەری جوانترینو ڕازاوەترین قسە دەربارەیان لەکاتێکدا کە لەناخەوە باوەڕی بەو قسانە نەبووە وبەدڵ ئەو ئیشانەی نەکردووە تەنانەت ئوم کولسومی کچیشی بەناچاریو لەژێر فشاردا داوە بە عومەری کوڕی خەتتاب وە ناوی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانی لەمندالەکانی بەناپەدڵی ناوەو هەروەها....هتد.

ئەمە کورتەی ئەو شتانەیە کە هەندێك لەزاناو فەرمودەگێڕەوەکانی شیعە دەربارەی ئیمامی عەلی نووسیویانە چ ڕاستەوخۆ یان بە ناڕاستەوخۆ، وە نازانم هەڵوێستی ئەو کەسانە لەڕۆژی قیامەتدا چی دەبێت ئەگەر ئیمامی عەلی شکالیەتی خوای لێکردن؟ بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێم لەنێوان ئەو زۆرینەیەدا تاقمێکی زۆر هەن بەشداریان کرد لە گۆڕینی ڕێڕەوی بیری ئیسلامی یەکگرتوو بەرەو ناکۆکیو دووبەرەکییو بۆ لێدانی ئیسلامو موسڵمانان بە عەلیو عومەریشەوە، لەگەڵ ئەوەی کە بەڕواڵەت بە پارێزەری مەزهەبی شیعە دەردەکەوتن، بەڵام مەبەست ڕوخاندنی هەموو مەزهەبەکانو بگرە ئیسلامیش بوو، ئەوەتا تاوەکو سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی کە سەردەمی دیارنەمانی گەورەیە هیچ شوێنەوارێك نابینین بۆ بیرۆکەی زەوت کردنی خیلافەت لە ئیمامی عەلی یان ئەوەی کە خیلافەت مافێکی خوایی بێت درابێت بە عەلی بەڵام لێی زەوت کرابێت، یان یارانی پەیامبەر (ﷺ) بەشدارییان کردبێت لەو کارەدا..

بەو شێوەیە، وەکو وتمان، بیرۆکەی لە پێشێتیو شیاوتری عەلی بۆ خیلافەت گۆڕا بە خیلافەتی خواییو سەرپێچیکردنی دەقی خوایی، گومان لەوەدا نییە کە هاتنی فەلسەفەی یۆنانیو بیرۆکە فەلسەفییەکانی تر بۆ ناو هزری ئیسلامیی کەرۆڵێکی گەورەی بینی لەدامەزراندنی هەردوو قوتابخانەی موعتەزیلەو ئەشعەری لە پشتی ئەو ململانێیەوە بوو کە لە نێوان شیعەو تەشەیوعدا ڕوویداوە ودەرخستنی شیعە بەو شێوەیەی کە ئێستا لەسەرێتی.

گومانیشی تێدا نییە کە قسەکردن لەسەر خیلافەت بەو شێوەیەی کە زانایانی شیعە بە پشت ئەستووری ئەو ریوایەتانەی ڕاویە شیعەکان بۆیان گێڕاونەتەوە قسەی لێدەکەن هۆی گۆشەگیربوونی مەزهەبی شیعەو دوور کەوتنەوەیەتی لەمەزهەبەکانی ترو مانەوەی لە حاڵەتی گۆشەگیریو هێرشکردنو دوور لەهەموو خۆشەویستیو گونجانێك لەگەڵ تاقمە ئیسلامییەکانی تردا، وە بۆ هێشتنەوەی مەزهەب تایبەت بەو تایەفەیەو نەگونجان لەگەل تاقمەکانی تردا پێویستی دەکرد حاڵەتێك لە دوورکەوتنەوەی وا دروست بکرێت ڕێگە لە هەموو نزیکبوونەوەو نزیککخستنەوەیەك بگرێت لەگەڵ لایەنەکانی تردا، بۆیە شیعە ڕێگەی بریندارکردنو توانجگرتنو سەرزەنشتکردنی خەلیفەکانی گرتەبەر بە پشتبەستن بەو وتانەی ڕاوییەکانیان لەسەر زمانی ئیمامەکانیان دایاندەنا کە دوای خۆیان وێرانکارییەکی وای بەجی دەهێلا کە جگە لەخوا کەس نەیژمێرێت (لەبەر زۆری).

ئێمە لێرەدا بە لۆژیکی شیعە قسە لەگەل شیعەدا دەکەین بۆیە قسەکانی ئیمامی عەلی کە دەربارەی خەلیفە ڕاشیدەکان کردوویەتی دێنینەوە پاشان ئەو قسانەی دەربارەی خۆی وتوویەتیو ئینجا لەخۆمان دەپرسین، ئایا کەسێکی وەکو ئەم ئیمامە بە ناچاریو ناڕەزایی پەیمانی داوە بەوانەی پێش

خۆی‌و بەوکارەی فێڵی لە مسوڵمانان‌و خەلیفەکان کردووە، وە ئایا ئەو قسەیەکی وتووە کە باوەڕی پێی نییە یان کارێکی کردووە باوەڕی پێی نییە؟

ئایا بەڕاست شیعە کە ئەم قسەو کردەوانە دەدەنە پاڵ عەلی عەلییان خۆش دەوێت یان ئەم ڕێگەیەیان گرتەبەر بۆ ئەوەی مافی خۆیان بسەلمێنن بۆ دەسەلآت گرتنە دەست‌و پێکهێنانی دەوڵەت هەرچەند ئەو کارە لەسەر حیسابی عەلی‌و بەقوربانیدان بە ناوو پلەو پایەی گەورەیی عەلی تەواو بێت؟

**٤ـ قسەکانی ئیمامی عەلی دەربارەی خەلیفە ڕاشیدەکان:**

باگوێ لە ئیمامی عەلی بگرین کە باسی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب دەکات: "ئای بۆ ڕۆڵو لێهاتوویی عومەر، لارییەکانی ڕاستکردەوە، نەخۆشییەکانی چارەسەرکرد، بشێوی دواخست (خستەپشتی خۆی)و سوننەتی بەرپاکرد، بە جلی پاکەوە دونیای بەجێهێشت (بەپاکی مرد) وە بێ‌کەموکورتی، چاکییەکانی خیلافەتی بەرکەوت‌و پێشی خراپەکانی کەوت (بەری نەکەوت)، گوێڕایەڵی خوای کردو بەڕادەی شیاو بۆ خوا پارێزکاری‌و خواپەرستی کرد، ڕۆیشت‌و موسوڵمانانی لە دووڕیانێکدا بەجێهێشت کە نەگومڕا ڕێگە بدۆزێتەوە وە نە ئەوەی دۆزیویەتەوە دڵنیایە لێی"[١]

وە کاتێك کە عومەر پرسی پێکرد بۆ ڕۆیشتن بۆ شەڕی ڕۆم پێی وت: "ئەگەر تۆ بەخۆت بچی بۆ شەڕی دوژمن‌و بشکێی لەشەڕدا دالدەیەك بۆ موسوڵمانان نامێنێتەوە لەوپەڕی وڵاتەکەیانداو پەنایەك نامێنێت بۆی

---

[١] نهج البلاغة وتاری/ ٢٢٥

پەنا بردنی شیعە بۆ (دەق) لەبەرکەمی لایەنگرانی بووە ئەگینا ئێستا کە زۆرینەن لە عێراقدا باسی هەڵبژاردن دەکەن، واتە ئیمەتی دەق‌و مەبدەو نییە.

بگەڕێنەوە، لەبەرئەوە کەسێکی بە ئەزمونیان بۆ بنێرەو کەسانی دڵسۆزو ئازاو بەتوانای لەگەڵدا بنێرە، ئەگەر خوا سەری خستن ئەوە ئەو شتەیە کەویستووتە وە ئەگەر ئەوی تریشیان بوو (شکستیان خوارد) ئەوا دەبیتە داڵدەو پەنا بۆ مسوڵمانان"[1]

جارێکی تر خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب ڕاوێژ بە عەلی دەکات بۆ ڕۆیشتن بۆ شەڕی فارسەکان ئەویش ئامۆژگاری دەکات کە بەخۆی نەچێت بۆ ئەو شەڕەو پێی دەڵێت: "عەرەب ئەمڕۆکە هەرچەندە کەم بن بەڵام بە ئیسلامەوە زۆرن‌و بەیەکگرتن بەهێزو سەربەرزن، خۆت ببە بە جەمسەرو شەڕ بەعەرەب بکە، عەجەمەکان سبەینێ گەر لەشەڕدا بتبینن دەڵێن ئەمە ڕەگ و بنچینەی عەرەبە، ئەگەر بیبڕن دەحەسێنەوە، بۆیە زیاتر بەپەرۆش دەبن‌و هەوڵەکانیان زیاتر دەکەن بۆ کوشتنت، ئەوەیشی کە دەیڵێیت دەربارەی زۆری ژمارەیان ئێمە لەوەبەر بە ژمارە زۆری شەڕمان نەکردووە بەڵکو بەسەرخستن‌و یارمەتی خوا شەڕمان کردووە"[2]

لەگەڵ خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففانیشدا قسەدەکات‌و بە هاوەڵی نزیکی پەیامبەر ناوی دەبات‌و دەڵێت: "ئەو خەڵکەی لەدوامەوەن منیان ڕاسپاردووە قسەت لەگەڵدا بکەم، سوێند بەخوا نازانم چیت پێ بڵێم، شتێك نییە من بیزانم‌و تۆ نەیزانی، وە مەسەلەیەك نییە نەیزانی تاوەکو نیشانت بدەم، ئەوەی ئێمە دەیزانین تۆش دەیزانی.بۆ هیچ شتێك پێشت نەکەوتووین تاوەکو هەواڵت بدەینێ، بەجیاو بەبێ تۆ شتێك لەپەیامبەر فێرنەبووین تاوەکو پێتی ڕابگەیەنین، هەروەکو چۆن پەیامبەرمان بینیوەو لێمان بیستووە ئاوها

---

[1] نهج البلاغة ج٢/ ل٢٨.

[2] نهج البلاغة ج٢/ ل٣٠.

بینیوتەو لێت بیستووە، وە چۆن هاوەڵێتی پەیامبەرمان کردووە ئاوها کردووتە، وە نە کوڕی ئەبی قوحافەو نەکوڕی خەتتاب لەتۆ لەبەرترنین بۆ کردنی کاری ڕاستو ڕەواو تۆ بەخزمایەتی نزیکتری لە پەیامبەرەوەو ئەوەی دەستی تۆ کەوتووە لەخواستنی کچی پەیامبەر دەستی ئەوان نەکەوتووە، تۆ بیو خوا ئاگات لەخۆت بێت چونکە نە نابینای ڕێگات نیشان بدرێت، وە نەنەزانی فێر بکرێیت"[1]

جارێکی تر دەبینین ئیمامی عەلی لەگەڵ ئیبن عەباسدا دەربارەی عوسمان دەدوێتو دەڵێت: "ئەی ئیبن عەبباس، عوسمان دەیەوێت وەکو حوشترێکم لێبکات کە بەسەتڵ ئاودێری پێدەکرێت[2] دەمهێنێ و دەمبا، هەواڵی بۆ ناردم کە بڕۆم پاشان نادروویەتی کە بێمەوە، ئێستاش ئەوەتا ناردوویەتی کەبڕۆم، سوێند بەخوا ئەوەندە بەرگریم لێکردو پاکانەم بۆ کرد (لای نەیارانی) تا ترسم لێ نیشت کە گوناهبارم"[3]

لەنامەیەکیشدا کە دەینێرێت بۆ معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان هەڵوێستی خۆی لە خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان باس دەکات کە تێیدا دەڵێت: " باسی ئەوەت کردووە کە لەنێوان منو عوسماندا ڕوویداوە (هەڵوێستی من لەو شتەی بەسەر عوسماندا هات) لەمەیاندا مافی خۆتە وەڵام بدرێیتەوە لەبەر خزمایەتی تۆو عوسمان: کاممان زیاتر دوژمن بووینو ڕێگەمان بۆ بکوژانی خۆش کرد، ئەوەمان کە ویستی یارمەتی بدات بەڵام عوسمان ڕازی نەبوو

---

[1] نهج البلاغة ج٢، ص٤٨/ سەرنج بدە لێرەدا عەلی دان بەوەدا دەنێت کە هیچ شتێك نییە تایبەتمەندبێت بەوەوەو شتێك نییە پەیامبەر تەنها بەوی وتبێت.(وەرگێڕ)

[2] واتە بەکارم بێنی.

[3] نهج البلاغة ج٢، ص٢٣٣.

وداوای لێکرد دانیشێت (مەبەستی خۆیەتی) یان ئەوەمان کە عوسمان داوای یارمەتی لێکرد بەڵام خاوەخاوی کردو لێگەڕا بکوژرێت؟ وە عوزرخوایی ناهێنمەوە لەوەی کەڕازی نەبووم بەهەندێك لەکارەکانی‌و ڕەخنەم لێدەگرت، وە ئەگەر گوناهی من ئەوەبێت کە ئامۆژگاریم کردووە ڕێگەم پێنیشانداوە ئەوە گوناهێکم نییە".

کاتێك ئەبوسفیانی سەرگەورەی ئەمەوییەکان دوای هەڵبژاردنی ئەبوبەکر سەردانی ئیمام عەلی دەکات لە ماڵەکەیداو پێی دەڵێت: "نزمترین تیرەی قورەیش ئەم کارەی لەدەست سەندن، سوێند بەخوا مەدینە پڕ دەکەم لە سوارو پیادە، دەستت بێنە با پەیمانت بدەمێ"

بەڵام ئیمامی عەلی پێی دەڵێت "تا ئێستاش هەر دوژمنی ئیسلام‌و موسوڵمانانی، ئەوەی ڕویداوە هیچ زیانێکی بە ئیسلام‌و موسوڵمانان نەگەیاندووە، ئێمە بینیمان ئەبوبەکر شیاوە بۆ ئەم کارە بەڵام تۆ دەتەوێت ئاژاوە بنێیتەوە"[1]

جا ئەگەر ئەمە هەڵوێستی ئیمامی عەلی بێت لە خەلیفە ڕاشیدەکان کە خۆی بەڕاشکاوی دەریدەبڕێت ئایا دەتوانین بڵێین ئیمامی عەلی بەڕواڵەت شتێکی دەردەخست‌و لەدڵیدا شتێکی تری دەشاردەوە؟ پەنا دەگرین بەخوا لەئاوها قسەیەك.ئەگەر ئیمام شتێکی دەربخستایەو شتێکی تری لەدڵدا بوایە ئەو هەڵوێستەی نەدەبوو کە هەتا هەتایە مرۆڤایەتی لەبیری نەکات.

ئەم هەڵوێستە هەڵوێستێکی دڵسۆزانەو ڕاستگۆیانەو بڕوادارانەیە لە پیاوێکەوە کە پێش هەموو شتێك لەگەڵ ڕاستی‌و ڕەواییدایەو و ئامادەیە لە

---

[1] علی إمام المتقین/ عبدالرحمن الشرقاوی ج١، ص٦٦.

پێناوی ڕاستی‌و ڕەواییدا قوربانی بەهەموو شتێك بدات هەرچەند بەنرخیش بێت، ئەوەتا لە ڕۆژی شوورادا عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف پێی دەڵێت: "ئەگەر تۆ بەڵێن بدەیت لە سەر ڕێوشوێنی ئەبوبەكرو عومەر بڕۆیت من پەیمان(بەیعەت)تدەدەمێ"

ئیمامی عەلی وەڵامی دایەوە: "بەڵكو بە كتێبی خواو سوننەتی پەیامبەرو تێگەیشتنی خۆم كاردەكەم".

عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف قسەكەی دووبارە كردەوەو ئیمامی عەلی هەمان وەڵامی دایەوە تا سێ جار پاشان عەبدوڕەحمان چوو بۆلای عوسمان‌و هەمان مەرجی پێوت ئەویش بەڵێنیدا كەبەو شێوەیە كار بكات كە عەبدوڕەحمان مەرجی كردووە، ئەوەبوو عەبدوڕەحمان دەستیدایە دەستی عوسمان‌و پەیمانی دایە"

ئایا كەسێك كە چاوپۆشی لەسەرۆكایەتی دەوڵەتێك دەكات كە ئاڵاكەی لەسەر گەورەترین پارچەی ئەرز دەشەكێتەوەو دەستی پێوەدەنێت لەسەر قسەیەك كە وشەی (بەڵێ)یە بۆ مەرجەكەی عەبدوڕەحمان چونكە نایەوێت پابەند بێت پێوەی، ئایا ئاوەها كەسێك ڕووپامایی بۆ خەلیفەكان دەكات یان فێڵ دەكات وەیان لەڕوو شتێك دەڵێت‌و لەدڵیدا شتێكی تر دەشارێتەوە وەیان پەیمان بە خەلیفەكان دەدات‌و لە ستایشیاندا شتی زۆر دەڵێت‌و دەبێتە ڕاوێژكاری دڵسۆزیان‌ولە دڵیشەوە مەبەستی ئەوە نییە؟

لەگەڵ ئەوەی ئەم وێنە گەش‌و جوانە لەهەڵوێستی ئیمامی عەلی لەو ساتەوەختە هەستیارەی مێژووی ئیسلام بەسە بۆ دەرخستنی ئاكارە چاكەكان‌و ڕاستگۆیی‌و دڵسۆزی‌و پشت لە دنیا هەڵكردنی ئیمامی عەلی، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لەو قسانەی ئیمام كە دەربارەی خۆی‌و دڵسۆزی‌و فیداكارییەكانی وتویەتی دەهێنینەوە. لە شوێنێكدا دەفەرموێت: "سوێند بە

خوا ئەگەر حەوت هەرێمەکەو هەرچی لەژێریاندایە بمدرێتێ بۆ ئەوەی بێفەرمانی خوا بکەم لەزەوتکردنی پارچە جۆیەك لە مێرولەیەك، نایکەم، وە ئەم دونیایەی ئێوە لە پارچە گەڵایەك کەلەدەمی کوللەیەکدایەو دەیقرتێنێ بێ نرختره‌بەلامەوە"[1]

لە شوێنێکیدا تردا دەڵێت: "ئەمە ئاوێکی بۆگەنەو پارویەکە بخۆری پێی دەگیرێ وە لێکەرەوەی بەروبوومە پێش گەیشتنی وەکو جوتیارێك وایە لە زەوییەکی تردا شت بچێنێت، ئەگەر قسە بکەم دەڵێن حەزی لەدەسەڵاتەو ئەگەر بێدەنگ بم دەڵێن لەمردن ترسا، ئای لەدووری ئەو دووە لەمنەوە، سوێند بەخوا هۆگریی کوڕی ئەبو تالیب بە مردن زیاترە لەهی منداڵێکی ساوا بە مەمکی دایکییەوە"[2]

لەنامەیەکیشدا کە دەینێرێ بۆ عوسمانی کوڕی حەنیفی والی بەسرە دەڵێت: "سوێند بەخوا لەم دونیایەی ئێوە هیچ کانزایەکم کۆنەکردووەتەوە، وە هیچ شتێکم لە دەستکەوتەکانی گل نەداوەتەوە، وە هیچ پینەیەکم بۆ دڕاوی کراسەکەم ئامادەنەکردووە، بەوەندە ڕازی بم کە بوترێت پێشەوای بڕوادارانەو بەشداریـیان نەکەم لەناخۆشی ڕۆژگارو سەختی ژیان، یان بەسك تێری بژیمو خەڵکانی دەورووبەرم لەبرسێتیو تێنوێتیدا بتلێنەوە، ئەوە زۆر لەمنەوە دوورە کە ئارەزووەکانم پاڵم پێوە بنێت خواردنی خۆش هەڵبژێرم لەکاتێکدا کەلەوانەیە لەنەجد یان یەمامە کەسێك هەبێت نانێکی نەبێت یان تێری بەخۆیەوە نەبینێت، لەوانەیە بڵێن ئەگەر ئەمە خواردنی کوڕی ئەبو

---

[1] نهج البلاغة ج١ ص٢١٨: حەوت هەرێمەکە (الاقالیم السبعة) پێدەچێت مەبەستی حەوت ئاسمانەکە بێت.(وەرگێر)

[2] نهج البلاغة ج١، ص٤٠.

تالیب بێت لاواز دەبێتو توانای شەڕکردنو ڕووبەڕووبوونەوەی پاڵەواتانی نامێنێت، ئەوە بزانن کە داری خۆڕسك پتەوترەو چیمەنیش گەڵای ناسکترە، منیش وەکو برا بۆ براو مەچەك بۆ قۆڵ وابووم بۆ پەیامبەر،سوێند بەخوا گەر هەموو عەرەب بۆ شەڕی من کۆببنەوە هەڵنایەمو پشتیان تێ ناکەم"[1]

لە شوێنێکی تردا دەڵێت: "سوێند بەخوا بەسەر دڕكو داڵەوە ڕاکشێمو خەوم بزڕێت وە بەزنجیر کۆتبکرێمو ڕابکێشرێم لەوەم پێخۆشترە سبەینێ ڕووبەڕووی خواو پەیامبەر ببمەوە لەڕۆژی قیامەتدا ستەمم لە هەندێك بەندەکان کردبێت یان هەندێك لە چیلکەی دونیام زەوت کردبێت"[2]

ئەوەتا ئیبن عەباس لە زیقار دەچێ بەسەر عەلیدا دەبینێ وا خەریکە نەعلەکانی خۆی پینە دەکات، ڕوو دەکاتە ئیبن عەبباسو لێی دەپرسێ: ئەم نەعلانە بایی چەند دەبن؟

ئیبن عەبباس دەڵێت: هیچ نرخێکی نییە ئەی پێشەوای بڕواداران، ئیمام دەڵێت: "سوێند بەخوا ئەم نەعلەم لاخۆشەویسترە لەفەرمانڕەوایی ئێوە مەگەر لەبەرئەوەی کە ڕاستی بەرپابکەمو ناڕەوایی لەناو ببەم".

بە پێویستیشی دەزانم لێرەدا باسی هەڵوێستی ئیمامی عەلی لەخاتو عائیشە بکەم دوای شەڕی جەمەل، ئەوەبوو دوای شەڕەکە زۆر ڕێزی لێنا، ڕێزلێنانێك شیاوبێت بۆ خێزانی پەیامبەر (ﷺ) دوای ئەوەی کە بەیاوەری کۆمەڵێك لەژنانی قورەیش ناردییەوە بۆ مەدینە.

بەڵام شیعە لەبەرئەو شەڕەی عائیشە لەگەڵ ئیمامی عەلیدا لێی خۆش نەبوون، ئەمەشە هۆی هەڵوێستی دژانەیان بۆ دایکی بڕواداران، لێرەدا

---

[1] نهج البلاغة ج٢، ص٢٢.

[2] نهج البلاغة ج٢، ص٢١٦.

نامەوێت ئەو پاساوانە باس بکەم کە لایەنگرانی عائیشە دەیهێننەوە بۆ دەرچوونی عائیشە دژی ئیمامو ئەو بۆچوونانەی شیعەش کە بۆ پاساودانەوەی دژایەتی کردنی عائیشەی دایکی بڕواداران دەیهێننەوە، ئەمانە شتانێکن لەدەیان کتێبدا باس کراوەو هیچ سودێك نابینم لەدووبارەکردنەوەیاندا، بەڵام من دەمەوێت ئەو ململانێ فکرییە بە لۆژیکی ڕوونی شیعە کۆتایی پێ بێنم ئەویش ئەوەیە کە ئیمامی عەلی کە خەلیفەی ئەوکاتە بوو وە بەوپەڕی ڕاستیو ڕەوایی دادوەری دەکردو بەقەدەر نوکە دەرزییەك لەڕاستی لای نەدەدا عائیشەی بێتاوان کرد لەو شەڕەی کە فەرماندەیی دەکرد، جا ئەگەر ئیمام تاوانەکەی خستە ئەستۆی کۆمەڵێکی تر کە سودیان لە سادەیی دایکی بڕواداران وەرگرتو لەماڵی خۆی دەریانکرد بۆ سەرۆکایەتی کردنی ئەو بزووتنەوەیەی دژی خەلیفەی شەرعیو هەڵبژێردراو بەرپاکرا، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە عائیشە لەڕوانگە ئیمامی عەلییەوە بێتاوانو بەرییە لەهەموو ئەو شتانەی وابەستەن بەشەڕی جەمەلەوە، بۆیە فەرمانیدا بەڕێزلێگرتنو گێڕانەوەی بۆ مەدینە بەو شێوەیەی کە هەموو کتێبە مێژووییەکان باسی دەکەن بۆ ئەوەی بێتاوانی ئەو بسەلمێنێت، لەڕوانگەی دادوەرێکی دادپەروەرەوە کە ئیمامی عەلییە، بۆیە بۆ هیچ کەسێك نییە دوای ئەوە توانج لە خاتوو عائیشە بگرێت یا تاوانباری بکاتو پێچەوانەی کاری ئیمامی عەلیو بۆچوونەکەی بجوڵێتەوە کەبەدەستەواژەیەکی ڕوون دووپاتی دەکاتەوە کاتێك کە باسی شەڕی جەمەلو سەرنەکەوتنی دایکی بڕواداران لەسەرکردایەتییەکدا دەکات و دەڵێت: "لەگەڵ ئەوەشدا ڕێزی پێشینی خۆی هەیە (واتە وەکو دایکێکی بڕواداران)و لێپرسینەوەش لەسەر خوای باڵا دەستە"[1]

[1] نهج البلاغة ج٢، ص٤٨.

لەزۆر شوێنی تریشدا ئیمامی عەلی بەرپرسیارێتی ئەو شەڕە دەخاتە ئەستۆی ئەوانەی خێزانی پەیامبەریان بەکارهێناوە بۆ مەبەستی سیاسیی‌و ڕایانکێشا بەدوای خۆیاندا[1]

خۆشبەختانە هەندێك لە زانایانی شیعە هەڵوێستێکی شیاویان هەبووە بەرامبەر بەدایکی ئیمانداران‌و ڕێگەیان نەداوە بە بریندارکردنی، ئەوەتا سەید مەهدی تەباتەبایی کە یەکێکە لە زانایانی سەدەی دوانزەهەمی کۆچی لە شیعرێکیدا ڕوودەکاتە خاتو عائیشەو دەڵێت:

"ئەی ڕوومەت سوور جنێو پێدانت قەدەغەیە

لەبەر چاوێك هەزار چاو ڕێزی لێدەگرێت"[2]"

## ٥ـ قسەی پێشەوایانی شیعە دەربارەی خیلافەت‌و خەلیفە ڕاشیدەکان:

ئەم بەشە کۆتایی پێدێنین بەکێشانی وێنەیەکی ڕوون‌و دیار دەربارەی هەڵوێستی پێشەوایانی شیعە لەسەر خیلافەت‌و نەبوونی دەقێکی خوایی لەسەری بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکەمان تێرو تەسەل بێت، وەکو لەسەرەتای ئەم بەشەدا باسمان کرد.

ئەگەر ئیمامەت مەسەلەیەکی خوایی بوایە وەکو شیعەکان دەڵێن‌و تایبەت بوایە بەنەوەکانی عەلییەوە ، ئەوکاتە ئیمامی عەلی حەسەنی کوڕی دەکردە خەلیفەو پێشەوا دوای خۆی، بەڵام ئەوەی کە هەموو مێژوونووسان‌و ڕاوییەکان کۆکن لەسەری ئەوەیە کە ئیمامی عەلی کاتێك لەسەرەمەرگدا بوو

---

[1] نهج البلاغة ج٣، ص٨٤.

[2] پەیامبەری بەڕێز (ﷺ) بەخاتوو عائیشەی دەوت حومەیرا. (نووسەر)

دوای بریندارکردنی لەلایەن عەبدورڕەحمانی کوڕی موڵجیمی مورادییەوە پرسیاریان لێیکرد دەربارەی ئەو کەسەی کە دەبێتە جێنشینی فەرمووی: "چۆن پەیامبەر بەجێی هێشتین منیش ئاوها بەجێتان دێڵم"

ئەوەبوو دوای کۆچی دوایی ئیمامی عەلی موسوڵمانان کۆبوونەوەو حەسەنی کوڕیان هەڵبژاردو پەیمانیان دایێ بەڵام ئیمامی حەسەن لەگەڵ معاوییەدا ئاشت بوویەوەو دەستی لە خیلافەت هەڵگرت بۆ ئەوو کارەکەی بە پاراستنی خوێنی مسوڵمانان پاساو دایەوە.

جا ئەگەر خیلافەت پلەو پایەیەکی خوایی بێت ئایا لەتوانای ئیمامی حەسەندا بوو دەستی لێهەڵگرێت بۆ معاویە بەبیانووی ڕێگەگرتن لەخوێن ڕشتن؟

هەروەکو دەزانین ڕێگرتن لەخوێنڕشتن جێگایەکی نابێتەوە کاتێك کەمەسەلەکە پەیوەندی بەبەرگریکردن لە فەرمانی خواو شەریعەتەکەیەوە هەبێت، ئەی جیهادو شەڕ لەپێناوی سەقامگیرکردنی ئاینی خواو شەریعەتەکەی چ مانایەکی هەیە، پاراستنی خوێن لەبەرمبەر مافی خوایی‌و فەرمانی ئاسمانیدا دژایەتییەکی تەواوو ڕوونی هەیە لەگەڵ ئەم ئایەتە پیرۆزەدا: "خوا گیان‌و سامانی لەبڕواداران کڕیوە بەرامبەر ئەوەی بیانخاتە بەهەشت، دەجەنگن لەپێناوی خواداو دەکوژن‌و دەکوژرێن، ئەمە بەڵێنێکی ڕاستە خوا بڕیویەتییەوە لەسەر خۆی لەتەورات‌و ئینجیل‌و قورئاندا، جا کێ لەخوا بەوەفاترە لە بەڵێنەکانیدا، کەواتە دڵگەش بن بەو مامەڵەیەی کردووتانە لەگەڵ خواداو ئەوەیە سەرکەوتنی گەورە" التوبە/ ١١١.

ئیمامی حوسەینیش کاتێك ئەو شۆڕشەی بەرپاکرد بۆ لابردنی یەزیدی کوڕی معاویەو لەکەربەلا شەهید کرا لەگەل منداڵ‌و یارانیدا هەرگیز

نەیوتووە بەرگری لە خیلافەتێکی ئاسمانی دەکات کە یەزید زەوتی کردووە بەڵکو دەیوت خۆی لەو شیاوترە بۆ خیلافەتو کەسێکی وەکو ئەو بەیعەت بەکەسێکی وەکو یەزید نادات‌و ئەو شۆڕشەی بۆ زیندووکردنەوەی ئایینی پەیامبەری خوا بەرپاکردووە کە لەسەردەستی یەزید گۆڕاوە.

هەروەها لە قسەکانی ئیمامی سەجاد (عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی) هیچ دەستەواژەیەك نابینین بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کە خیلافەت کارێکی خواییە.

دوای ئیمامی سەجادیش ڕۆڵی ئیمام موحەممەدی باقر دێت کە لە سەردەستی ئەو مەزهەبی فیقهی ئەهلی بەیت گەشەی کردو ئیمامی جەعفەری سادقی کوڕی تەواوی کرد، هیچ شوێنەوارێك بۆ بیرۆکەی خیلافەی خوایی نابینین لەسەر دەمیاندا، بەڵکو تەنانەت لەسەردەمی ئیمامەکانی تریشدا ئەو شتە نابینین تاکاتی دیارنەمانی گەورە.

شتێك هەیە شایانی گوێ پێدانەو پێویستە تیشکی بخرێتە سەر بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو قسانەی هەندێك لە زانایانی شیعە گێڕاویانەتەوە لەبریندارکردنی خەلیفە ڕاشیدەکان‌و لەسەرویانەوە ئەبوبەکر، ئەویش ئەوەیە کە ئیمام جەعفەری صادق کە بە دامەزرێنەری مەزهەبی جەعفەری دوازدە ئیمامی دەژمێردرێت لەچەندین بۆنەدا بەشانازییەوە دەڵێت: "من دووجار کوڕی ئەبوبەکرم"

ئەویش لەبەرئەوەی ئیمامی صادق لە دوو ڕێگەوە بەنەژاد دەگەڕێتەوە سەر ئەبوبەکر، یەکەم لەڕێگەی دایکییەوە کە فاتیمەی کچی قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکرە، وە دووەم لەڕێگەی داپیریەوە ئەسمای کچی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر کە دەکاتە دایکی فاتیمەی کچی قاسم، بەڵام

سەیر لەوەدایە کە ڕاویەکانمان قسەیەکی زۆریان لەم ئیمامەی کەشانازی بە ئەبوبەکری باپیرییەوە دەکات گێڕاوەتەوە کە هەمووی قسەپێوتن‌و بریندارکردنیەتی، جا ئایا بە عەقڵی کەسەوە دەچێت کە ئیمامی جەعفەر لەلایەکەوە شانازی بە باپیریەوە بکات‌و لەلایەکی تریشەوە قسەی پی بلێت‌و بریندااری بکات؟

ئەم جۆرە قسانە لەکەسێکی بازاڕی نەزانەوە ناوەشێتەوە چ جای ئیمامێك کە بەزاناترین‌و دیندارترینی سەردەمی خۆی دادەنرێت[1]

بەو شێوەیە دەبینین ڕاویەکانی شیعە بەشدارییەکی کاریگەریان کردووە بەڵام بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەناشیرینکردنی ئەو ئیمامانەی کە خۆیان بەلایەنگریان دەزانن‌و چەندین کتێبیان نووسیوەتەوە بۆ زیندووکردنەوەی کەلەپورەکانیان.

ئێمە سەردەمی نووسینی ئەم پەڕاوانەو ئەو ڕیوایەتە هەڵبەستراوانەی تێیاندا هاتووە ناو دەنێین سەردەمی یەکەمی دەرکەوتنی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوع، لەو باوەڕەشدام کە ئێمە بەگوێرەی پێویست قسەمان لەسەر خیلافەت‌و پێوەندەکانی کرد، ئەوەی لەسەرمانە ئێستا قسەکردنە لەسەر ئەو بیرۆکە ڕاستکارییە (چاکسازییە) ی کە بانگەشەی بۆ دەکەین‌و ئاوات دەخوازین کە ڕۆڵەکانی شیعەی ئیمامی لەسەری برۆن‌و لەژێر پەرچەمیدا کۆببنەوە.

داواش دەکەین شیعەکان بەهەموو هێزو توانایەکیانەوە لەڕووی ئەوکەسانەدا بوەستن کەنان بەشیعەوە دەخۆن‌و بژێوی خۆیان لەو قسەو

---

[1] ئەڵبەتە بەلای شیعەوە. (وەرگێڕ)

نووسینو بانگەوازانە مسۆگەر دەکەن کە ناکۆکیو دووبەرەکی دەخاتە نێوان مسوڵمانانەوەو داواش لەتوێژی ڕۆشنبیرو ئاگا دەکەین لەڕۆڵەکانی شیعە کە پشتیان پێدەبەستن لەسەرخستنی پرۆژە چاکسازییەکەماندا ببنە منارەی هیدایەت بۆ ئەو زۆرینەیەی کە باوەڕیان کردووە بەو شتانەی لە بانگخوازانی دووبەرەکیو خاوەنی عەقڵە جام بووەکانو دەروونە نەخۆشەکانو شوێنکەوتوانی بەرژەوەندیو هەواو ئارەزووەکان دەیبیستن.

## ڕاستکردنەوە:

لێرەوە دەستدەکەین بەدیاریکردنی خاڵە سەرەکییەکانی چاکسازیو ڕاستکردنەوەو هەموو هیوایکیشم بۆ سەرکەوتنی بەستووە بەو وتوێژە هۆشیارو ڕۆشنبیرە لەو ڕوناکبیرانەی کەلەسەرەوە ئاماژەم پێدان:

١ـ مەسەلەی خیلافەت پێویستە لەچوارچێوە ڕاستەقینەکەی خۆی دەرنەچێت کە قورئان دیاریکردووە: "بڕواداران ئیشو کاریان لەنێوان خۆیاندا بەڕاوێژە"

وە شیعەکان بەهەمان ئەو تێڕوانینو شێوەیە بڕواننە خەلیفە ڕاشیدەکان کە ئیمامی عەلی بڕیاریداوەو پێی قایل بووە لە سەر ڕۆشنایی دەقەکانی قورئانو یەکدەنگی مسوڵمانان.

وە خەلیفە ڕاشیدەکان بنیاتنەرانی یەکەمی ئیسلامنو لەکاتی فەرمانڕەوایی خۆیاندا ئەوپەڕی کۆششیان کردووەو هەندێك جار پێکاویانەو هەندێك جار نەیانپێکاوە وە هەریەکەیان تا بۆی کرابێت خزمەتی بە ئیسلام کردووە.

خەلیفەی یەکەم بەبەجەرگیو سووربوونو خۆڕاگری خۆی ئیسلامی پاراست لەمەترسی هەڵگەڕانەوە، ئەو هەڵگەڕانەوەیەی بووە هۆی ئەو شەڕانەی کە بیست هەزار کەس لە هاوەڵانی پەیامبەری تێدا شەهید بوو بۆ بەرگری لە ئیسلام[1]

---

[1] نووسەر ئاماژەی بەیەکێك لەهەڵوێستو کارە گەورەکانی ئەبەکری صدیق کردووە، ئەگینا هەموو هەڵوێستتو ئیشەکانی گەورەو بێ وێنە بوون لەوانە:

أـ یەکەم کەس بوو لە پیاوان بێ سێو دوو باوەڕی بە پەیامبەر هێناو لەهەموو شتێکدا بەبێ هیچ دڵە ڕاوکێیەك قسەکانی دەسەلماند.

ب ـ پەیامبەر (ﷺ) هەڵیبژاردبە هاودەم بۆ گەورەترینو پرمەترسیترین گەشت کە کۆچ بوو لەمەککەوە بۆ مەدینە کە ئەبوبەکر سەرەڕای ئەوەی کە شەرەفی هەڵبژاردنی پێ بەخشرا بۆ ئەو کۆچە مێژوویيە گەورەترین ڕۆڵیشی بینی لە بەئەنجام گەیاندنی ئەو گەشتەو خۆیو ماڵو منداڵی خستبووە خزمەتی پەیامبەرو گەشتەکەوە.

ج- چارەسەرکردنی کێشەی جێنشینی پەیامبەر بەماوەیەکی قیاسیو بی ئەوەی هیچ کێشەیەکی ئەوتۆی لێبکەوێتەوە.

دـ چەسپاندنی دەسەڵاتی ئیسلام لەناوچەی نیوە دوورگەی عەرەبوفراوانکردنی ڕووبەری دەوڵەتی ئیسلامی و بڵاوکردنەوەی ئیسلام لەو وڵاتانەداو موسوڵمانبوونی خەڵکێکی زۆر لە سەردەمی ئەودا کە هەمووی دەچێتە حیسابی چاکەکانی ئەوەوە.

ھ-کۆکردنەوەی قورئان بەبڕیاری ئەو و لە سەردەمی ئەودا .ئەمەش گەورەترین شەرەف بوو بۆ ئەبوبەکرو بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو دڵسۆزی ئیسلام بووەو ئەیویستووە لەناو بچێت و سوور بووە نەك هەر لەسەر فراوانکردنی دەسەڵاتی سیاسی ئیسلام بەڵکو لەسەر پاراستنی بنەماکانیشی لە ڕێی پاراستنی کتێبەکەیەوە کی قورئانە.

و- نەهێشتنی بیرۆکەی میراتگری دەسەڵات و دوورخستنەوەی ماڵو منداڵو کەسوکاری خۆی لەهەموو دەسەڵاتو بێبەشکردنیان لەهەموو دەستکەوتێکی دونیایی کەلەڕێی ئەو دەسەڵاتەوە بەدەست دەهێنرێت. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ڕاوێژکاری یەکەمی پەیامبەر بوو وە باوکی

ئەوە ئیمامی عەلیشە لەبەردەرگای ماڵی ئەبوبەکر دەوەستێت لە ڕۆژی کۆچیی دوایی ئەبوبەکردا بەم شێوەیە قسەی لەگەڵدا ەکات: "ڕەحمەتی خوات لێبێت ئەی ئەبوبەکر تۆ پێش هەموان مسوڵمان بوویتو لەهەموان دڵسۆزترو دامەزراوتر بووی لە بیروباوەڕتاو لەهەموون بەکەڵکتر بووی بۆ پەیامبەرو لەهەموان زیاتر بەرگریت لێدەکرو لەهەموان نزیکتر بووی لە پەیامبەرەوە لەڕووی ڕەوشتو ئاکارو چاکەکارییەوە، خودا پاداشتی ئەو چاکانەی هەتبووە بۆ ئیسلامو پەیامبەری ئیسلامو موسوڵمانان بداتەوە.

لەکاتێکدا کە خەڵکی پەیامبەریان بەدرۆ دەخستەوە تۆ باوەڕت پێهێنا، وە کاتێك کە خەڵکی پشتیان تێکرد تۆ یارمەتیت داو دڵنەواییت کرد، وە کاتێك خەڵکی دانیشتنو دوای نەکەوتن تۆ لەگەڵیدا چووی، خوا لە قورئان بەڕاستگۆ ناوی بردوویت "ئەوەی ڕاستی هێناو ئەوەش باوەڕی پێهێنا ئەوانە لە پارێزکارانن"[1]، مەبەستی ئایەتەکە پەیامبەرو تۆیە، سوێند بەخوا بۆ ئیسلام قەڵا بووی، وە بۆ بێبڕواکان سزابووی، بەڵگەت کەمی نەدەکردو تێڕوانینت لاواز نەدەبوو، دەروونت ترس ڕووی تێنەدەکرد، وەکو ئەو شاخە بووی کە گەردەلوول نایجولێنێت، بەو شێوەیە بووی کە پەیامبەر (ﷺ) باسی دەکردی: لاواز لەبەدەنتدا، بەهێز لەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوادا، بەلای خۆتەوە کەمو بچوك بوویت وە بەلای خواوە زۆر گەورەبووی، شکۆمەند بووی لەزەویدا، گەورەبووی بەلای بڕوادارانەوە، هیچ کەسێك تەماداری

---

خۆشەویستترین خێزانی بوو، وە هەموو سەروەت و سامانی خۆی خستبووە خزمەتی پەیامبەرو بانگەوازەکەیەوە وە پەیامبەر دەفەرموێت "سامانی هیچ کەسێك ئەوەندەی هی ئەبوبەکر بەکەڵکم نەهاتووە".(وەرگێڕ)

[1] (وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ) (الزمر : ٣٣ ).

شتێك نەبوو لات کەمافی خۆی نەبووبێتو هیچ کەسێکیش چاوەڕوان نەبوو بەخاترانە شتێکی بۆ بکەیت، مرۆڤی بەهێز بەلاتەوە لاوازبوو تا مافەکەت لێدەسەندەوە، وە لاواز بەلاتەوە بەهێزبوو تا مافەکەت بۆ دەسەندەوە، خوا بێبەشمان نەکات لە پاداشتتو گومڕامان نەکات لەدوای تۆ"[1]

خەلیفەی دووەمیش عومەری کوڕی خەتتاب هێزێکی گەورەی دا بە ئیسلام بەو فتوحاتەی کردیو بەو هەڵوێستە نەمرانەی هەیبووە بۆ فراوانکردنی ڕووبەری وڵاتی ئیسلامی لەڕۆژئاواداو ئەو بوو بنەماکانی ئیسلامی جێگیرکرد لە وڵاتانێکی بەرفراواندا لەوانە ئێرانو فەلەستینو شامو میسر"

خەلیفەی سێهەمیش عوسمانی کوڕی عەففان دووجار پەیامبەر کچی داوەتێ وە ئەگەر کەسێکی شیاو نەبوایە پەیامبەر ئەو شەرەفەی پێنەدەبەخشی، هەروەها ڕۆڵ و بەشدارییەکی گەورەی هەبوو لە کاتی بانگەوازی ئیسلامیدا، ئەوەندەش بەسە بۆ شانازی کە یەکێك بوو لەدەوڵەمەندەکانی قورەیش کەهەزار حوشتری نایابی هەبوو فرۆشتنیو نرخەکەی کە دەخەملێنرا بە یەك ملیۆن سکەی ئاڵتونی ئەو سەردەمە خەرجکرد لە پێناوی بانگەوازەکەی پەیامبەرو بەسەر مسوڵماناناندا، لەسەردەمی ئەودا فتوحاتی ئیسلامی زیاتر پەرەی سەند تا گەیشتە دەورووبەری هیندستان، وە ئەگەر لەکۆتایی ژیانیدا سەرکەوتوو نەبوو لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا، بەڵام بەستەملێکراوی لەتەمەنی هەشتا ساڵیداو لەکاتی قورئانخوێندندا شەهید کرا.

---

[1] الصديق أول الخلفاء – عبدالرحمن الشرقاوي.

هەروەها نابێت خەلیفەکان بریندار بکرێن‌و بەقسەی ناشیرین سەرزەنشت بکرێن وەکو ئەوەی لە زۆربەی کتێبەکانی شیعەدا دەیبینین، قسە گەلێك کە پێچەوانەی هەموو پێوەرە ئیسلامیی‌و ئەخلاقییەکان‌و دژیشە لەگەڵ قسەکانی ئیمامی عەلی‌و پیا هەڵدانی پێیاندا وەکو لەمەوبەر باسمان کرد.

هەروەها پێویستە لەسەر شیعە ڕێز لە خەلیفە ڕاشیدەکان بگرن‌و پلەوپایەی ئەوان‌و نزیکییان لە پەیامبەرەوە ڕەچاو بکەن، ئەوەتا پەیامبەر (ﷺ) زاوای ئەبوبەکرو عومەرەو دوو کچی خۆی داوە بە عوسمان‌و عومەری کوڕی خەتتاب زاوای ئیمامی عەلییەو ئوم کولسومی کچی خواستووە. من لەم بانگەشە ڕاستکارییەدا داوا لە شیعە ناکەم زیاتر لەوەی کە ئیمامی عەلی وتویەتی دەربارەی خەلیفەکان‌و باوەڕی پێی هەبووەو کردویەتی لەگەڵیاندا بڕوای پێ بێنن وبیکەن.

ئەگەر شیعە پابەندبن بە کردەوەکانی ئیمامی عەلییەوە ناکۆکی‌و دووبەرەکی کۆتایی پێدەهات و ئاشتییەکی هزری قوڵ باڵی دەکێشا بەسەر ئوممەتی ئیسلامیدا کە دابینکەر بێت بۆ یەکگرتنەوەیەکی ئیسلامی فراوان‌و گەورە.

٢- بژارکردنی ئەو کتێبە شیعییانەی ئەو ڕیوایەتانە دەدەنە پاڵ ئیمامەکانی شیعە کەزەم‌و سەرکۆنەی خەلیفە ڕاشیدەکانی تێدایەو سەر لەنوێ چاپکردنەوەیان بە پالێوراوی.

٣- پێویستە لەسەر شیعە دڵنیابن لەوەی کە هەموو ئەو ڕیوایەتانەی کتێبەکانی شیعە باسیان کردووە لەزەمکردنی خەلیفەکان‌و هەبوونی دەقی خوایی لەسەر مەسەلەی خیلافەت ڕیوایەتگەلێکن لەدوای سەردەمی دیارنەمانی گەورە دانراون، دوای ئەوەی هەموو دەرگاکانی گەیشتنە دوا

ئیمامی شیعە کە مەهدیە داخرا، لەبەرئەوەشە ئەو ریوایەتە بریندارکەرانەی دەرحەق خەلیفە ڕاشیدەکان هاتووەو مەسەلەی هەبوونی دەقی خوایی لەسەر خیلافەت تاوەکو سەردەمی حەسەنی عەسکەری کە ئیمامی یازدەهەمی شیعەیە نابینین چونکە شیعەکان دەیانتوانی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئیمامەوە بکەنو پرسیاری ڕاستیو درۆیی ئەو ڕیوایەتانەی لێبکەن کە دراونەتە پاڵ باپیرانی، بەڵام دوای ڕاگەیاندنی فەرمی دیارنەمانی ئیمامی دوانزەهەمو بەدرۆخستنەوەی هەرکەسێك لافی بینینی ئیمام لێبدات، لەرێگەی دەقێکی ڕاشکاوەوە کە لە خۆیەوە دەرچووە، ڕاوییەکانی شیعە ڕیوایەتگەلێکیان نووسی بەناوی ئیمامەکانی شیعەوە و لەبەرنەبوونی ڕێگەیەك بۆ گەیشتنە ئیمام بۆ ساغکردنەوەی ئەو ڕیوایەتانە لەرووی ڕاستیو درۆییەوە ئەوەی کە ڕوویدا ڕوویدا لە گێڕانەوەی ڕیواتگەلێك کە مرۆڤ شەرم دایدەگرێ لە گێڕانەوەیان.

٤ـ شیعە دەبێ لەو قۆزاخەیە دەربچن کە خۆیانیان تێخستووەو ڕێبازی ئیمامی عەلی بگرنەبەر ئەگەر بەڕاستی لایەنگرو هەواداری ئەونو منداڵەکانیان وەکو ئەو بەناوی خەلیفەکانو خێزانەکانی پەیامبەرەوە ناوبنێن بەتایبەت عائیشەو حەفصە چونکە شیعە خۆیان دوور دەگرن لەم دوو ناوە، ئەوەتا ئیمامی عەلی ناوی کوڕەکانی خۆی ناوە ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان، ئیمامەکانی شیعەش هەمان ڕێگەیان گرتووەتە بەرو چەندین کچیان ناو ناوە عائیشەو حەفصە، ئەمە جگە لەوەی کەناونانی منداڵەکان بەناوی خەلیفەکانەوە خەڵکی دەردەهێنێت لەگۆشەگیریو تایفەگەرێتیو دووبەرەکیو دەیانخاتە ناو ڕیزی یەکبوونی ئیسلامی گەورەوە لەگەل مسوڵمانانندا.

بەڕاستی سەختە لەسەر چاکسازان کە لە ناوچە شیعەییەکاندا کەسێك نەبینین ناوی یەکێك لەو خەلیفانەی هەڵگرتبێت، وە ئەگەر گەسێك بە یەکێك لە وڵاتاندا بگەڕێت بۆنمونە ئێرانو ئەو ناوچانەی ناکۆکی زۆری تێدایە لە نێوان شیعەو موسوڵمانانی تردا هیچ شوێنەوارێك بۆ ئەو ناوانە نابینین.

٥- دەبێ شیعە لەهەر کوێیەك هەن لەسەر گۆی ئەم زەوییە هۆی ڕاستەقینەو سەرەکی دواکەوتنی خۆیان لەڕووی هزرو کۆمەڵایەتییەوە لە ئەنجامی شوێنکەوتنی ئەم سەرکردە مەزهەبییانەو کوێرانە لەگوێ کردنیان ببینن کە وەکو ڕانە مەڕی لێکردوون بۆ هەرکوێ بیانەوێت بیانبەنو ئەو سەرکردانەن کە بوونەتە هۆی نەگبەتیو ناڕەحەتی گەورە بۆ شیعەکان[1]

لەگەڵ ئەوەی کە من هەندێك لەو پێشەوایانە جیا دەکەمەوە لەم بنەمایە بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان تا ئێستاش سەرچاوەی هەموو ئەو بیدعە فیکریانەی شیعەن هەر لەسەردەمی دیارنەمانی گەورەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ، گومانیشی تێدا نییە کە پێکهاتەی هزری داخراوی ئەم پێشەوایانەو ئەو دەرامەتە گەورەیەی دەستیان دەکەوێت لە سامانی شیعەکان بەناوی خومس (پێنج یەك)ەوە، ئەو بیدعەتەی کە لەمەو دوا ئاماژەی پێدەدەین لەبەشێکی تایبەتداو ئەو دەسەڵاتە ڕەهایەی بەخۆیان داوە بەسەر شیعەکاندا بەربەستێکی گەورەبووە لەبەردەم هەڵماڵینی ئەو پەردەیەی دراوە بە سەرچاویانداو لەبەر پلەوپایە دونیاییە و خۆشییە کاتییەکانیدا وەکو ئەوەی

---

[1] چاوپۆشی کردنی موسوڵمانان لەو شتە ناشەرعی و ناشارستانی ونامرۆڤانانەی شیعە لەبەر ئەوەیە کە ئەمڕۆ ئەوان سەرکەوتوون و داشیان سوارە وموسوڵمانانی سوننە لە حاڵەتی داڕوخانی دەروونیدا دەژین وەچاوپۆشی ئەمریکاو ڕۆژئاوا لەو جۆرە مومارەسانە گومانێك دروست دەکات لای چەودێران لە بوونی هاوپەیمانی ژێراوژێری شیعەو ئەمریکا !(وەرگێڕ)

گوێیان لەم ئایەتەی خوا نەبووبێت کە دەفەرموێت: "ئێمە دوارِۆژ( بەهەشت) دەدەین بەو کەسانەی نەخۆ بەزل زانییان دەوێت لەم دونیایەو نەدەست درێژیو خراپەکاری، سەرەنجامی چاکیش بۆ خۆپارێزانە" قصص ٨٢.

پەیامبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: "دوا شتێك کەلەمێشکی پیاوچاکان بێتە دەرەوە خۆشویستنی پلەو پایەیەی دونیاییە".

تا رِۆژگاری ئەمرِۆ سەرکردە مەزهەبییەکانی شیعە وەکو تۆپ یارییان بە شیعەکان کردووە بەپێی هاویشتوونیان بۆ ئێرەو ئەوێو گاڵتەیان پێکردوونو کردونیان بە گاڵتەجارِی هەموو دنیاو مایەی پێکەنینی هەموو میللەتان.

من لەگەڵ ئەوەی لەیەکێك لەبەشەکانی ئەم کتێبەدا بەڵگەو رووداوی زۆرم هێناوەتەوە لەسەر بەکارهێنانی شیعە لەلایەن سەرکردە مەزهەبییەکانەوە بەدرێژایی مێژوو تا ئەمرِۆ لەهەرشوێنێکدا ئەم ئومەتە داماوەی تێدا بووبێت بەڵام لەهەموو بەشێکیشدا خاڵەکان دەخەمە سەر پیتەکان بۆ ئەوەی قسە تێکەڵی قسەو بیرۆکە تێکەڵی بیرۆکە نەبێت.

# تەقیە[1]

---

[1] تەقیە لەروی زمانەوە بەمانای خۆپاراستن دێت بەڵام لەرووی زاراوەوە بەو مانایە دێت کە مرۆڤی بڕوادار دەتوانێت بۆ خۆرزگارکردن لە مەترسی بەدەم شتێك بڵێت پێچەوانەی ئەوە بێت کە لەدڵیدایە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك کەوتە دەستی بێبڕواکانو هەڕەشەی کوشتنیان لێکرد مەگەر جنێو بەخواو پەیامبەر بدات، دەتوانێت ئەو کارە بکات بەو مەرجەی لە دڵیەوە بڕوادار بێتو ئەو کارەی پێناخۆش بێتو تەنها بۆ خۆدەربازکردن لەو مەترسییە بێت کە رووی تێکردووە، وەکو خوا دەفەرموێت (لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللّهِ فِي شَيْءٍ إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللّهِ الْمَصِيرُ) (آل عمران : ٢٨ ).
واتە نابێت بڕواداران بێباوەڕان بکرن بە دۆستی خۆیان لەجیاتی بڕواداران، وە هەرکەسێك وا بکات ئیتر پەیوەندی لەگەڵ خوادا نامێنێت مەگەر بۆ خۆپاراستن لێیان وە خوا دەتانترسێنێت لە سزای خۆیو گەڕانەوە هەر بۆلای ئەوە. هەروەها دەفەرموێت (مَن كَفَرَ بِاللّهِ مِن بَعْدِ إيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ وَلَـكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْراً فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (النحل : ١٠٦ ) واتە: ئەو کەسەی پاش بڕواهێنان بە خوا، بێباوەڕی بکات، ئەوە بەر خەشمو قینی خوا دەکەوێت مەگەر کەسێك زۆری لێکرابێتو دڵیشی دامەزراو بێت لەسەر باوەڕ، بەڵام ئەو کەسەی کە دڵی بە بێبڕوایییەکەی خۆش دەبێت ئەوەیان بەرخەشمو قینی خوا دەکەوێت.
ئەمەش لەشەرعدا ڕوخسەتی پێ دەوترێت واتە مۆڵەتو بەرامبەرەکەی پێی دەوترێت عەزیمە واتە سووربوونو پێداگرتنو دەستبەردارنەبوون لەو شتەی قەناعەتت پێیەتی، عەزیمەش لەشەرعدا لە ڕوخسەت گەورەترەو لە پێشترەو پاداشتەکەی زیاترەو هەر لەو ڕووەشەوە کە پەیامبەرانی (أولی العزم) لەوانی تر گەورەترنو پەیامبەریش (ﷺ) دەفەرموێت "سيد الشهداء حمزة ورجل قام الى سلطان جائر فنهاه فقتله" واتە: سەروەری شەهیدەکان حەمزەیەو پیاوێکیش هەڵسێت لەرووی دەسەڵاتدارێکی ستەمکاردالو ڕێگەی ستەمی لێبگرێتو ئەویش بیکوژێت".
هەروەها دەفەرموێت "أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر" واتە باشترین جیهاد وتنی قسەی ڕاستو دەرخستنی ڕاستییە لای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار. پێشەوایانی ئیسلامیش بە ئەهلی بەیتیشەوە هەموویان ئەهلی عەزیمە بوون بەڵام زانایانی شیعە تەقییەیان گەورەکردووەو پلەو پایەیان بەرزکردۆتەوەو دەیان فەرمودەیان دایە پاڵ ئیمامەکانی ئەهلی بەیت لەسەر گەورەیی‌و پێویستی تەقیەکردن وەك "التقيه ديني ودين ابائي"، "لا إيمان لمن لا تقية له"، "تسعه أعشار

بەوپەڕی متمانەوە باوەڕم وایە کە هیچ ئوممەتێك نییە لە جیهاندا خۆی بەقەدەر شیعە زەلیلو ژێر دەست کردبێت بەهۆی قبوڵ کردنو بەرپاکردنی بیرۆکەی تەقییەوە، ئێستاش من بە دڵسۆزییەوە لەخوا دەپاڕێمەوەو چاو دەبڕمە ئەو ڕۆژەی شیعە خۆی دوورخاتەوە نەك تەنها لەکارکردن بە تەقییە بەڵکو تەنانەت لە بیرکردنەوەش لێی!!!

**تەقییە**

زۆر گرانە بەلامەوە مانای تەقییە بە تێگەیشتنێکی شیعەیانەی پوختو بەو شێوەیەی لە کتێبەکانی شیعەدا هاتووەو هەندێك لە زانایانی شیعەی ئیمامی بڕوایان پێی هەیەو پەیڕەوی دەکەن لەکاتی دیارنەمانی گەورەوە تا نووسینی ئەم دێڕانە بێنمە بەرچاوی خۆمو بەو شێوەیەی ئەوان بەبیرما بێت.

ناشزانم چۆن شیعە لافی ئەوە لێدەدەن کە لەلایەنگرانی ئیمامی حوسەینی سەروەری شەهیدانو پێشەوای شۆڕشگێڕانن لەکاتێکدا کە خۆیان باوەڕیان بە تەقییە هەیەو کاری پێدەکەنو دەیکەنە ڕێبازی خۆیان، هەروەها نازانم ئەم دژەیەكو لێك نەچواندنە سەیرە چییە لەو بیروباوەڕانەی شیعە کە پێشەوا ئاینییەکانیان بەدرێژایی چەند سەدە بۆیان دارشتوون: ئەوان لەلایەکەوە باوەڕیان وایە کە هەڵسوکەوتی پێشەوایانی ئەهلی بەیت بەڵگەیە بەسەریانەوە بەلام کاتێك دەگەنە مەسەلەی کارپێکردن بەتایبەت لەبەردەم لایەنە ئیسلامییەکانی تردا هەمووی دەکێشن بەتەختی دیواردا و بەتەقییە کاردەکەن.

---

دیننا في التقیة"، "انکم علی دین من کتمه أعزه الله ومن أذاعه أذله الله" (هەموو ئەمانە لە کتێبی الکافي دا هاتوون کە بڕواپێکراوترین سەرچاوەیانە).(وەرگێڕ)

هەندێك لە زانایانمان ویستویانە بەرگری لە تەقییە بکەن[1] بەڵام ئەوتەقییەی زانایانی شیعە باسی لێوەدەکەنو پێشەوا ئاینییەکانیان

---

[1] زانای گەورەی شیعە سەید محسن الامین لە کتێبی "شیعە لەنێوان ڕاستیو خەیاڵدا" لە ل١٦٨دا دەڵێت: "بەڵگە لەسەر تەقییە زۆری و دەقە، زۆری وا دەخوازێت کە مرۆڤ بۆی هەیە مەترسی لەخۆی دووربخاتەوە، ئەمەش هەموو داناکان لەسەری کۆکن وە هەروەها دەقەکانی قورئانو فەرمودەش هەمان شت دەسەلمێنن .لە قورئاندا هاتووە (لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللّهِ فِي شَيْءٍ إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللّهِ الْمَصِيرُ) (آل عمران : ٢٨ ).

ئیمامی ڕازیش لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: "تەقییە دروستە لەو شتەی پەیوەندی بە خۆشەویستیو دوژمنایەتییەوە هەیە، لەو شتەش کە پەیوەندی بە دەرخستنی ئاینەوە هەیە بەڵام ئەگەر زەرەرەکە دەگەڕایەوە سەر خەڵکی وەکو کوشتن ئەوا بە هیچ شێوەیەك دروست نییە".

لەمەزهەبی شافعیشدا تەقییە لەنێوان موسوڵمانو بێباوەڕدا دروستە ئەگەر بۆ پارێزگاری کردن لەخۆیەتی، تەقییە بۆ پاراستنی گیان دروستە، بەڵام ئایا بۆ پاراستنی سامانیش دروستە؟ بۆی هەیە چونکە پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمویت "من قتل دون مالە فهو شهید" کەواتە خواردنی ماڵی موسوڵمانان بە ناڕەوا وەك ڕشتنی خوێنیان بەناڕەوا حەرامە، واتای فەرمودەکە: هەرکەسێك لەپێناوی بەرگری لەماڵو سامانی خۆی بکوژرێ ئەوە شەهیدە.

کولەینی لە (أصول الكافي)دا لە ئیمامی باقر دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی "تەقییە بۆ ئەوە ڕێگەی پێدراوە کە ڕێگە لە خوێن ڕشتن بگرێت، جا ئەگەر مەسەلەکە گەیشتە خوێن ڕشتن ئەوکاتە تەقییە نامێنێت" نوسەر.

بیرمەندانی شیعە دەزانن بە هۆی تەقییەوە ناوبانگیان زڕاوەو بێ متمانە بوون لەناو موسوڵماناندا بۆیە بە هەرچی هێزی فکری خۆیان هەیە هەوڵ دەدەن پاساوی بۆ بێننەوەو ڕەگ و ڕیشەی بۆ بدۆزنەوەو شتەکە وا نیشان بدەن کە جیاوازی نییە لە نێوان سونەو شیعەدا لە بەکارهێنانی تەقییەدا (وەرگێڕ)

سەپاندوویانە بەسەریاندا بەو مانایە نەهاتووە کە ئەم زانایانە دەیانەوێت بەرگری لێ بکەن.

تەقییە بەلای شیعەوە ئەوەیە کە بەدەم شتێك بڵێیتو لەدڵتدا باوەڕت بە شتێکی تر بێت یان هەستی بەکارێکی پەرستشی لەبەردەم تاقمە ئیسلامییەکانی ترداو باوەڕت پێی نەبێت، دوایی بچی لەماڵەوە بەوشێوەیە ئەنجامی بدەیت کە باوەڕت پێیەتی.

پێش ئەوەی بەدرێژی باسی سەرهەڵدانی بیرۆکەی تەقییە بکەین بەو شێوەیەی کە دارێژراوەو ئەو هۆیانەی لە پشتی دانە پاڵ ئیمامەکانی شیعەوەن پێویستە کەمێك وردبینەوە لەهەڵسوکەوتی ئەو ئیمامەنەو لە ژیانی تایبەتیو گشتییان بۆ ئەوەی بزانین کە چەند دووربوون لە تەقییەو چەند ڕقیان لێبووە بۆ ئەوەی بزانین کە شتێکی لۆژیکی نییە ئیمامەکانی شیعە کار بەتەقییە نەکەن بەڵام فەرمان بە شوێنکەوتوانو لایەنگرانیان بدەن کاری پێ بکەن!

لەبەشی پێشوودا وێنەیەکی ڕوونمان باسکرد لە ژیانی ئیمامی عەلیو ڕووتی و ڕاشکاوی ئەو لە دەربڕینی ڕاستیداو ئامانەوێت لێرەدا دووپاتی بکەینەوە.

سەبارەت بەحەسەنی کوڕی عەلیش کە پێشەوای دووەمی شیعەکانە[1] دوورترین کەس بوو لە تەقییەو فریودانی خەڵکی، ئاشتبوونەوەکەشی لەگەڵ معاویەدا شایەتە لەسەر ئەوە، ئاشتبوونەوەی حەسەن کارێکی شۆڕشگێڕانەو

---

[1] ئالوئاڵی ئەم کۆمەڵە هەڵبژاردەیە لە ئەهلی بەیتی پەیامبەر بە پێشەوایانی شیعە لەڕووی مەجازەوەیە ئەگینا هەموو موسوڵمانان ڕێز لە ئەهلی بەیتی پەیامبەر دەگرنو بە پێشەنگی خۆیانیان دەزانن. نووسەر.

دەرچوون بوو لەو ڕا گشتییەی بەدەورووبەریدا بوو لەو سەردەمەدا، ئەو ڕووبەڕووی نەیارییەکی ئاشکرا بوو لە لایەن زۆرێك لە شوێنکەوتوانی باوکییەوە کە نەیاندەویست لەگەڵ معاویەدا ڕێککەوتن‌و ئاشتبوونەوە بکرێت، تەنانەت سولەیمانی کوڕی صەرد کە یەکێك بوو لەگەورە لایەنگرانی عەلی بەم شێوەیە لەگەڵ ئیمامی حەسەندا دوا: "سلاوت لێبێت ئەی زەلیلکەری بڕواداران".

نەیارانی ئاشتی کەسانی بەهێزو بەتواناو بەدەسەلات بوون‌و ئیمامی حەسەن نارەحەتی زۆری چەشت بەدەستیانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بوێرانەو پاڵەوانانە لەڕووی ئەو هەموو بەرهەڵستکارانەدا وەستاو کارەکەی ئەنجامدا.

ئایا ئەگەر تەقییە جێگای هەبوایە لەدڵی حەسەندا ئەم ئاشتییەی لەگەڵ معاویەدا دەکرد یان دەچوو بەدەم داواکاری ئەوانەی کە پشتیان دەگرت‌و هانیان دەدا لەگەڵ معاویەدا بجەنگێت تا چۆکی پێدابداو ناچاری بکات بەیعەتی بداتێ وەکو خەلیفەی ڕەوای مسوڵمانان؟[1]

---

[1] ئەو گرێبەندی ئاشتییەی ئیمامی حەسەن بەستی لەگەڵ معاویەدا چەندین دەلالەتی هەیە لەوانە:

أـ بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە مەسەلەی ئیمامەت لەلایەن خواوە نییەو بەدەق نییەو خوا ئیمام (خەلیفە) دیاری ناکات بەلکو بەجێهێڵراوە بۆ مسوڵمانان خۆیان خەلیفە دیاری بکەن، چونکە ئەگەر وانەبوایەو بەو شێوەیە بوایە کە شیعە دەیڵێت کە گوایە ئیمامەت وەکو پەیامبەرایەتی وایە دەبێ خوا دیاری بکات ئیمامی حەسەن بەهیچ شێوەیەك بۆی نەبوو دەستی لێهەڵبگرێت بەتایبەت ئەگەر ئەوەش بزانین کە حەسەن ئەو کاتە عێراق‌و حیجازو ئێران‌و یەمەنی لە پشت بووە لە معاویەش بەهێزتر بوو، وە موسوڵمانان ئەویان بە خەلیفەی ڕاستەقینە دەزانی.

ب ـ بەلگەیە لەسەر ڕاستی‌و ڕەوایی خیلافەتی معاویە لەڕووی شەرعەوە چونکە بەبەیعەتی ئیمامی حەسەن زیاد لە ٩٠٪ی مسوڵمانان بەیعەتیان بە معاویەدا جگە لەخەواریجەکان کە لەسەدا

دوای ئەوە ڕۆڵی ئیمامی حوسەین دێت کە دژی یەزیدی کوڕی معاویە ڕاپەڕی‌و بەگوێی ئەو کەسانەی نەکرد کە ئامۆژگارییان کرد لە مەدینە بمێنێتەوەو نەچێت بۆ عێراق، هەر کەسێکیش بە دواداچوونی شۆڕشەکەی حوسەین بکات بەڕوونی بۆی دەردەکەوێت کە شەهیدبوونی ئیمام حوسەین‌و کەسوکارەکەی‌و هاوەڵانی‌و بەدیل گیرانی ژن‌و منداڵەکانی پێش

---

پێنجی هەموو مسوڵمانان نەدەبوون، وە بەیعەتی حەسەن کە شیعە بە ئیمام‌و پێشەواو مەعسومی دەزانن بەڵگەیە لەسەریان.

ج ـ بەڵگەیە لەسەر ڕەوایی ئیمامەت (خیلافەت)ی کەسێك کە لەڕووی پلەو پایەی ئاینییەوە لەو باشتر هەبێت ئەمەش بیرو باوەڕی شیعە زەیدییەکانەو ئیمامی حەسەن بە کردەوە سەلماندی(جواز امامة المفضول مع وجود الأفضل).

دـ گرنگی یەکڕیزی موسوڵمانان: دابەزینی حەسەن لە خیلافەت بۆ معاویەو بەیعەت پێدانی بەڵگەیە لەسەر گرنگی یەکخستنی ڕیزی مسوڵمانان تەنانەت ئەگەر لەسەر حیسابی دەست هەڵگرتنی خەڵکانێك لەبەرژەوەندی خۆیان بێت.

هـ نائومێدی‌و بێ متمانەیی حەسەن بە لەشکری عێراق‌و لایەنگرانی باوکی، هەرکەسێك وتەکانی ئیمامی عەلی بخوێنێتەوە دەربارەی لە شکرەکەی بۆی دەردەکەوێت چەند ئازاری دڵیان داوەو چەند نارەحەتیان کردووەو ماندویان کردووەو چەند بە بیانووبوون‌و بێ گوێ بوون، دەست هەڵگرتنی ئیمامی حەسەنیش لە خیلافەت بۆ معاویەو بەیعەت پێدانی بەڵگەیەکی ترە لەسەر لاری‌و ناڕاستی ئەو لەشکرەی ئیمامی عەلی پشتی پێ بەستبوون.

و ـ لەم هەڵوێستەی ئیمامی حەسەن‌و لەسەرجەم پێشنیارەکانی بۆ باوکی دەردەکەوێت کە حەسەن لە سیاسەتی باوکی ڕازی نەبوو بۆیە لەسەر هەمان سیاسەت بەردەوام نەبوو.

ی ـ پێش هەموو ئەمانەش بەڵگەیە لەسەر پەیامبەرایەتی موحەممەد (ﷺ) چونکە لەکاتێکدا کە حەسەن هێشتا منداڵ بووەو هیچێك لە ئارادا نەبووە پەیامبەر (ﷺ) فەرمویەتی "ئەم کوڕەی من سەرورە خوا نێوانی دوو تایفەی لە مسوڵمانانی پێ چاك دەکاتەوە" البخاري/ فضائل الصحابة ٩٤/٧.(وەرگێڕ)

دەستپێکردنی شەڕەکە بەرجەستە بووبوو لەبەرچاوی ئیمام حوسەینداو دڵنیابوو لەدەرەنجامی شەڕەکە بۆیە لەشەوی دەهەمی موحەڕەمدا هاوەڵانی کۆکردەوەو پێی وتن سبەینێ شەڕ دەست پێدەکاتەو خۆی بەدڵنیاییی دەکوژرێ، لەبەرئەوە سەربەستی کردن‌وئازادی کردن لەو بەڵێنەی لە گەردەنیاندایەو داوای لێکردن هەر کەسێکیان دەیەوێت بابە تاریکی شەو مەیدانی شەڕ بەجێ بێلێتەو پێی وتن: "تاریکی شەو بەهەل بگرن‌و بڕۆن بەدوای چارەنووسی خۆتاندا".

ئەوەی ڕۆیشت ڕۆیشت، ئەوەشی مایەوە مایەوە بۆ ئەوەی ناوی خۆی لە لیستی نەمراندا تۆماربکات.

جا ئایا لە شۆڕشێکی ئاوهادا هیچ شوێنەوارێك بۆ تەقییە یا هەرچییەك پەیوەندی بە تەقییەوە هەیە دەبینرێت؟ پاشان ڕۆڵی ئیمامی عەلی کوڕی حوسەینی ناسراو بە سەجاد[1] دێت کە بەشداری کارەساتی کەربەلای کرد بەلاّم لەبەر نەخۆشی بەشداری شەڕەکەی نەکردو لەجێگەدا کەوتبوو تا دوای کوژرانی باوکی‌و یارانی بەدیل گیراو بە کۆتکراوی لەکەربەلاوە برا بۆ شام.

گومانی تێدا نییە ئەو وێنە غەمباوییە پڕ لە خوێن‌و فرمێسکەی ئیمامی سەججاد بینی لەڕۆژی عاشووراداو ئەو زەلیلی‌و سوکایەتی پێکردنەی چەشتی لەکاتی گواستنەوەیان بەدیلی لەکەربەلاوە بۆ دیمەشق شەوو ڕۆژ لەبەر چاویدا بوو، ئەو ئیمامە ڕووی کردە عیبادەت‌و خوا پەرستی‌و بەشەوو ڕۆژ ئەوەندە دەگریا ناوبانگی بە "بکاء"دەرکرد[2]

---

[1] (زین العابدین)یشی پی دەوترێت.

[2] بکاء: بەکەسێك دەوترێت زۆر بگری.

شتێکی سروشتی بوو ئەو غەمە هەمیشەییەی دڵی ئیمامی دەگوشی لە قسەو وتارەکانیدا لەدەستەواژەگەلێکدا ڕەنگ بداتەوە کە خیلافەتی ئەمەوی کە تا ئەو کاتە جنێویان بە ئیمامی عەلی دەدا لەسەر مینبەرەکان لەدوای نوێژەکاندا لەبن بێنێت[1].

ئیمامی سەججاد پەنجاو چوار نزاو پاڕانەوەی بۆ بەجێ هێشتووین لە کتێبێکدا کۆکراوەتەوە بەناوی صەحیفەی سەججادی.

ئەوەی ئەم نزایانە بخوێنێتەوە بەدڵنیاییەوە دەزانێت کە تەقییە دوورترین شت بووە لەدڵی سەججادەوە، ئەم ئیمامە لە نزاکانیدا ئەم خیلافەتە ئەمەوییە دەسەڵاتدارەی هەڵتەکاندووەو لە بنی دەرهێناوە.

ئەوانە بەڕاستی نزاگەلێکی شۆڕشگێڕانەن لەسەر زاری ئیمامێك هاتۆتەدەر کە گەورەترین شۆڕشی ئیسلامی بەچاوی خۆی بینیوە، ئەگەر ئەو نەیتوانیوە بەخوێنی خۆی بەشداری ئەو شۆڕشە بکات ئەوەتا زمانی وەکو شمشێری تیژ بەکاردەهێنێت. جارێکی تر ئیمامی سەججاد دەبینین لەو کاتەی بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێتەوەو خەڵکی لەبەرئەو ڕێزو خۆشەویستییەی هەیبوو لەدڵیاندا ڕێگەی بۆ چۆڵ دەکەن بەڵام هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك کە خەلیفەی سەردەم بوو لەناو خەڵکییەکەدایەو کەس گوێی ناداتێ‌و ئیمامیش خەلیفە دەبینێ‌و ئاوڕی لێناداتەوە، خەلیفە ناڕەحەت دەبێت بەو هەڵوێستەی لەخەڵکی‌و لە ئیمامی دەبینێت،دەپرسێت:

ئەمە کێیە؟ مەبەستی ئیمامی سەججاد بوو.

---

[1] مەسەلەی جنێو بە ئیمامی عەلی لەسەر مینبەرەکان هەڵبەستراوی ڕاوی‌و زانایانی شیعەیە بۆ زیاتر ڕق هەڵساندنی شیعەکان‌و بۆ بزواندنی هەستی مسوڵمانان. (وەرگێڕ)

ویستی خوا وا بوو لەوکاتەدا فەرەزدەقی شاعیر لەوێ دەبێتو ئەو دیمەنە دەبینێت بۆیە بە شیعر دەڵێت:

ئەو قسەیەی کردت: ئەمە کێیە، هیچ زیانێك بەو ناگەیەنێت،
ئەوەی تۆ نایناسی عەرەبو عەجەم هەموو دەیناسن
ئەمە کوڕی باشترین بەندەکانی خوایە
ئەمە ئەو پێشەوا پارێزکارە پاکە دیارەیە.
ئەگەر (روکن) بزانێت کێیە هاتووە ماچی بکات
ئەو جێ پێی ئەوی ماچ دەکرد.
ئەو لەشەرما چاو دادەخات
خەڵکیش لەبەر ڕێزو سامی چاو لە ئاستی دادەخەنو
لەکاتی زەردەخەنەیدا نەبێت قسەی لەگەڵ ناکەن.

ئەوەی وردبێتەوە لەم ڕووبەڕووبوونەوە وشکەی نێوان ئیمامو خەلیفەی دەسەڵاتدار کە خەلیفەی توڕە کرد دڵنیا دەبێت لەوەی کە تەقییەو هەرچی پەیوەندی بە تەقییەوە هەیە هیچ ڕێگایەکی بۆ ناو دڵی ئیمام نەدۆزیوەتەوە[1]

[1] ئەم ڕووداوە چەندین دەلالەتی گەورەی تری هەیە لەوانە:

یەکەم: خۆشەویستیو ڕێزی ئەهلی بەیت لەلای هەموو مسوڵمانان هەیەو بەڕادەیەکە کە لەپاڵ کەسێکی بێدەسەڵاتی وەکو ئیمام زین العابدین (سەجاد) کە ڕۆژانە خەڵکی دەیبینن کەس ئاوڕ لە خەلیفە نەداتەوە کە فەرمانڕەوای گەورەترین دەوڵەتی ئەو سەردەمە بووە و لەشامەوە هاتبوو، ئەمە ئەو قسەیەی شیعە ڕەت دەکاتەوە کە دەڵێن تەنها خۆیان ئەهلی بەیتیان خۆش دەوێت یان لایەنگرییان لێدەکەن.

دووەم: هەرلەمەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەو قسەیەی شیعە دەیڵێت کە گوایە لەماوەی فەرمانڕەوایی ئەمەوییەکاندا لەسەر مینبەرەکان جنێو بە عەلیو ئەهلی بەیتەکەی دراوە درۆو هەڵبەستراوە

پاشان ڕۆڵی ئیمامی باقرو ئیمام جەعفەری صادقی کوڕی دێت کە بنیاتنەری ئەو قوتابخانە فیقهییەن کە بە فیقهی جەعفەری ناسراوەو هەردوو ئیمام لە مزگەوتی پەیامبەر لە مەدینە وانەیان دەووتەوەو بۆچوونە فیقهییەکانی خۆیانیان ڕادەگەیاندو مەزهەبی ئەهلی بەیتیان بەبێ هیچ ترس‌و بیمێك بڵاودەکردەوە[1].

ئیمامی باقر هاوچەرخی خیلافەتی ئەمەوی‌و صادقیش هی کۆتایی سەردەمی خیلافەتی ئەمەوی‌و سەرەتای خیلافەتی عەبباسی بوون، وە هەردوو خیلافەتەکەش ناکۆك بوون لەگەڵ هەردوو ئیمامەکەداو ڕایان لە قوتابخانەی فیقهی ئەهلی بەیت نەبوو، بەڵام هەردوو ئیمام پەیامی خۆیان گەیاندو زاناو شەرعناسێکی زۆر لەسەر دەستیان پێگەیشتن، بەو شێوەیە دەبینین هەردوو ئیمام ئەرکی سەرشانی خۆیانیان بەجێ دەگەیاندو بەبێ ئەوەی هیچ ترسێکی ئەو دەسەڵاتەیانە هەبێت کە ناکۆك بوون لەگەڵیدا.

---

چونکە خەڵکانێك ئەوە ڕێزو خۆشەویستییان بێت بۆ ئەهلی بەیت هەرگیز ڕازی نابن لەسەر مینبەر جنێویان پێ بدرێتە، هەر فەرمانڕەوایەکیش کەسێك سیاسەتی هەبێت ڕقی خەڵکی لەخۆی هەڵناسێنێت بەجنێودان بەکەسانێك کە خۆشەویستی خەڵك بن.

سێیەم: گەورەیی ئەو خەلیفەیە نیشان دەدات لەگەڵ کۆمەڵی مسوڵمانانندا بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێتەوە پێ ئەوەی دارو دەستەکەی دڕ بەخەڵکی بدەن یا دواتر هەڵوێستێکی نێگەتیڤ بنوێنێت لە ئاستی خەڵکی یان بۆ ئەو کەسە.(وەرگێڕ)

[1] لەڕاستیدا شتێك نییە پێی بوترێت مەزهەبی ئەهلی بەیت چونکە ئەگەر بێتو ئەو ڕیوایەتانەی دراونەتە پاڵ ئەو دوو ئیمامە لەمەسەلەی دەستکاری قورئان‌و جنێو بە هاوەڵانی پەیامبەرو زیادەڕۆیی لە ئیمامەکان‌و تەقیەو بەداءو موتعە لەو مەزهەبە دەربهێنێت کە لە دانانی دوای ئەوانە هیچ جیاوازییەکی لە سوننە نامێنێتەوە.(وەرگێڕ)

سەیریش لەوەدایە کە هەندێك لە ڕاوییەکانی شیعە هەندێك فەرمودەیان لە ئیمامی صادقەوە گێڕاوەتەوە لەسەر پێویستیو واجب بوونی تەقییەکردن لەسەر شیعە لەکاتێکدا کە نەخۆی ونە شیعەکەی پێویستیان پێی نەبوو، ئەو لە مزگەوتی پەیامبەردا وانەی دەووتەوەو بەهەزارەها شاگردو گوێگر دەوریان لێدابوون.

خۆزگە دەمزانی قوتابخانەیەکی ئاینی بەو گەورەییەو بەو هەموو شاگردو خوێندکارەوە چۆن لەسەر تەقییە بنیات دەنرێتو ئیمامی صادق چ تەقییەیەکی بەکارهێناوە لەدروستکردنی ئەو قوتابخانە فیقهییەی کە بناغەکەی لەبەرچاوی موسوڵمانانو بە شێوەیەکی ئاشکرا دادەنا لەکاتێکدا کە ئەوانەی ئامادەی وانەکانی دەبوون دۆستو دوژمنو دڵسۆزو ناحەزی تێدا بوو؟

ئیمام موسای کوڕی جەعفەر "موسای کازم" لەگەڵ خەلیفە هارونە ڕەشید کۆك نەبوو و چەندین ساڵی لە زیندانیدا بەسەربرد لەبەغدا، جا ئەگەر موسای کازم ڕێگای تەقییەی بگرتایەتە بەرو فێڵی لە خەلیفە بکردایە کە ئامۆزای بوو ئەوەی بەسەردا نەدەهات کە بەسەریدا هات.

کاتێکیش خیلافەت گەیشتە دەستی مەئمونی عەبباسی ئیمامی عەلی کوڕی موسای ناسراو بە عەلی ڕەزا "علي الرضا" کردە جێنشینی خۆی، عەلی ڕەزاش وەکو دەزانین ئیمامی هەشتەمی شیعەیەو لەسەردەمی مەئمونندا کۆچی دوایی کردو خیلافەت لە عەبباسییەکاندا بەردەوام بوو. دوای مردنی ئیمام ڕەزا مەئمون کچێکی خۆی کە ناوی (أم الفضل) بوو دای بە موحەممەدی جەوادی کوڕی ئیمامی ڕەزا بۆ ئەوەی پەیوەندیو خزمایەتی نێوان خەلیفەی عەبباسیو خانەوادەی عەلەوی نەپچڕێنێت.

ئەم دوو ئیمامەش، باوك‌و كوڕ یەكێكیان جێنشینی خەلیفە بوو وە دووەمیان زاوای بوو پێویستیان بەوە نەبوو ئیش بە تەقییە بكەن‌و داوایان لە شیعە نەكردووە تەقییە بكەنە ڕێگایەك بۆ گەیشتنە ئامانجەكانیان.

دوای ئیمامی جەواد ڕۆڵی ئیمامی دەو یازدە (عەلی هادی‌و حەسەنی عەسكەری) دێت كە دانیشتووی پایتەختی خیلافەت بوون‌و هاوچەرخی موتەوەكیل‌و موعتەسیم بوون ماڵی هەردوو ئیمامەكە بوو بووە مەزارگەی شیعەكان‌و كاروباری شیعەكانیان ڕادەپەڕاندو مەزهەبەكەیان بڵاودەكردەوە، هەركەسێكیش بەدوای ژیانی ئەم دوو ئیمامەدا بڕوات دەزانێت كە ئەمانیش دوورترین كەس بوون لە تەقییەو لەگەڵ ئەوەی كە پیاوانی خەلیفە چاودێریان دەكردن‌و چاودێری جموجوڵەكانیان‌و بانگەشەكردنیان بۆ مەزهەبی ئەهلی بەیت كە نەیاری خیلافەتی عەبباسییە دەكردن، ئەم دوو ئیمامە گوێیان پێنەدەداو ڕێگای ڕاستیان گرتبووەبەر لە گەیاندنی پەیامەكانیاندا.

ئەم كورتەیەمان لە ژیانی پێشەوایانی ئەهلی بەیت هێنایەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنین كە بیرۆكەی تەقییە بەو تێگەیشتنە شیعەییە تایبەتە لەناوەڕاستەكانی سەدەی چوارەمی كۆچیدا دەركەوت، ئەویش دوای ڕاگەیاندنی دیارنەمانی ئیمامەی دوازدەهەم‌و لە سەرەتای سەرهەڵدانی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوع‌و كاتێك كە سەركدە مەزهەبی‌و سیاسی‌و فكرییە شیعەكان ویستیان ڕێگەی كاركردنی نهێنی بگرنە بەر بۆ لەناوبردنی خیلافەتی عەبباسی‌و ڕاگەیاندنی ناڕەوایی ئەو خیلافەتە، ئەوكات شتێكی سروشتی بوو كە بیرۆكەی لایەنگری‌و هەواداری بۆ عەلی‌و خانەوادەكەی ڕەگەزێكی نوێی بخرێتە سەر بۆ ئەوەی پشتیوانی لەو بیرۆكەیە بكات، ئەویش زیادكردنی بیرۆكەی دەقی خوایی بوو بۆ مەسەلەی خیلافەت‌و لەو ڕۆژەوە پانتاییەكی گەورەی لە كرۆكی بیروباوەڕی شیعەدا داگیركردووە.

دەتوانین بڵێین کاری مەزهەبی نهێنی لەوکاتەدا دەستی پێکرد کە تەقییە لە شێوەی ئەرکێکی ئاینیدا دەرکەوت کە دەبێت ئەو کەسەی بۆچوونێکی ئاینی جیای هەیەو ناوێرێت دەری ببڕێت لەبەردەم دەسەڵاتدا یان لەبەردەم زۆرینەدا، لەبەرئەوە تەقییە ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە پشتگیری کردنی ئەو سەرکردە مەزهەبییە شیعانەی دوای دیارنەمانی گەورە پەیدابوون.

بەو تەقییەیە ئەو سەرکردە مەزهەبییانە بەردەوام بوون لە چالاکییەکانیاندا دوور لەچاوانی دەسەڵاتو ئەو سەروەتو سامانەش کە لە شیعەکان کۆدەکرایەوە پێیان دەگەیشت، بەو شێوەیە تەقییە جێی بوویەوە لەناو فیکری شیعیو کاری شیعیدا بە درێژایی ئەم چەند سەدەیەو سروشتێکی غەمناکی دروست کرد لە پێکهاتەی کەسایەتی شیعەدا.

گومانیشم نییە لەوەی کە تەقییە یەکێك بوو لە گرنگترین هۆیەکانی دواکەوتنی کۆمەڵگە شیعییەکان لەڕووی فیکریو کۆمەڵایەتیو سیاسییەوە، ئەم ڕەوشتە چووەتە ناو خوێنیانو ڕێگەیان لێدەگرێت بەو شێوەیەی کە هەن دەرکەون لە ترسا یان لە شەرما، تەنانەت لە ئێراندا، ئەو وڵاتە شیعەیەی کە ڕژێم تێیدا شیعەیەکی پوخت بوو[1]، گەلی ئێران ڕێگای تەقییەیان دەگرتەبەر وەکو ئەرکێکی ئایینی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی زەبرو زەنگو ستەمی دەسەڵات، لەڕوو شتێکیان دەردەبڕی پێچەوانەی ئەوەی لەدڵیاندا بوو، بەو شێوەیە گەلی ئێرانی شیعە وەکو هەموو شیعەکانی تری دونیا بە دووفاقەیی کەسایەتی جیا دەکرانەوە[2]

---

[1] مەبەستی سەردەمی شایە.(وەرگێڕ)

[2] کاریگەری سلبی تەقییە لەسەر شیعەکانی عێراق زیاترو مەترسیدارتر بوو، ئەوەبوو هەموویان لەسەرەوە بەعسی بوونو هەموو فەرمانێکی بەعسیان جێبەجێ دەکرد لە کوشتنو بڕینو ستەمو شەڕ لەگەڵ کوردو ئێرانداو جینایەتی گەورە گەورەیان ئەنجامدەدا لەژێر دروشمی تەقییەدا.(وەرگێڕ)

گومانم نییه لەوەی کە تەقییە (خوا لەناوی بەرێ) ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لەدوور ڕاگرتنی شیعە لەتاقمە ئیسلامییەکانی ترو هۆکاری تۆمەتبارکردنی شیعەیە بە شتگەلێك کە ئەوان لێی دوورن[1]

بەرگری کردن لەو تۆمەتانە بووەتە کارێکی زۆر قورس بەهۆی ناسرانی شیعە بەتەقییەو تۆمەتبارکردنیان بە شاردنەوەی ڕاستی لە هەموو شتێکدا، ئەوەی کە ئازاری دڵم دەدا ئەوەیە کە تەقییەکردن لە ئاستی خەڵکە ڕەشۆکەکەدا نەماوە بەڵکو لەدڵی سەرکردەکانی مەزهەبیشدا جێگیربووە، هەر ئەمەش وای لێکردووین داوای ڕزگاربوون بکەین لەو سەرکردانە.

کاتێك سەرکردەی ئاینی ڕازی دەبێت ڕێگەی فریودان بگرێتەبەر لەگەڵ خەڵکیدا لە گفتارو کرداریدا بەناوی تەقییەوە ئیتر چۆن چاوەڕوانی چاکبوون دەکرێت لە خەڵکە ڕەشۆکەکە؟

لەوکاتەی کە ئەم دێڕانە دەنووسم و لەسەردەمی چوونە سەرمانگ و لەم سەردەمەی کە ئازادی بیرکردنەوەو ڕادەربڕین پیرۆزەو بەرگری لەناواخنی مرۆڤو بیرو بۆچوونەکانی دەکات چ باش بێت یان خراپ، کۆمەڵگەی شیعی بە پێشەوایەتی سەرکردە مەزهەبییەکانی بەداخراوی بەسەرخۆیدا دەژیو بە ڕواڵەت شتێك دەردەبڕنو لەناواخنیشەوە شتی تر دەشارنەوە.

لەو باوەڕدانیم یەك سەرکردەی ئاینی شیعی هەبێت لە سەرتاسەری دونیادا بتوانێت ڕای خۆی دەربڕێت تەنانەت لەزۆرشت لەوانەی کە داهێنراون لەترسی ئەو جەماوەرەی کە خۆیان ڕایان هێناون لەسەر ئەو شتە

---

[1] ئەو شتانەی دراونەتە پاڵ شیعە هیچی بوختان نییە تۆمەتی هەڵبەستراو نییە بەڵکو هەمووی لەوسەرچاوە باوەڕپێکراوەکانیاندا هاتووە. (وەرگێڕ)

داهێنراوانەی کە بوونەتە بەشێك لە پێکهاتەیان، بۆ نموونە شایەتمانی سێهەم (أشهد أن عليا ولي الله، أشهد أن عليا حجة الله) کە هەموو زانایانی مەزهەبی شیعی کۆکن لەسەر ئەوەی کە داهێنراوەو لەسەردەمی پەیامبەرو یارانیو تەنانەت لەسەردەمی ئیمامەی عەلیو ئیمامەکانی تری ئەهلی بەیتدا نەزانرابوو وە هەموو زانایان کۆکن لەسەرئەوەی کە هەرکەسێك بەو مەبەستەوە بیلێت کە ئەمە شتێکە لە شەریعەتی ئیسلامدا هاتووە ئەو کارێکی حەرامو داهێنراوی کردووە، لەگەڵ ئەو هەمووەدا هیچ کەسێکیان زاتی ئەوەیان نییە ئاماژەی پێبدەن نە بە قسەو نە بەنووسین.

هەروەها یەك پێشەوای ئایینی شیعە نییە بتوانێت حەقیقەتی ململانێی نێوان شیعەو سوننە بەڕاشکاوی باس بکاتو کار بۆ نەهێشتنی بکات.

هەروەکو وتمان گەورەترین ڕەگەزی ناکۆکی نێوان شیعەو سوننە بریندارکردنو قسە وتنی شیعەیە بە خەلیفە ڕاشیدەکانو یارانو هەندێك لە خێزانەکانی پەیامبەر (ﷺ) وە ئەگەر ئەم بەربەستە لانەبرێت لە لیستی ناکۆکییەکاندا ئەو ناکۆکییە بەرەگ داکوتاوی بۆ هەتاهەتایە دەمێنێتەوە لەنێوانیاندا، نە کۆنگرە ئیسلامییەکان سوودیان دەبێت وە نە قسەی ڕازێنراوەو نە وتاری چاکسازانە بەری لێشاوی ئەم ڕقو قینەیە دەگرن کە بەم بریندارکردنو تۆمەتبارکردنە دڵو هۆشو کتێبی شیعەکانی پێ ئاخنراوەو پڕکراوە.

لێرەشدا زانایانی شیعە ڕێگەی تەقییە دەگرنە بەر بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەو ئەو جنێو پێدانو قسە پێوتنە دەدەنە پاڵ نەزانەکانی شیعە لەکاتێکدا کە کتێبی ڕاویو فەرمودەناسو زاناو فەقیهەکانی شیعەی دوازدە ئیمامی ئەم شتانەی باسکردووەو لەوانەوە چووەتە دڵو سەر زمانی خەڵکە ڕەشۆکەکە، جا ئایا گلەیی دەکەوێتە سەر زانایان یان خەڵکەکە؟

لەو باوەڕەدانیم کە یەك پێشەوای ئاینیی شیعە لەکۆنو نوێدا هەڵسابێت بە بێژانی کتێبە شیعەییەکان لەو ڕیوایەتانەی بەدرۆو بە بوختان دراونەتە پاڵ پێشەوایانی ئەهلی بەیت لە بریندارکردنی خەلیفەکانو ئەو ڕیوایەتانەی کە ناکۆکن لەگەڵ ژیریداو ناگونجێن لەلایەن ئەو پێشەوایانەوە وترابێتن، وە لەگەڵ ئەوەی کەهەموو زانایانی مەزهەبی شیعی کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەو کتێبانەی پشتیان پێدەبەستن لەمەسەلە تایبەتییەکانی مەزهەبدا ڕیوایەتی ڕاستو هەڵبەستراوی تێدایەو دان بەوەدا دەنێن کە ئەم کتێبانەی هەموو جۆرە ڕیوایەتێکیان لەخۆیان گرتووە لەڕەواو ناڕەوا، لەگەڵ ئەوەشدا ڕانادەنە مەیدان بۆ پاکسازی کردنی ئەم کتێبانە لەو جۆرە ڕیوایەتانە.

ئەگەر پێشەوایانی شیعە ئازایەتییان تێدابوایەو باوەڕیان بەو بەرپرسیارێتییە هەبوایە کە خراوەتە ئەستۆیان لە نەهێشتنی ناکۆکییەکان ئەو بەرپرسیارێتییەیانە دەخستە ئەستۆی خۆیانو کاریان بۆلابردنی ئەو ڕیوایەتانە دەکرد لەناو کتێبەکانو لە مێشکی شیعەکانداو لاپەڕەیەکی نوێیان هەڵدەدایەوە لەمێژووی ئیسلامو خێرو خۆشی باڵی دەکێشا بەسەر سەرجەم مسوڵمانانندا.

بەڵام هەڵهاتن لەو بەرپرسیارێتییەو لکاندنی بەخەڵکە ڕەشۆکەکەوەبۆ ڕاکردن لەڕاستیو واقیع لەژێر پەردەی ڕەوایی تەقییەدا، ئەمە ئەو پەڕی جێی داخو خەفەتە کاتێك کە ئەم دێڕانە دەنووسم هەرزارەها شیعەی ئیمامی کار بە تەقییە دەکەن لە کارە ئاینییەکانیاندا، بەردەتوێژی حوسەینی لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرن. لەمزگەوتەکانیاندا سوجدەی لەسەر دەبەنو لەمزگەوتەکانی موسوڵمانانی تردا دەیشارنەوە، زۆرێکیان لەمزگەوتەکانی سوننەدا لەڕووی تەقییەوە نوێژ لە پشتی پێش نوێژەکانەوە دەکەنو کاتێك

دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە نوێژەکانیان دووبارە دەکەنەوە بە پشت بەستن بەو ریوایەتانەی دراونەتە پاڵ پێشەوایانی ئەهلی بەیت لەتەقییەداو زانایانی شیعە فەتوای پێدەدەن.

لەبەر هەموو ئەمانە هانی شیعەکان دەدەین کە پەیڕەوی لەم ڕاستکردنەوەی خوارەوە بکەن:

## ڕاستکردنەوە:

پێویستە لەسەر شیعەکان لەسەرتاسەری دونیادا بەرامبەر بە تەقییە هەڵوێستی ئەو مرۆڤە ڕێزدارە وەرگرن کە ڕێز لە خۆیو بیروباوەڕەکەی دەگرێتوخاوەنی پیاوەتی و جوامێرین کەبەشێکن لەڕەوشتی بەرزو پەسەندکراوو زۆر بیر لەو شوێنەوارە دەروونییانە بکەنەوە کە ئەم دووفاقەییە لەکەسایەتییداو ئەو پەشێوی وناکۆکییەی نێوان وتەو کردار دروستی دەکات کە پێچەوانەیە لەگەڵ ڕاستگۆییداو دژە لەگەڵ سیفەتەکانی موسوڵمانی دڵسۆز، هەر قسەیەك یان کردەوەیەك لە مرۆڤەوە دەردەچێت کە فێڵو ڕیایی تێدا بێت بێ سێو دوو پێچەوانەی لۆژیكو کاری کۆمەڵو زۆرینەیە، بۆیە پێویستە لەسەر موسوڵمانی ڕاستەقینە دەست هەڵگرێت لەو قسەو کردەوانەی کۆمەڵگەی ئیسلامی پەسەندی ناکات چ بەنهێنی بێت یان ئاشکراو خۆی لەوە بەرزتر بگرێت کە بەشێوەی مرۆڤی فێڵبازی ڕیاباز دەرکەوێت.

پێویستە لەسەر جەماوەری شیعە بەتایبەت ڕۆشنبیرەکانیان لە پێشەوا مەزهەبییەکانیان بپێچنەوەو لێپرسینەوەیەکی سەختیان لەگەڵدا بکەن لەبەرئەوەی کەبەو ڕێگە دژوارەیاندا بردوون لەبەر هەندێك مەبەستی تایبەتی خۆیان.

پێویستە لەسەر شیعە ئەو بنەما ئەخلاقییە بێننە بەرچاوی خۆیان کە ئیسلام فەرزی کردووە بەسەر مسوڵمانانادا ئەویش ئەوەیە کە موسوڵمان فێڵبازو ماستاوچی نییەو لە قسەو کردەوەیدا جگە لەڕاستی هیچی تر ناکاتو ڕاستی دەڵێت ئەگەر لەسەر خۆیشی بێتو کردەوەی چاك لەهەموو شوێنێکدا چاکەو هی خراپ لەهەموو شوێنێکدا خراپە.

وە هەروەها دەبێ بزانن کە ئەوەی دراوەتە پاڵ ئیمام جەعفەری صادق کە گوایە دەڵێت "تەقیە ئاینی منو باپیرانمە"

جگە لەدرۆو بوختانو هەڵبەستن بەسەر زمانی ئەو پێشەوا مەزنەوە هیچی تر نییە.

# ئیمامی مەهدی[1]

---

[1] سەیرم لە هیچ شتێك نایەت ئەوەندەی ئەوەی کە سەیرم لە شیعە دێت لە مەسەلەی مەهدیدا:
شتێك کە بە هەموو پێوەرێکی ژیری و لۆژیکی و مێژوویی ئەفسانەیی وێبەنەماو چنراوی خەیاڵ بێت کەچی لە گەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو زاناو ڕۆشنبیرە شیعانە باوەڕیان پێی هەبێت
سەرەڕای ئەوەی کە شیعە ژیری (عەقڵ) بە یەکێك لە سەرچاوەکانی هەڵێنجانی حوکمە شەرعییەکان دەزانن کەچی لە مەسەلە گەورەکانی ئاینندا کە بیروباوەڕە زۆرێك لە شتەکانیان لەسەر ئەفسانەو شتی نالۆژیکی بنیات ناوە ،نموونەی بەرجەستەش مەسەلەی ئیمامی مەهدییە کە باوەڕیان وایە لە دایك بووەو لە دوو یان پێنج ساڵیدا لە سامەڕا دیارنەماوەو غەیب بووە !. هەر کەسێك بێلایەنانە چیرۆکی لە دایك بوونی بخوێنێتەوە دەزانێ کە چنراوی خەیاڵە ،هەر لەبەر ئەوەشە شیعە چیرۆکی لەدایکبوونی باس ناکەن بەدەگمەن نەبێت ئەویش لەگەڵ پێشەکییەکی زۆردا بۆ ئەوەی مێشکی خوێنەر یا بیسەر ئامادە بکەن بۆ باوەڕپێکردنی.
هەروەها خوێندنەوەی ئەو ئاکۆکی و جیاوازییەی کەوتە نێوان شیعەکانەوە دەریدەخات کە لەدایکبوونی کەسێك بەناوی محەمەدی مەهدی بوونی نییە ، ئەوەتا نۆبەختی کە مێژوونووسێکی شیعەیە لە کتێبی فرق الشیعە دا و سعد بن عبدالله الاشعری القمی لە کتێبی (المقالات والفرق) وهەردوو هاوچەرخی حسن العسکری بوون و ابن ابی زینب الیمانی لە کتێبی (الغیبة) و ابن بابویە القمی لە(اکمال الدین)و الشیخ المفید لەکتێبی (الارشاد) وتووسی لە کتێبی (الغیبة) دا دەڵێن دوای مردنی حەسەنی عەسکەری شیعە بوون بە چواردە بەشەوە یەکێك لەوانە دەیانوت حەسەنی عەسکەری کوڕێکی هەبووە لە پێنج ساڵیدا دیارنەماوەو ئەویش ئیمامی مەهدییە ، ئەوانی تریش هەر یەکەو بەلایەکدا چوون ، هەندێکیان وتیان جەعفەری برای حەسەن ئیمام بووەو ئێمە بە هەڵە حەسەنمان بە ئیمام زانیبوو ، هەندێکیشیان وتیان ئەم سەردەمە بێ ئیمامەو وەکو ئەو سەردەمانەیە کە پێغەمبەری تێدا نەبووە ،هەندێکی تریان وتیان حەسەنی عەسکەری ئیمامی مەهدییەو پاش ماوەیەك دەگەڕێتەوە ،هەندێکی تریان وتیان ئیمام موحەممەدی برای حەسەنی عەسکەرییە کە باوکی هەواڵی دابوو ئیمامە لە دوای خۆی بەڵام لە ژیانی باوکیدا مرد کەواتە ئەو نەمردووە بەڵکو باوکی شاردوویەتەوە هەروەکو چۆن جعفر الصادق پێشتر ئیسماعیلی کوڕی

شاردەوە و هەر دەبێ ئەو ئیمام بێت چونکە باوکی ئەوی دەستنیشان کردبوو ئیمامیش کەسێك دەستنیشان ناکات بە ئیمام ئەگەر ئیمام نەبێت .هەندێکی تر وتیان یەکێك لە کەنیزەکەکانی حەسەنی عەسکەری دووگیانەو ئیمام بریتییە لەو کوڕەی لە سکیدایە و ئیمامەت لە وەچەکانیدا بەردەوام دەبێت. هتـــــــــــــــــــد . ئایا ئەم هەموو جیاوازییە نیشانەی لەدایکنەبوونی مەهدی نییە؟

شایانی باسە دوای مردنی حەسەنی عەسکەری ناکۆکی کەوتە نێوان بنەماڵکەی لەسەر میراتەکەی ، ئەوەبوو سەرەنجام ئەو میراتە لە نێوان دایکی و جەعفەری برایدا (کە شیعە پێی دەڵێن جعفر الکذاب) دابەشکراو قازی نەرجس (صەیقەل) ی کەنیزەکی کە دەیوت دووگیانم لە ژێر چاودێریدا هێشتەوە بۆ ئەوەی بزانن ڕاست دەکات یان نا بۆ ئەوەی میراتی حەسەنی بەرکەوێت بەڵام دوایی کە دەرکەوت دووگیان نییە میراتەکە لە نێوان دایکی حەسەن( کە لە مەدینەوە هاتبوو بۆ سامەڕڕا دوای بیستنی مەرگی کوڕەکەی) و جەعفەری برایدا دابەشکرا.

کەواتە حیکایەتە ئەفسانەییەکەی چۆنێتی لەدایکبوونی محەممەدی مەهدی و سەرگەردانبوون و پەرتەوازەبوونی شیعە دوای مردنی حەسەنی عەسکەری و دابەشکردنی سامانەکەی لە نێوان دایکی و براکەیدا و شایەتی دادگاو مێژوونووسان لەسەر وجاغ کوێری حەسەنی عەسکەری (نەکچی هەبووە نەکوڕ) بەڵگەن لە سەر ئەوەی کە کەسێك بەناوی محەممەدی مەهدییەوە لە دایك نەبووە.

لەوانەیە بڵێی ئەگەر شتی وانەبووە چۆن شیعە ئەو شتەیانە داهێنا؟

وەڵامی ئەم شتەش زۆر ئاسانە ئەگەر ئەوە بزانی کە بیرۆکەی ئیمامی مەهدی لە مێشکی شیعەدا بەردەوام ئامادەبووەو هەر لە سەردەمی ئیمامی عەلییەوە تا حەسەنی عەسکەری هەر ئیمامێکیان مردبێت کۆمەڵێکیان وایانزانیوە ئەوە ئیمامی مەهدییەو دەگەڕێتەوە لەبەر ئەوە شتێکی زۆر ئاسایی بوو کە ئەو شتە دابهێنن و لافی ئەوە لێبدەن کە حەسەنی عەسکەری کوڕێکی هەبووە بەناوی موحەممەدەوەو لە ژیانی باوکیدا غەیب بووە چونکە ئەگەر ئەوەیان نەکردایە مەزهەبەکەیان ئەم جارەیان بەڕاستی دەکەوتە بەر مەترسی فەوتان و لەناو چوون چونکە لەنەوەی علی الهادی تەنها جەعفەر مابوویەوەو ئەویش بە درۆزن و فاسق ناسراو بوو لەناو شیعەداو نەدەکرا هەڵبژێردرێت بە ئیمام و پێچەوانەی ئەو بنەمایانەش بوو کە شیعە دایاننابوو بۆ ئیمامەت ئەویش ئەوەیە کە جگە لە حەسەن و حوسەین چیتر ئیمامەت لە براوە ناگوێزرێتەوە بۆ برا و ئیمام نابێ

بیرۆکەی دەرکەوتنی کەسێك لەنەوەی پەیامبەر کە زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری بیرۆکەیەکی جوانەو پڕە لە هیواو ئاواتی باش بەڵام زانایانی شیعە دووباڵیان لکاند بە ئیمامی مەهدییەوە باری شانیان پێ قورس کردووە لەهەموو شوێن‌و کاتێکدا، ئەم دوو باڵەش بریتین لە بیدعەی پێنج یەك (خومس) لەداهاتداو بیدعەی ویلایەتی فەقیە، یەکەم واتە دانی باجێکی دارایی بەبێ ئەوەی خوا فەرمانی پێدابێت، دووەمیان واتە بەندایەتی بێ قەیدو شەرتی مرۆڤ بۆ مرۆڤ.

## ئیمامی مەهدی

شیعە باوەڕیان وایە کە ئیمامی حەسەنی عەسکەری کە دەکاتە ئیمامی یازدەهەمی شیعە کاتێك کۆچی دوایی کرد لەساڵی ٢٦٠ی کۆچیدا کوڕێکی هەبوو ناوی موحەممەد بوو تەمەنی ٥ ساڵ بوو، ئەو کوڕە مەهدی چاوەڕوان کراوە.

ڕیوایەتگەلێکی تر هەن دەڵێن مەهدی دوای کۆچی دوایی باوکی لەدایك بووە، بەهەر حاڵ مەهدی پلەی ئیمامەتی لە باوکیەوە بۆ مایەوەو بەنادیاری

---

وجاغ کوێر بێت ئەگینا ئەو کەسە ئیمام نییە، واتە ئەگەر بیانوتایە جەعفەر ئیمامە دەبوایە بۆ جاری سێهەم بیانوتایە خوا هەڵەی کردووە و ئەو وایزانیوە حەسەن ئیمامە چونکە ئیمام نابێت وەچەی نێرینە نەخاتەوە ،وە لەوانەیە ئەگەر جەعفەر بە فاسق و درۆزن ناوبانگی دەرنەکردایەو جێی ڕەزامەندی پێشڕەوانی شیعە بوایە ئەم کارەیان بکردایەو جارێکی تر بەدانیان بدایەتە پاڵ خوا چونکە هەرچۆنێك بوایە ئاسانتر بوو لە داهێنانی چیرۆکێکی لەو بابەتەی کە باوەڕپێکردنی ئەستەم بوو.( بۆ زیاتر ئاشنا بوون بەم ڕاستییە کتێبی تطور الفکر السیاسی الشیعی احمد الکاتب بخوێنەرەوە کە تێیدا زۆر بە جوانی بەرەسی ئەم مەسەلەیەی کردووە.)(وەرگێڕ)

(بزری) مایەوە بۆ ماوەی شەستو پێنج ساڵ، شیعەکانیش لەو ماوەیەدا پەیوەندیان پێوەدەکرد لەڕێگەی چەند نوێنەرێکەوە کە ئەمانەن: (عوسمانی کوڕی سەعیدی عومەری، موحەممەدی کوڕی عوسمانی کوڕی سەعید، حوسەینی کوڕی ڕوحو چوارەمیشیان عەلی کوڕی موحەممەدی سمەری).

ئەو چوار نوێنەرەش ناونران بە نوێنەرە تایبەتەکانو ئەو ماوەیە واتە لە ٢٦٠ تا ٣٢٩ك پێی دەوترێت سەردەمی دیارنەمانی بچوك (الغیبە الصغری).

لە ساڵی ٣٢٩ کۆچی و پێش کۆچی دوایی عەلی کوڕی موحەممەدی سمەری بەچەند مانگێك پارچە نووسراوێکی پێگەیشت تێیدا نووسرابوو:

"ئەوە دیارنەمانی تەواو ڕوویداو تا خوا مۆڵەت نەدات دەرکەوتن نییە، هەرکەسێك لافی بینینی من لێبدات ئەوە درۆزنەو هەڵبەستەی خۆیەتی".

ئەم ساڵەش سەرەتای دیارنەمانی گەورەیە (الغیبە الکبری)و لەو کاتەوە پەیوەندی شیعە بە ئیمامەوە پچڕاوە چ ڕاستەوخۆ وە چ ناڕاستەوخۆو هەرکەسێکیش لافی ئەوە لێبدات شیعە بەو دەقەی بۆیان هاتووە لە ئیمامی مەهدییەوە بەدرۆی دەخەنەوە.

ئەمە کورتەی بیروباوەڕی شیعەی ئیمامییە دەربارەی مەهدی چاوەڕوانکراو، تاکو ئێستاش ساڵانە شیعە لەڕۆژی پازدەی شەعباندا لە یادی لەدایکبوونی مەهدیدا ئاهەنگی گەورە دەگێڕن، ئەویش تاقە ئیمامێکە شیعە تەنها بۆ یادی لەدایکبوونی ئاهەنگ دەگێڕن لەکاتێکدا کە بۆ ئیمامەکانی تر لەیادی لەدایکبوونو مردنیشدا ئاهەنگ دەگێڕن.

بیرۆکەی مەهدیو دەرکەوتنی پێشەوایەك لە کۆتایی دونیادا زەوی پڕ بکات لە دادوەری پاش ئەوەی پڕکرا بوو لە جەورو ستەم لەزۆربەی ئاینەکاندا

هەیە، کۆمەڵێك فەرمودەش هەیە کتێبەکانی فەرمودە ڕاستەکان لە پەیامبەریان گێڕاوەتەوە دەربارەی دەرکەوتنی کەسێك لەنەوەی خۆی لەکۆتایی دونیادا وەلێ ئەو کەسە دیاری نەکراوە کێیە، بەڵام شیعە بە پشت بەستن بەڕیوایەتگەلێك کە داویانەتە پاڵ ئیمەکانیان دەڵێن ئەو مەهدیە پەیامبەر هەواڵی لێداوە کوڕەکەی حەسەنی عەسکەریە[1]

ئێمە لێرەدا نامانەوێت بچینە ناو ئەو کێشمەکێشە بێزەتیە کۆنە دەربارەی مەهدی‌و بوونی لێکدانەوەیەکی عەقڵی لەسەر مانەوەی بەزیندوویی لەم دونیایەدا بۆ هەزارەها ساڵ، ئێمەی شیعە وەکو تاقمە ئیسلامییەکانی تر مادەم باوەڕمان بەنادیار هەیەو باوەڕمان بەوە هەیە کە خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ناڕەحەتییەك نابینین لەوەی بڕوا بکەین بەوەی کە مرۆڤێك بۆی هەیە بەدەر لە یاساکانی سروشت بۆ هەزارەها ساڵ بژی، ئەوە قورئانی پیرۆزە ڕوونە لەوەی کە نوح لەناو گەلەکەیدا نۆسەدو پەنجا ساڵ ژیاوەو یارانی ئەشکەوت لە ئەشکەوتەکەیاندا بۆ ماوەی سێسەدو نۆ ساڵ مانەوەو خوا عیسای کوڕی مەریەمی بەزیندوویی بەرزکردەوە بۆلای خۆی، با پێکەوە ئەم ئایەتانە بخوێنینەوە.

---

[1] ترمذی لە( صحاح)ـەکانیدالە پێغەمبەری گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر لە تەمەنی ئەم دونایە تەنها یەك ڕۆژ بێنیەوە خوا ئەو ڕۆژە درێژ دەکاتەوە تاوەکو یەکێك لە نەوەکەم دەنێرێت ناوی وەکو ناوی منە.

لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەدیشدا لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوەکە فەرموویەتی : ڕۆژگار نابڕێتەوەو دونیا کۆتایی پێ نایەت تا یەکێك لە نەوەکەم کەناوی لە ناوی خۆم دەچێت نەیێتە فەرمانڕەوای عەرەب. سیرة الأئمة الاثنی عشر ج٢ ص ٥٤٣ هاشم الحسینی (نووسەر)

تێبینی: سونەنی تەرمەذیمان هەیە نەك صەحیحی تەرمەذی ، ئەم هەڵەیە هەموو شیعەکان تێی دەکەون(وەرگێڕ).

"سوێند بەخوا( نوح )مان بە پەیامێکەوە نارد بۆ گەلەکەی نۆسەدو پەنجا ساڵ لەناویاندا مایەوە، لەئاکامدا لافاوو زریان لەناوی بردن لە ئەنجامی ستەمی خۆیان" عنکبوت/ ١٤.

"بەهۆی ئەوەی کە وتیان ئێمە مەسیح عیسای کوڕی مەریەممان کوشت کە پەیامبەری خوایە، لەکاتێکدا نەشیان کوشتبوو وە هەڵیشیان نەواسیبوو بەڵکو لێیان گۆڕدرا، وە بێگومان ئەوانەی دووبەرەکییان تێکەوت دەربارەی عیسا لەگوماندان لە کوشتنەکەیداو هیچ زانیارییەکیان دەربارەی نییە جگە لەشوێن کەوتنی گومان، لەڕاستیشداو بێگومان نەیانکوشتووە بەڵکو خوا بەرزی کردەوە بۆلای خۆی، خوا هەمیشە خاوەنی دەسەڵاتو کاربەجێیە" نساء ١٥٧-١٥٨.

بیرۆکەی مەهدی خۆی لەخۆیدا بیرۆکەیەکی جوانە، چونکە ئاماژەیە بۆ چاکەی بێ خەوش‌و ڕوانینە بۆ دونیایەکی پڕ لە چاکەو خۆشی‌و جوانی، دونیایەکی نمونەیی کە زۆر جار ئەفلاتون لەکۆمارەکەیداو فەیلەسوفی ئیسلامی فارابی لە (شارە نموونەییەکەیدا) بانگەشەیان بۆ دەکرد، جگە لەوەی کە ئەو بیردۆزە نمونەییە بەها ئیسلامییە بەرزەکان بەدی دەهێنێت.

ئەگەر بهاتبایە بیروباوەڕی بوونی مەهدی قۆرخ بوایە بە باوەڕبوون بە بوونی پێشەوایەکی نادیار لەنەوەی پەیامبەر (ﷺ) کە ڕۆژێ لەڕۆژان دەردەکەوێت‌و زەوی پڕ دەکات لەدادپەروەری موسوڵمانان کێشەیەکیان نەدەبوو بەڵام بەداخەوە زانایانی شیعە دوو باڵیان لکاند بە مەهدییەوە بەو دووباڵە وێنەی مەهدییان ناشیرین کرد، ئەم دوو باڵەش دوو بیدعەی گەورەن لەکاتی سەرهەڵدانی ململانێی نێوان شیعەو تەشەییوع لکێنران بە مەزهەبی شیعەوەو ناکۆکییەکی ڕوون‌و ئاشکرایان هەیە لەگەڵ دەقەکانی قورئان‌و ژیانی پەیامبەرو کردەوەی عەلی‌و نەوەکانیدا.

بیدعەی یەکەم بەخشینی پێنج یەکی دەرامەتی کاروکاسبی، بیدعەی دووەم بیرۆکەی ویلایەتی فەقیه. ئەو سەرکردە مەزهەبیانەی کاروباری ئایینی شیعەیان گرتۆتە ئەستۆ لە دوای دیارنەمانی گەورەوە بەرپرسن لەسەرهەڵدانی ئەو دوو بیدعەتە بەهۆی کردنەوەی دەرگای ئیجتیهادو تا ئەمڕۆش جڵەوی بیروباوەڕی شیعەیان گرتۆتە دەست.

بەنیسبەت پێنج یەکەوە زانایانی شیعە کۆکن لەسەر ئەوەی  کە جگە لە دەستکەوتی شەڕ دەرامەتی کاروکاسبیش دەگرێتەوە، ئەم جۆرە ڕاڤەکردنەی غەنیمە بە داهاتی کاروکاسبی بەسەدەو نیوێك دوای دیارنەمانی گەورە لە کتێبە شیعەییەکاندا دەرکەوت، ویلایەتی فەقیهیش[1] زۆرێك لەزانایانی مەزهەب بەرەنگاری بوونەوە، بەڵام لەگەڵ  ئەوەشدا لایەنگری خۆی هەیە.کۆدەنگییەك هەیە لە نێوان زانایانی شیعە لەسەر جۆرە سەرپەرشتییەك کە دەشوبهێتە دەسەڵاتی دادوەر لە دەستنیشانکردنی سەرپەرشتیار بۆ شێتو منداڵی پێنەگەیشتوو، ئەو سەرپەرشتییەش دەسەڵاتی موجتەهیدەکانە، وە پێش ئەوەی باسی ئەم دوو بیدعەتە لکێنراوە بە ئیمامی مەهدییەوە بکەین پێویستە وێنەیەکی ڕوون لەسەر بیرۆکەی ئیجتیهاد لای شیعەو پەیوەندی شیعە بە ئیمامی مەهدییەوە بەو شێوەیەی کە زانایانی شیعە وێنەیان گرتووە بیکێشین.

---

[1] ویلایەتی فەقیه: بەمانای سەرپەرشتی زانایان دێت بۆ کاروباری شیعەکان . لێرەدا زانایان جێگرو نوێنەری ئیمامن و حوکمەکانیان وەکو حوکمی ئیمام کە مەعصومە بە لای شیعەوە ڕەت کردنەوەی بۆ نییە.(وەرگێڕ)

## ئیجتیهادو لاسایی کردنەوە (تقلید):

زانایانی شیعە بۆ کردنەوەی دەرگای ئیجتیهاد پشت بە دوو فەرمان دەبەستن کە لە ئیمامی مەهدییەوە دەرچووە پێش دیارنەمانی،ئەو دوو نووسراوە لەناوەرۆکدا جیاوازن بەڵام لەمەبەستدا یەکن‌و بریتین لە:

١- نووسراوی یەکەم "هەر زانایەك خۆی پاراستبێت، ئاینی خۆی پاراستبێت، سەرپێچی ئارەزووەکانی خۆی کردبێت، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پەروەردگاری بێت خەڵکی بۆیان هەیە لاسایی بکەنەوە"

٢- نووسراوی دووەم "بۆ ڕووداوە نوێیەکان بگەڕێنەوە بۆلای ئەوانەی ریوایەتی قسەکانی ئێمە دەکەن".

لەسەر ئەم دوو نووسراوە (یەکێکیان تایبەتە بە موجتەهیدین، ئەوی تریان بەخەڵکە گشتییەکەوە) زانایانی مەزهەبی شیعە دەرگای ئیجتیهادیان کردەوەو موجتەهیدەکان پشتیان پێدەبەستن لەسەر فەرزکردنی لاسایی کردنەوە لەسەر خەڵکی شیعە.

دوای دیارنەمانی گەورە زانایانی مەزهەب یەك لەدوای یەك کاروباری شیعەیان گرتە ئەستۆو پێشەوایەتی مەزهەبی لەنێوان موجتەهیدەکان‌و خەڵکە گشتییەکەدا نەپچڕا تاکاتی نووسینی ئەم دێڕانە ئەویش بەهۆی کردنەوەی دەرگای ئیجتیهادو پێویستی لاسایی کردنەوەی موجتەهیدەکان.

بەڵام تاقمە ئیسلامییەکانی تر دەرگای ئیجتیهادیان داخست لەبەر ئەو زەحمەتییانەی دێنە ڕێگەی کاری هەڵهێنجاندن[1] جگە لە سەلەفییەکان کە ئەم

[1] مەبەستی نووسەر لەهەڵهێنجاندنی حوکمە شەرعییە لاوەکییەکاندا بەکاریان هێناوە نەك عەقیدەو شتە بناغەییەکان. (وەرگێڕ)

دەرگایەیان لەسەر خۆیان دانەخستووەو زاناکانیان ئیجتیهاد لەو بەشە فیقهیانەدا دەکەن کە دەقی لەسەر نییەو ملکەچە بۆ بەڵگەکانی هەڵهێنجاندن لە قورئانو فەرمودەو ئیجماعو قیاس (پێوان) لەکاتێکدا کە زانایانی شیعە بەڵگەی پێوانیان گۆڕیوە بەبەڵگەی عەقڵیو کردویانەتە بنەمای چوارەم لە بنەماکانی هەڵهێنجاندن (استنباط) سەیر لەوەدایە کە زانایانی شیعە خۆیان دەدەنە پاڵ ڕێبازی عەقڵی لە هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکاندا بەڵام لەڕاستیدا دوورترین کەسن لە بەکارهێنانی عەقڵ لەو بوارەدا.

خۆزگە دەمزانی چۆن زانایانمان پشت بە عەقڵ دەبەستن بۆ تێگەیشتنی حوکمە شەرعییەکانو هەڵهێنجانی مەسەلە فیقهییەکان لە کاتێکدا کە بەبێ سێو دوو باوەڕدێنن بەهەندێك فەرمودە کە دراوەتە پاڵ ئیمامەکانی شیعەو لەکتێبە بڕوا پێکراوەکانیاندا هاتووەو بەڕاستی دەزانن و لەگەڵ عەقڵدا دژو ناکۆکن.

بەڵێ ئەگەر مەبەست لەبەکارهێنانی عەقڵ لای زانایانی شیعە بەکارهێنانی بەڵگە عەقڵییەکان بێت کە زانستی بنەماکانی فیقھ (أصول الفقه)ی لەسەر دامەزراوە، ئەو زانستەی کە زانایانی شیعە دەستێکی باڵایان هەبووە لە دامەزراندنیدا[1]، ئەویش چۆنیەتی بەکارهێنانی بەڵگە عەقڵییەکان بۆ تێگەیشتن لە حوکمە شەرعییەکان بێ ئاوڕدانەوە لە ڕواڵەتی ماناکان. لەڕاستیدا بنەماکانی فیقھ خۆی لەخۆیدا زانستێکی زۆر جوانەو تایبەتمەندی

[1] یەکەم کەس لە سەر زانستی( اصول الفقه) نووسیویەتی ئیمامی شافعییە کە کتێبی (الرسالە)یە نەك زانایانی شیعە

عەقڵی هەیە، بەڵام بەداخەوە زانایان بەکاریان هێناوە لە توێکڵدا نەك لەناوەرۆکدا.

پێش ئەوەی لە بیردۆزە ئیجتیهادییەکە بدوێم پێم خۆشە ئاماژە بۆ دوو شتی پێویست بکەم:

یەکەم: دەمەوێ ئاماژە بەو هەڵە گەورەیە بدەم کە هەندێك نووسەرو توێژەر تێی کەوتوون لەوانەی کەلەسەر شیعە شتیان نووسیوە لەم ساڵانەی دواییدا، ئەویش ئەوەیە کە شیعەیان بە شیعەی ئوسوڵی یان ئیمامییەی ئوسوڵی پێناسەکردووە بەو مانایایەی کە گوایە شیعە دەیانەوێت بگەڕێنەوە دواوە بۆ بیروباوەڕە کۆنەکانیان چونکە وشەی (أصول)یان بەرەگ ڕاڤەکردووەو نەیانزانیوە کە ئوصولییەت بەمانای گەڕانەوە بۆ ڕەگەکان نایەت بەڵکو بەو مانایە دێت کە شیعە دەیانەوێت بنەماگەلێکی عەقڵی بەکاربێنن کەپێی دەوترێت (أصول الفقه) بۆ هەڵێنجانی حوکمە شەرعییەکان لەکاری ئیجتیهادیدا، بۆیە ناونران ئوصولییەکانو سەدان کتێب نووسراوەتەوە لە سەر (أصول الفقه) هەمووی باسی بەڵگە عەقڵییەکان دەکات کە من کەمێك لەمەوبەر ئاماژەم بەهەندێکیاندا.

دووەم: کۆمەڵێکی بچووکی شیعە هەیە ناوی خۆیان ناوە (ئەخبارییەکان)، ئەوانەن کە زانستی ئوصول یان باشتر بڵێین بەڵگە عەقڵییەکان بەکارناهێنن لە هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکانداو کاری ئیجتیهادی لایان لەڕێگەی قورئانو سوننەو ئیجماعەوە دەبێت، بەناوبانگترین زانایان بریتییە لە شێخ حوڕڕی عامیلی خاوەنی کتێبی (وسائل الشیعة) کە دادەنرێت بە گەورەترین سەرچاوە بۆ فیقھ.

با بگەڕێینەوە بۆ ئەو ڕێگە ئیجتیهادییەی شیعەی لەوانی تر جیا کردووەتەوەو ئەوەش بڵێین کە ئەو ڕێگە ئیجتیهادییە خۆی لەخۆیدا کارێکی جوانو چاکەو دەگونجێت لەگەڵ پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیو فیکریدا، جا هەروەکو چۆن مرۆڤایەتی بەرەو باشترو کاملتر دەڕوات ڕووبەڕووی شتگەلێکی نوێ دەبێتەوە بەهەمان شێوە پێویستی بە یاسا گەلێکی نوێ هەیە کەلە لێکۆڵینەوە فیقهییەکانی پێشبوودا باس نەکراون، بۆیە پرۆسەی ئیجتیهادی هەڵهێنجانی یاسا شەرعییەکان ئاسان دەکات بەو مەرجەی لەگەڵ بنەماکانی فیقهدا دژ نەبن، هەرکاتێك کۆمەڵگە لە جوڵەدا بوو یاسا کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵیدا لە جوڵەدا دەبن ئەگەر دژو ناکۆك نەبن لەگەڵ قورئانو سوننەتی پەیامبەرو کۆدەنگی زانایاندا، ئەگەر زانایانی شیعە لەکاری ئیجتیهادیدا وەکو زانای مەزهەبی جەعفەری کاربکەنو حەڵاڵو حەرام ڕوون بکەنەوە وەکو ماباقی زانایانی مەزهەبەکانی ترو ئەو کارەیان بۆ خوا بکردایەو کرێیان لەسەر وەرنەگرتایەو چاوەڕوانی پاداشتو سوپاسی خەڵکی نەبوونایە ڕەوشی شیعە لە باشیدا دەبوو وە ئوممەتی ئیسلامی لە چاکترین حاڵدا دەبوو، بەڵام بەداخەوە زانایان یان لەدەستی ئەنقەست وە یا لەنەزانی وە یا لەڕووی ناچارییەوە دوو بیدعەتیان زیادکرد بۆ سەر پرۆسەی ئیجتیهادیو بەوە هەموو ڕێگەکانی دڵسۆزیو کارکردن بۆ خوایان تێکدا: وەکو وتمان ئەو دوو بیدعەتە دوو باڵن ئەشەکێنەوە بەسەر سەری شیعەوە تا دونیا ماوە، ئەو دوو بیدعەتەش پێنج یەکی دەرامەتی کارو کاسبیو ویلایەتی فەقیهە.

**پێنج یەك:**

خوا دەفەرموێت (وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ) (الأنفال: ٤١)

واتە: وە بزانن کە هەرچییەکتان دەست دەکەوێت لەشەڕدا ئەوا پێنجیەکی بۆ خواو پەیامبەرو خزمانی پەیامبەرو هەتیوانو هەژارانو ڕێبوارانە.

فەزڵی کوڕی حەسەنی تەبرەسی کە یەکێکە لەزانا گەورەکانی شیعەی ئیمانی لەسەدەی شەشەمی کۆچیدا لەڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: "زانایان جیاوازی هەیە لەنێوانیاندا لە چۆنیەتی دابەشکردنی پێنج یەكو ئەو کەسانەی بۆیان دەشێتو لەسەر چەند بۆچوونێکی جیاوازن یەکێك لەوانە ئەوەی زانایانی مەزهەبی خۆمانە کە دەڵێن: پێنج یەك دەکرێت بە شەش بەشەوە، بەشێك بۆ خوا، بەشێك بۆ پەیامبەر(ﷺ)، ئەم دوو بەشەش لەگەڵ بەشی خزماندا بۆ ئیمامی جێگری پەیامبەرەو بەشێك بۆ هەتیوانی ئەهلی بەیتی پەیامبەرو بەشێك بۆ هەژارەکانیانو بەشێك بۆ ڕێبوارەکانیانەو کەس هاوبەشیان ناکات تێیدا چونکە خوای گەورە خێرو سەدەقەی لەسەر حەرام کردووەن، لەبەرئەوەی چڵکیماڵی خەڵکییەو لەجێی ئەوە پێنجیەکی بۆ داناون، وە زانایانی مەزهەبمان دەڵێن پێنجیەك فەرزە لەهەموو شتێکدا کەدەستی مرۆڤ دەکەوێت لەڕێی کەسابەتو قازانجی بازرگانیو شتی هەڵگیراوو کانزاکانو هەرچی لە ئاو دەریدێنێتو شتی تر کەلە کتێبەکاندا باس کراوەو بەڵگەیان بەم ئایەتە هێناوەتەوە"[١]

ڕاڤەکردنی غەنیمە بە داهاتەکانی کارو کەسابەتو بازرگانیو...هتد، لای زانایانی شیعە نەبێت لای هیچ کەسێکی تر نییە لەکاتێکدا کە

---

[١] الطبرسي "مجمع البيان في تفسير القرآن" ج٤ ص٥٤٣.

ئایەتەکەش ڕوونو ئاشکرایە کە پێنج یەك بۆ دەستکەوتەکانی شەڕ دانراوە نەك دەستکەوتەکانی کارو کەسابەت و دیارترین بەڵگە لەسەر ئەوەی کە پێنج یەك بۆ قازانجی کاسبیو بازرگانیو ئەو شتانە دانەنراوە ژیانی پەیامبەری بەڕێز وژیانی خەلیفەکانی دوای ئەوە بە ئیمامی عەلیشەوە، تەنانەت ئەو مێژوو نووسە شیعانەی کە ژیاننامەی پەیامبەریان نووسیوەو وردو درشتی ژیانیو ڕێنماییەکانیان نووسیوە باسی ئەوەیان نەکردووە کە پەیامبەر (ﷺ) مەئمورەکانی خۆی ناردبێت بۆ بازاڕەکانی مەدینە بۆ ئەوەی پێنج یەکی دەرامەتەکانیان کۆ بکاتەوە لەگەڵ ئەوەی کە ئەو نووسەرانە تەنانەت ناوی ئەو مەئمورانەیان نووسیوە کە پەیامبەر (ﷺ) دانیابوون بۆ دەرهێنانی زەکاتی ماڵی مسوڵمانان، بەهەمان شێوە ئەوانەی ژیانی خەلیفە ڕاشیدەکانیان نووسیەوە بە ئیمامی عەلیشەوە بە هیچ شێوەیەك باسی ئەوەیان نەکردووە کە هیچ یەکێك لەوان داوایان لە خەڵکی کردبێت پێنج یەکی دەرامەتەکانیان بدەن بە دەوڵەت یان مەئموریان ناردبێت بۆ وەرگرتنی پێنج یەکی داهاتی خەڵکی، ژیانی ئیمامی عەلیش لە کوفەدا زانراوەو هیچ کاتێك کەسی نەناردووە بۆ بازاڕەکانی کوفە بۆ ئەوەی پێنج یەکی داهاتی خەڵکی کۆبکەنەوە یان داوایان لە والیەکانی کردبێت لە شوێنە جیاجیاکانی دەوڵەتی ئیسلامیدا پێنج یەك لە خەڵکی وەرگرنو بینێرن بۆ بەیتولمال لە کوفە.

هەروەها ئەوانەی ژیانی ئیمامەکانی تریان نووسیوە هەرگیز باسی ئەوەیان نەکردووە کە ئەو ئیمامەنە داوای پێنج یەکیان لە خەڵکی کردبێت یان کەسێك بەو ناوەوە پارەی بۆ بردبن، هەروەکو لەمەوبەر وتمان ئەم بیدعەتە لە کۆمەڵگەی شیعەدا لەکۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا سەری هەڵداو لەدوای دیارنەمانی گەورەوە تا کۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچی لە

کتێبە فیقهییەکانیدا بەشێك نییە لەسەر پێنج یەك یان ئاماژەیان تێدابێت بۆ ئەوەی کە پێنج یەك دەستکەوتی شەڕو داهاتی کاروکاسبیش بگرێتەوە، ئەوە موحەممەدی کوڕی حەسەنی توسییە کە یەکێکە لەگەورە زانایانی مەزهەبی شیعە لەسەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچیداو بە دامەزرێنەری حەوزەی ئایینی نەجەف دادەنرێت، لە کتێبە فیقهیە ناسراوەکانیدا هیچێکی لەسەر ئەم بابەتە باس نەکردووە لەگەڵ ئەوەی کە هیچ شتێکی گەورەو بچوکی نەهێشتۆتەوە لە مەسەلە فیقهیەکان باسی نەکردبێت لەو نووسراوە گەورەیەیدا.

ئەم ڕێو شوێنە ناشیرینە لەسەردەمی خیلافەتی عەبباسیدا گیرایەبەر لەوکاتەی کە ڕژێمی دەسەڵاتدار دانی بە شەرعییەتی مەزهەبی ئەهلی بەیتدا نەدەناو دانی بە زاناکانیدا نەدەنا بە پێچەوانەی ئەوەی کە بەرامبەر زانایانی مەزهەبەکانی تر دەیکرد، وە شیعە تاکو ئەو کاتە یەك ڕیز نەبوون لەڕووی مەزهەبییەوە بۆ ئەوەی هەڵسن بە کێشانی مەسرەفی زاناکانیان لەبەرئەوە ڕاڤەکردنی پێنج یەك لەداهاتی هەموو ئیشێکدا باشترین داپینکەر بوو بۆ چارەسەری ئەو کەموکورتییە دارایییەی زانایانی شیعەو خوێندکارەکانی قوتابخانە ئایینییە شیعییەکانی نارەحەت و بێ ئارام کردبوو لەوکاتەدا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە شیعە بەشدارییان نەکردبێت لەبەخێوکردنی زانایانو خوێندکارانی خوێندنگا ئایینییەکان، ئەوەتا لە عێراقدا کە لانکەی یەکەمی شیعە بوو تاکو ئەمڕۆ زەوی‌و زارو خانوبەرەی زۆر هەیە لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا تەرخان کراون بۆ کاروباری خەیری شیعە.

دوای ئەوە زانایان ئەم بیدعەتەیان داهێنا هەندێك بڕیارو حوکمی توندوتیژیان بۆ زیادکرد بۆ ئەوەی شیعە ناچار بکات پێنج یەکی

سامانەکانیان بدەن بە پێشەوا ئاینییەکانیان چونکە گەر بەو هەڕەشە توندانە نەبێت خەڵکی بە ئاسانی ڕازی نەدەبوون بەو کارە چونکە باج‌و سەرانەدان لەهەر کات‌و شوێنێکداو لەهەر کۆمەڵگەیەکدا لە هەر ئاستێکدا بێت لەڕووی ڕۆشنبیری‌و دیموکراسی‌و ئازادییەوە ڕووبەڕووی ناڕەزایی خەڵکی دەبێتەوە، وە لەبەرئەوەی زانایانی شیعە دەسەڵاتی ئەوەیان نەبوو خەڵکی پێ بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە بۆ سەرانە لێوەرگرتن ناچار بوون حوکمگەلێکی زۆر توند دەربکەن دەربارەی نەدانی پێنج یەك لەوانە سزای هەتاهەتایی دۆزەخ‌و نوێژنەکردن لەماڵی ئەو کەسەی بەشی ئیمام دەرناکات‌و دانەنیشتن لەماڵیداو...هتد.

هەروەها فەتوای ئەوەیاندا کە پێنج یەك کە بەشی ئیمامی مەهدیە دەبێ بدرێت بەو موجتەهیدانەی نوێنەرایەتی ئیمام دەکەن، بەوشێوەیە ئەم بیدعەتە تەشەنەی کرد لەناو کۆمەڵگەی شیعەداو لەو کاتەوە سامانی خەڵکی پێ لووش دەدەنوکارێکیان کردووە زۆرێك لە شیعەکان تاکو ئەمڕۆش بە زەلیلییەوە ئەم باجە بە مەرجەعی مەزهەبی بدەن و دڵخۆشیش بن بەوەی کە ئەو مەرجەعە پیاوەتی لەگەڵدا کردوون مافی ئیمامی لێوەرگرتوون.

هەندێ لە زانایانی شیعە لەوانە ئەحمەد ئەردەبیلی (کە زانایەکی گەورەی سەردەمی خۆیەتی‌و تەنانەت ناوبراوە بە ئەردەبیلی پیرۆز) فەتوای ئەوەی داوە کە وەرگرتنی پێنج یەك لەکاتی غەیبەی گەورەدا حەرامە، بەهەمان شێوە هەندێ زانای شیعە (هەرچەندە بە ژمارە کەمن) فەتوای ئەوەیان داوە کە لەوکاتەوە پێنج یەك لەسەر شیعە نەماوە، لەم فەتوایەنەشیاندا پشت بەو ڕیوایەتە دەبەستن کەلە ئیمام مەهدی خۆیەوە ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ: (أبحنا الخمس لشيعتنا) خومسمان بۆ شیعەی خۆمان حەڵاڵ کردووە.

هەرچەندە زۆربەی زانایانی شیعە ئەم بۆچوونە دەدەن بە تەختی دیواردراو لەناوخۆیاندا لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە پێویستە لە سەر شیعە (خومس) لە سامانیان دەربکەن.

چەند پێم خۆشە کە زانایانو موجتەهیدەکان خۆیان لەوە بەرزتر ڕابگرن کەدەست بۆ سامانی خەڵکی بەرنو بەوە قایل بن کە ببنە بار بەسەریانەوە بەچەند بیبانوویەك کە لە هیچ شوێنێکی ئاینی خوادا باسی نەکراوە.

هەندێ لە زانایانی شیعە بەوە بەرگری لەم خومس خواردنە دەکەن کە گوایە ئەو سەروەتو سامانە لە پێناو قوتابخانە ئایینیو حەوزە زانستییەکانو کاروبارەکانی تری مەزهەبی شیعەدا خەرج دەکرێت، بەڵام باسەکە لەوەدا نییە کە ئەو سەروەتو سامانانە چۆنو لەچیدا خەرج دەکرێ بەڵکو باسو موناقەشەکەی ئێمە باسێکی (ئوصولی)و (مەزهەبیە) لەسەر کارێك کە ئێستا لەناودایە، باسەکەش ئەوەیە ئەم پارەو سامان وەرگرتنە لەخەڵکی بە درۆو دەلەسەو بەناهەقی لەخەڵك وەردەگیرێت، تەنانەت ئەگەر ئەو پارانە لە پێناو خواشدا خەرج بکرێت هەر ناشەرعیەو نابێت دەستی تێ بخرێ.

زانایانی شیعە ئەیانتوانی وەك چۆن هەموو خاوەن پیشەیەك خۆیان دروست بکردایەو خود کەفاییان بۆ خۆیان دابمەزراندایەو پشتیان بە خۆیان ببەستایە ، بەو شێوەیە دەیانتوانی سامانێکی زۆر بەناوی کۆکردنەوەی پیتاكو ماڵ بەخشینەوە(تبرع) کۆبکەنەوەو گەشەی زانستییان پێ دروست بکەن نەك بێن بەناوی ئەرکێکی ئاسمانیو واجبێکی شەرعییەوە ئەوکارە بکەن. کاتێك ئەم چەند دێڕە دەنووسم ئاگام لەوە هەیە کە موجتەهیدێکی شیعە مەزهەب هەیە تا ئێستاش هەر لە ژیاندایە ئەوەندەی سامان لەڕێگەی

خومسەوە پێکەوە ناوە بەقەدەر قارونێکی ئەوەی سەردەمی موسا پێغەمبەرو ئەم قارونانەی سەردەمی ئەمڕۆ، موجتەهیدێکی تری شیعە دەناسم لە ئێراندایەو پێش چەند ساڵێك کوشتیان، ئەوەندەی پارەی لە بانکەکاندا بەناوی خۆیەوە هەیە هاوتای (بیست ملیۆن دۆلار) کە هەمووی بەناوی خومسو بەناوی مافە شەرعییەکانەوە، بەزۆر بێت یان بەخۆشی لەو خەڵکەی وەرگرتووە، پاش هێنانو بردنێکی زۆرو چەند دادگایی، حکومەتی ئێرانی توانی دەست بگرێت بەسەر ئەو پارانەدا بۆ ئەوەی میراتگرەکانی لەناوخۆیاندا دابەشی نەکەنو نەیخۆن، ئا ئەمە یەکێکە لەو ئاسەوارە خەفەتئامێزانەی ئەو بیدعەی خومسە دروستی دەکات کە فیقهزانەکانی شیعە دایان هێناوەو کاری پێدەکەن.

ڕاستە پێشەوا مەزهەبییەکانی شیعە توانیویانە بەسەربەخۆیی بمێننەوەو دەستی حکومەتو دەسەڵاتەکانیان بەسەردا زاڵ نەبێت تەنانەت لە وڵاتە شیعە مەزهەبەکانیشدا، هەمووشی بەهۆی ئەو سەرچاوەیەوە (رصید) کە وشك ناکات، بەڵام تا ئەم پێشەوا مەزهەبییانەی شیعە خۆیان بەشەریکی جەماوەری کاسبکاری شیعە بزانن‌و برابەشیان بن لە خێری هەموو کارو قازانجێکیاندا لەهەموو کاتو هەموو شوێنێکدا ئەوە هەرگیز (بیروڕای شیعە) جێگریو دەمەزراوی بە خۆیەوە نابینێ لەهەموو کۆمەڵگەیەکی شیعە مەزهەبدا، هۆکەشی زۆر دیارو ئاشکرایە، چونکە ئەم پێشەوانە پشت ئەستوور بەو بودجە گەورەیە کە تەنانەت بۆ کۆکردنەوەو پێکەوەنانی پێویستی بە باجگرو فەرمانبەری ژمێریاریش نییەو بەڵکو ئەو بودجە گەورەیە بەپێی خۆیو زۆر گوێڕایەڵانە دێتە خزمەتیو باڵەخانەیەکی سیاسی وای بۆ ڕاست کردوونەتەوە کە هەرچۆن بیانەوێ بەو ئاڕاستەیە شیعە

بجولێننو بیبەن بەرێوە، هەر ئەمەیە وایکردووە بەدرێژایی مێژوو پێشەوایانی شیعە لەپێناو ئامانجە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانی خۆیاندا مەزهەبی شیعەیان بەکارهێناوە.

لە ئێراندا، ئەو وڵاتە شیعە مەزهەبەی کە ئێستا هەیە ئاسەوارێکی زۆر خراپی ئەم کارلێکی نێوان شیعەو پێشەوا دینییانەی تێدا دەرکەوتووە کە نایەتە ژمارو کارەکەش زۆر لەوە خراپتر کراوە کە مرۆڤ بۆی دەچێت بەتایبەت دوای ئەوەی (بیدعەی ویلایەتی فەقیھ) یش خرایە سەر بیدعەی خومس وەرگرتن!

پێش ئەوەی بە درێژی باسی (ویلایەتی فەقیھ) بکەینو بۆ ئەوەی بەویژدانەوە لەبەرمبەر پەیامەکەمانو لەبەرمبەر مێژوودا بوەستین، حەز ئەکەین باسی ئەوە بکەین کە هەندێ پێشەوای شیعە مەزهەب خزمەتێکی باشی هزری ئیسلامییان کردووەو خزمەتی کێشە نیشتمانیەکانیشیان کردووە دژ بە ئیمپریالیزمو دیکتاتۆرییەتی کاربەدەستان نەك جارێك بەڵکو چەندان جار، بەڵام کە ئەمانەوێ بەراوردێك لەنێوان هەڵوێستی ئەو هەندە کەسەدا بکەین کە دەسەڵاتی خۆیان بەکارهێناوە لەپێناو بەرژەوەندی گشتیداو لەنێوان ئەو پێشەوا مەزهەبییە زۆرەدا کە هەرچی دەسەڵاتی هەیە بەکاری هێناوە لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیداو ئەو دوو هەڵوێستە ئەخەینە تای تەرازووەوە، سەیر ئەکەین تای بەرژەوەندی تایبەتی زۆر قورسترە لەتای بەرژەوەندییە گشتییەکان، ئەم جیاوازییە بەڕادەیەکە کە مرۆڤ تووشی سەرسوڕمان و پەژارە دەکات.

## (ویلایەتی فەقیە):

ویلایەتی فەقیە ئەو بیدعەی دووهەم و باڵی دووهەمەیە کە خراوەتە سەر دەسەڵاتی ئەو کەسانەی کەلافی ئەوە لێدەدەن گوایە نوێنەری ئیمامی مەهدین لەسەردەمی دیارنەمانی گەورەدا. ئەم بیرۆکەیە بەدەربڕینێکی ورد بیڵێین بریتییە لە بیرۆکەی "تواندنەوەی خوا لە بەدیهێنراوەکانیدا" کە خزێنراوەتە نێو بیری ئیسلامییەوە کە لە بنەڕەتدا لە بیری مەسیحیەتەوە هاتووە کە دەڵێت: خوا چووەتە ناو لەشی حەزرەتی مەسیحەوەو حەزرەتی مەسیحیش چووەتە ناو لەشی حەبری گەورەوە، لەسەردەمی دادگاکانی پشکنین (محاكم التفتيش)دا کە لە ئیسپانیاو ئیتالیاو بەشێکی فەرەنسادا بەرپاکران پاپا بەناوی دەسەڵاتی ڕەهای خواوە "السلطة الالهية المطلقة"حوکمی مەسیحییەکانو غەیرە مەسیحییەکانیشی دەکرد، ئەوەبوو فەرمانی لەناوبردنو سوتانو زیندانیکردی دەر ئەکردو پاسەوانەکانی لەپڕدا خۆیان دەکرد بەماڵە بێوەیەکاندا ئیتر شەو بوایە یان ڕۆژبوایە دەستیان دەدایە کاری گەندەڵیو ناڕەوا، ئەم بیدعەیەش خزێنرایە ناو بیری شیعەگەرییەوە پاش ئەوەی کە سەردەمی غەیبەی گەورە دەستی پێکرد، ئەم بیدعەیە شێوازێکی ئاینی گرتەخۆی بە تایبەت ئەو کاتەی کە زانایانی شیعە بەدرێژی دەستیان دایە نووسین لەسەر "ئیمامەت"و ئەیانوت: ئیمامەت پایەیەکی خواییەو دراوەتە دەست ئیمام مەهدی بە حوکمی ئەوەی کە ئەو خەلیفەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) جا لەبەرئەوەی کە ئیمامی مەهدی ئێستا زیندووەو هەر ئەوەندە هەیە لەبەرچاو ونە، ئەو دەسەڵاتە خواییەی خۆی هەرماوەو لەبەر غەیبەتی گەورە ئەو دەسەڵاتە لە دەست نادات بۆیە ئەو دەسەڵاتەی ئەم دەگوێزرێتەوە بۆ نوێنەرەکانی چونکە نوێنەر ئەتوانێ بەهەموو ئەو کارانە هەڵبسێت کە لەدەستی کەسی سەرەکیدایە.

بەمشێوەیە بیرۆکەی "ویلایەتی فەقیە" ڕووپەڕێکی زۆر گەورەی لە عەقڵ‌و بیری زانایانی شیعەدا داگیرکرد، هەرچەندە زۆرێك لەو زانایانە نکوڵی لەم بیرۆکەیە دەکەن بەو مانایەی پێی دراوە وەك لە پێشەوە باسمان کرد، ئەمانە ئەڵێن "ویلایەت" تایبەتە بە پێغەمبەرو بەو دوازدە ئیمامەی پاش ئەو دێن‌و ناگوازرێتەوە بۆ نوێنەرەکانی ئیمام‌و ویلایەتی فەقیهیش زیاد لە دەسەڵاتی قازییەکی نییە کە ئەوەندە دەسەڵاتی هەیە کەسێکی دەستپاك بخاتە سەر ماڵێکی "وەقف" کە سەرپەرشتیاری نییە یان سەرپەرشتیارێك دابنێ بەسەر منداڵێکی شێتەوە یان منداڵێکی نابالغەوە، وا دیارە بیرۆکەی "ویلایەتی فەقیە"یش لەگەڵ ئەوەدا کە هەندێ لە زاناکان کاریان پێکردووە لەگەڵ ئەوەدا هەلی گونجاوی بۆ نەڕەخساوە کە لەدونیای تیۆرەییەوە بێتە ناو دونیای کارکردنەوە، ئەو کاتە نەبێ کە شا ئیسماعیلی سەفەوی دەسەڵاتی لە ئێراندا گرتە دەست کە ئێمە لە پێشەوە ئەو ئەو سەردەمەی ئەومان ناونا سەردەمی ململانێی دووەهەمی نێوان (شیعە)و (تەشەییوع).

شا ئیسماعیلی سەفەوی لە خێزانێکی سۆفی مەزهەبدا لەدایکبووەو لە شاری ئەردەبیل کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای ئێران ژیاون، باوو باپیرانی شا ئیسماعیل هەموو لە ڕێبەرانی تەصەوف بوون کە بەردەوام دروشمیان بریتی بووە لە خۆشەویستی (عەلی)و بنەماڵەی (عەلی)، با پیرانی شا ئیسماعیل دەسەڵاتێکی زۆریان بەسەر هەرێمی ئازربایجانی تورکیادا هەبووەو لە ساڵی (٩٠٧)ی کۆچیدا شا ئیسکاعیل توانی وەك پاشای ئێران خۆی ڕابگەیەنێت دوای ئەوەی کە شەڕی عوسمانی وئێرانی بەتەواوی ئێرانی شەکەت کردبوو.

گومان لەوەدا نییە کە لە پشت شا ئیسماعیلەوە کە لە تەمەنی سێزدە ساڵیدا تاجی پاشایەتی کردەسەر، چەندان ڕێبەری بەهێزی تەصەوف هەبوون

که ئەم پاشا بچکۆلەیان هەڵئەسوڕاند بۆ ئامانجەکانی خۆیان، ئێران وڵاتێکی شیعە مەزهەب نەبوو لەو کاتەدا کە شا ئیسماعیل دەسەڵاتی گرتە دەست چەند شارێکی کەم نەبێت وەك (قوم)و (کاشان)و (نەیسابور)، کەچی شا ئیسماعیل کارکردن بە مەزهەبی شیعەی بەڕەسمی ڕاگەیاند بۆ وڵاتی ئێران‌و دوای ئەوە ئاپۆڕەی سۆفیی کەوتنە بزاوتن بەرەو شارە ئێرانییەکان بەدەم سرودو پیاهەڵدانی (عەلی)و (بنەماڵەی)داو خەڵکیان هان دەدا بۆ ئەوەی باوەش بۆ مەزهەبی شیعە بکەنەوەو بچنە ناو ئەو مەزهەبەوەو شا ئیسماعیلیش بڕیاریدا هەرکەس شیعە گەرایی خۆی ڕانەگەیەنێت بدات لە ملی، یەکێك لەو شتە سەیرو خۆشانە ئەوەیە کە خەڵکی شاری ئەسفەهان ئەوکاتە (خەوارج) بوون، کە ئەم فەرمانەی شا ئیسماعیلیان پێ گەیشت (ببنە شیعە یان لەملیان دەدرێت) داوایان کرد کە چل ڕۆژ مۆڵەتیان بدات تا داخی دڵی خۆیان بڕێژن‌و ئەو ماوە زۆرە دنیایەك جوێن بدەن بە ئیمامی عەلی‌و پاشان ببنە شیعە، شا ئیسماعیلیش بەدڵی ئەوانی کردو ئەوەبوو ئەسفەهانیش چوونە پاڵ شارەکانی تری شیعە مەزهەبەوە.

لەگەڵ ئەوەی کە شائیسماعیل لەناخدا شیعە بوو و بە حوکمی گەشەکردنی‌و پلەو پایە سۆفێتییەکەی بەڵام بەخشینی سیفەتی شیعەیەتی بە ئێران مەبەستی تری تێدا بوو چونکە شەڕی ئێران‌و دەوڵەتی عوسمانی هەرچەند شەڕێکی ناوچەیی بوو وەڕەگ‌و ڕیشەی کۆنی هەبوو بەڵام بەردەوامیدان بەو شەڕە ڕووبەڕووی بیرۆکەی قەدەغەیی شەڕی مسوڵمان لەگەڵ مسوڵمان‌و کوشتنی مسوڵمان لەلایەن مسوڵمانەوە دەبوویەوە کە ئەمەش دەبووە هۆی نارەزایی خەڵك لەناو ئێرانداو چوونە پاڵ خیلافەتی عوسمانی‌و ژێر ڕکێفی خەلیفەوە کە پێی دەوترا (أمیر المؤمنین) پشتیوانی

خۆی هەبوو لە ئێراندا، بەڵام مەزهەبی نوێ کە شائیسماعیل فەرزی کرد بەسەر گەلی ئێراندا ڕیزی ئێرانییەکانی پتەوتر کردو هەموو هیوایەکی خەلیفەی بڕی لەوەی ئێران بخاتە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی خیلافەتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە شائیسماعیل خۆی بەجەمسەرێکی سۆفی دەزانیو بە پاشایەك کە سەروەرییەکی بۆ شیعە دروست کردووە کەسی تر شتی وای نەکردووە بەڵام ملکەچی بیرۆکەی ویلایەتی فەقیه بوو وە داوای لە عەلی کوڕی عەبدولعالی کەرکی عاملی کە لە گەورە زانایانی شیعە بوو لەناوچەی جەبەل عامل لە لوبنان مۆڵەتی دانیشتنی پێبدات لەسەر کورسی فەرمانڕەواییو کۆڵەکەی سیاسەتو پاشایەتی بۆ پتەوبکات بەناوی سەرپەرشتیاری گشتی (ولاية عامة) کە لەدەسەڵاتی فەقیهدایە، تاکو ئێستاش کتێبە مێژووییەکان ئەو دەقانەی پاراستووە کە کەرکی نووسیویەتی بۆ مۆڵەتدان بە شا فەرمانڕەوایی بکات.

گەڕانەوەی شا ئیسماعیل بۆلای زانایەکی شیعە لە جەبەل عامل لە لوبنان لە کاتی فەرمانڕەواییدا بۆ پشتگیری کردن لە ڕژێمەکەی بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە کە سەرۆکایەتی مەزهەبی شیعە لەوکاتەدا لە جەبەل عامل بوو کە جێی نیشتەجێی شیعە بوو دوای عێراق، لەبەرئەوە بەلامانەوە سەیر نییە ئەگەر کوڕەزای شا ئیسماعیل کە شا عەبباس بوو زانای گەورەی شیعە شێخ بەهادین لە جەبەل عامیلەوەبێنێت بۆ ئەسفەهانو بیکاتە مەرجەعی فەرمی وڵات و نازناوی (شێخ الاسلام)ی پێ ببەخشێت.

لەوەی ڕابوورد بەڕوونی دەردەکەوێت کە بیرۆکەی ویلایەتی فەقیه لە هزری شیعیدا هەبووەو لەسەر ئەو بنەمایە شەریعییەتی خیلافەتی ئیسلامو هەر حکومەتێکی تر کە نوێنەری ئیمام مۆڵەتی نەدات ڕەت کراوەتەوە.

لەو ڕۆژەوە کە شا ئیسماعیل ئێرانییەکانی کردە شیعە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ سەرۆکایەتی مەزهەب دەسەڵاتێکی زۆری هەیە لە ئێرانداو جێرێزێکی زۆرە لەلایەن پاشاو فەرمانڕەواکانەوە، لەگەڵ ئەوەی کە پەیوەندی تێوان سەرۆکایەتی مەزهەبی‌و سەرۆکایەتی سیاسی کە پێکهاتبوو لە پاشاو حاکمەکان لە باشترین دۆخا بووە بەدرێژایی مێژوو، بەڵام جار جار ململانێ لەنێوانیاندا ڕوویدەدا کەبە سەرکەوتنی لایەنێکیان بەسەر ئەوی تریاندا کۆتایی پێدەهات.

لەوڕۆژەی کە شا ئیسماعیل ویلایەتی فەقیهی کردە پلەیەك لەسەرەوەی شاو هەموو پلەوپایەیەکی ترەوە هیچ زانایەکی شیعە ڕاستەوخۆ خۆی کاندید نەکردووە بۆ فەرمانڕەوایی‌و ئەم بیرۆکەیەی ویلایەتی فەقیهەکە بەم دیدو پراکتیزە نوێیە سەری هەڵداوە بە خەیاڵی هیچ زانایەکی شیعەدا نەهاتووەو زانایانی شیعە لە ئێراندا ئەم بیرۆکەیەیان جگە لەوەستان لەدژی دەسەڵاتداردا ئەگەر ڕووبەڕوویان بوایەتەوە یان لەگەڵ دەدەسەڵاتدا ئەگەر ڕووبەڕووی دوژمنێکی دەرەکی بوایە بۆ مەبەستێکی تر بەکارنەهێناوەو پێش کەمتر لە دوو سەدە کاتێك شا فەتح عەلی قاجاری ویستی هێرش بکاتە سەر روسیای قەیسەری گەورەی موجتەهیدانی شیعە کەناوی سەید موحەممەد تەباتەبایی ناسراو بە موجاهید لە پێشەوەی لەشکرەکەی شاوە بوو، وە بەناوی ویلایەتی فەقیهەوە فەتوای جیهادی بۆ دابوون، وە کاتێك لە شکری ئێران تێکشکاو شا دەستی هەڵگرت لە حەقدە شاری گەورەی ئێرانی بۆ قەیسەرو لەشکری ئێرانی لەگەڵ سەید موحەممەدی موجاهیددا گەڕایەوە بۆ ئێران خەڵکی بە هیتافی مەرگ‌و ڕووڕەشی بۆسوپاو سەیدی موجاهید پێشوازیان لێ کردن‌و پیسایییەکی زۆریان هاویشتە سەیدو دارو دەستەکەی بەرامبەر ئەو کارەی کە کردی‌و ئێرانی بەرەو ئەو کارەساتە گەورەیە برد کە لە بیر ناکرێت.

لەمێژووی هاوچەرخیشدا کە سەردەمی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوعە ویلایەتی فەقیە بەشێوەیەکی توندتر لەسەر شانۆی ڕووداوەکان دەرکەوتو هەموو بەها ئیسلامییو مرۆڤایەتییەکانی ڕامالیو گرنگترین شت کە ئەم بیردۆزەیە مەحکوم دەکات ڕووداني ئەو ململانێ سەختەیە لەنێوان زانایان خۆیاندا دەربارەی بیرۆکەکەو چەوساندنەوەی لایەنی دەسەڵاتدار بۆ لایەنی ژێر دەست.

ئێمە لەم پەیامە ڕاست کەرەوەماندا نامەنەوێت ناوی کەسایەتییەکان بهێنینو ناو ڕیز بکەین، تاوەکو خەسڵەتی بێ لایەنی خۆی لەدەست نەدات کە گرنگترین مەرجەکانی هەر پەیامێکە کە بۆ خوا بێت، بەڵام ئەو ڕووداوانەی کە ئێمە ئاماژەیان پێدەدەین ڕوونن لەجێگەی خۆیانداو هەموو کەسێك کە بەئاگا بێت لەڕووداوەکانی جیهانی شیعە دەیانناسێت، چونکە ئەو ڕووداوانە لەبەرچاویاندا بووە یان گوێبیستی بوون، لەبەرئەوە ئێمە دڵنیاینو متمانەمان هەیە کە یەك شیعە نییە بتوانێ بڵێ ئەم کتێبە لەبەرخاتری ئەوان نووسرابێو داوای بەڵگە (دۆکیومێنت)مان لێبکات لەسەر ناوەرۆکی ئەم بەشە بە یاسکردنی ناوی سەرچاوەکان، چونکە ڕووداوەکانی ویلایەتی فەقیە لە نارەحەتییەکانی کۆمەڵگە شیعییەکانە، لە ئێراندا ڕووی دابێ یان شوێنی تر جیاوازی نییەو ڕوونترە لەخۆر لەناوەڕاستی ڕۆژدا.

ئەگەڕێینەوە سەر لێکۆڵینەوە لەسەر ولایەتی فەقیە لەهەردوو ڕووی تیۆریو کردەییەوە، بناغەی ئەم تیۆرە لەلای تێگەیشتوانی شیعە پشتی بەم ئایەتە بەستووە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ...) (النساء: ٥٩ ) زانایانی شیعە دەڵێن مەبەست لە (أولي الأمر) لەم ئایەتەدا خەلیفەیە یان ئیمامی عەلییە کە ئیمامی شەرعییە وە لەدوای خۆیشی نەوەکانی تا دەگاتە ئیمامی مەهدی.

وە لەکاتی دیارنەمانی ئیمامی مەهدیدا سەرپەرشتیاری بە دەست فەقیهە موجتەهیدەکانە: ئەوانەی کە جێگەی ئیمام دەگرنەوە کە بریتین لە جێگرە گشتییەکان.

هەڵەی ئەم لێکدانەوەیە لەخۆر روونترە، پێش هەمووو شتێك تیۆری ولایەتی فەقیه ناسازە لەگەڵ دەقێکی ئاشکرای قورئاندا کە پێگەو کاری فوقەها بە دەربڕینێکی دیارو ئاشکرا رون دەکاتەوە، یەکێك لەو شتانەی کە داخ و خەفەتە ئەوەیە کە هەموو ئەو کەسانەی کە بەدرێژی لە سەر پوچەڵ کردنەوەی تیۆری ویلایەتی فەقیه نووسیویانە باسیان لەم خاڵە جەوهەرییەی کە تیۆری ولایەتی فەقیه لە بناغەوە هەڵوەشێنێتو ئەیخاتە خانەی لەبیرچوونەوە تا رۆژی دوایی نەکردووە، ئەو ئایەتەی کە تیۆری ولایەتی فەقیه پوچەڵ دەکاتەوە باس لە سنووری کاری فوقەها دەکات ئەمەیە (وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ) (التوبة: ١٢٢ ).

ئایەتەکە ئاشکرایە کە ئەرکی فەقیه بریتییە لە گەیاندنو رێنماییکردن لەکاری دیندا و هیچ ئاماژەیەکی تێدا نییە بۆ واجب بوونی گوێڕایەڵی فەقیه، جێگەی سەرسامییە چۆن ئەم ئایەتە شاردراوەتەوە لەزانایانو لێکۆڵەرەوەان، ئێمەی شیعە وەکو تەواوی مسوڵمانانی تر یەك دەنگین لەسەر ئەوەی بەبوونی دەقی ئاشکرا ئیجتهادو هەڵهێنجان نییە، کەوابوو تیۆری ویلایەتی فەقیه ناکۆکی هەیە لەگەڵ قورئاندا، وە هەرکەسێکیش ناکۆکی هەبێت لەگەڵ دەقێکی خواییدا دادەنرێت بەدەرچوو لە ئیسلام.

با جارێکی تر بگەڕێینەوە سەر ئایەتەکە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ...) (النساء: ٥٩ ).

هەرکەسێك ئەم ئایەتە بخوێنێتەوە بەبێ ئەوەی بە ئارەزووی خۆی بەشەکانی لە یەك جیا بکاتەوە بە دڵنیاییەوە دەزانێت کە گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکان(أولي الأمر)[1] جیاوازە لە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بەڵکو گوێڕایەڵییەکی سنووردارە لە بازنەو چوارچێوەی کارەکانیدا، کە پەیوەستە بە والییەوە بە پێی سروشتی کارەکەی کە تەنانەت داوەری کردن لەو کێشانەی لە نێوان مەسوڵمانان لێ سەندراوەتەوەو گێڕراوەتەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر هەروەك دەقەکەی سەرەوە ئاماژەی پێ دەکات، ئایەتەکەش دیارو ئاشکرایە کە لەسەر ئەوانە دابەزی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەردەمی خۆیدا کردبوونی بە بەرپرسی مسوڵمانان، ئایەتەکە لەسەردەمی پێغەمبەرا دابەزیوە وە تایبەتە بەسەردەمی ئەوەو ئاماژە پێکردنەکەی کەسییە نەك گشتی.

ئەگەر واتای گشتی ئایەتەکەش وەرگرین کە لێپرسراوانی دوای سەردەمی پێغەمبەری خوا دەگرێتەوە ئەوە ڕوونە کە گوێڕایەڵی کردن لە فەرمانەکانیان سەبارەت بەو کێشانەی کە ڕوو ئەدەن لەنێوانّ مسوڵماناندا واجب(فەرز) نییە، ئەمەش مەسەلەیەکە لە دەسەڵاتی بەرپرسان کەم دەکاتەوەو دەسەڵاتی بێ قەیدو شەرتو دەسەڵاتی گشتی بەسەر هەموانا ناهێڵێت.

خۆزگە دەمزانی زانایانی شیعە چۆن ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر ویلایەتی فەقیهو مافی دەستخستنە ناو کاروباری سیاسیو ئابووریو

[1] بەداخەوە ئەم زاراوەیەی قورئان وەك زۆربەی زاراوەکانی تر ستەمێکی گەورەی لێکراوە کە (أولي الامر) بە خاوەن بڕیار لێکردراوەتەوە لەحاڵێکدا کە (اولی) لەزمانی عەرەبیدا کۆیە (جمع)ـە، واتە لێپرسراوەکانتان ، نەك لێپرسراوەکەتان . وەرگێڕ

سەربازی‌و کۆمەڵایەتی مسوڵمانانیان پێ بەخشیوە؟ ئەگەر بەرپرسی یەکەمی مسوڵمانان بۆی نەبێت بە بێ ڕاوێژکردن بە ئەهلی شورا دەست بخاتە ناو کێشەی نێوان مسوڵمانان وەکو لە قورئاندا هاتووە بۆ ئەوەی ناوی خواو پێغەمبەر (ﷺ) نەکرێتە بیانوویەك بۆ ئەوەی ویست و بۆچوونی خۆی بسەپێنێت بەسەر خەڵکیدا ئیتر ئایا دەکرێت بڵێین جێگری بەرپرسی یەکەم مافی زیاتری هەبێت لەخودی بەرپرس؟

لە ئێرانیشدا کە لانکەی ویلایەتی فەقیهە لەم سەردەمەدا کە ناومان نا سەردەمی ململانێی سێهەم لەنێوان شیعەو تەشیوعدا ویلایەتی فەقیه توانیویەتی بەشی پێشەوەی دەستووری ئێران داگیربکات‌و گرنگترین شوێنەکان لە دەستوور زەوت بکات‌و توانی دەسەڵاتی ڕەها بۆ خۆی دابین بکات لە وڵاتدا.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پارێزەرانی دەستوورو ئەوانەی دایانناوەو ئەوانەشی وا بەرگری لێدەکەن نەیانتوانیوە ئەو ناکۆکییە ئاشکرایەی نێوان پراکتیزەی کردەیی‌و تیۆرییە فیقهییەکە چارەسەر بکەن بۆیە تیۆرییەکە لەبەرچاو کۆمەڵگەی شیعەدا، لەگەڵ ئەو هەموو هێزە ماددییە گەورەیەی پشتگیری لێدەکات، بە تیۆرییەکی لاوازو بێ پێز تەماشا دەکرێت، وە لەسەروو هەموو جیاوازیی‌و ناکۆکییەکانەوە کە شیعە بەهەموو شوێنێکدا دەربارەی دەپرسنەوە ئەوەیە کە: ئایا ویلایەتی فەقیه پلەو پایەیەکی ئاینییە یان سیاسی؟

جا ئەگەر ویلایەتی فەقیه پلەو پایەیەکی ئاینینی بێت ئەوا نابێ بکەوێتە بەر پرۆسەی هەڵبژاردن‌و بۆ کەس نییە لای ببات‌و هەرکەسێك گەیشتە پلەی فەقیهی سیفەتی ویلایەت وەردەگرێت‌و پێویست دەبێت لەسەر مسوڵمانان

گوێڕایەڵی بکەنو ملەچی فەرمانەکانی بن، بەڵام ئەوەی ڕوویدا ئەوەبوو کە هەندێك لەوانە زیندانی کرانو دەرکرانو سوکایەتییان پێکراو هەندێکیشیان ئێستاش لە زینداندان بەهۆی هەڵوێستی فیکری یا سیاسی لە دەسەڵاتدار.

بەڵام ئەگەر ویلایەتی فەقیە پلەو پایەیەکی سیاسی بێت ئیتر بۆچی بەسترا بە دینو مەزهەبەوەو بەرگی عەقیدەی بەبەردا کراو گوێڕایەڵیو ملکەچی بۆ خاوەنەکەی فەرزکرا؟

پاشان لەڕووی کردەییەوە گوێڕایەڵیو ملکەچی ویلایەتی فەقیە چۆن دەبێت ئەگەر لە شارێکدا زیاتر لەیەك فەقیهی لێ بوو وە فەتواو بۆچوونکانیان جیاواز بوو؟ ئایا ئەو کاتە دەبێ مسوڵمانان گوێڕایەڵی کامیان بنو چۆن لەگەڵ ئەو بۆچوونە جیاوازو لێك نەچووانانەدا مامەڵە بکەن؟

بەڕاستی ئەگەر یاسایەکی وەها بدرێتە پاڵ ئیسلام ئەوە بەسوك سەیرکردنی ئەو ئاینە ڕاستەیە کە کە خوا ناردی بۆ بەرزکردنەوەی بەهاکانی مرۆڤایەتی.

تیۆری ولایەتی فەقیە ئێرانی تێپەڕاند وگەیشتە شوێنەکانی تری شیعەنشین ئەوەی کە  بە شیعەی ئێرانی کرد بەوانیشی کرد. وە من ئەترسم کە ئەمە ببێتە بەڵایەکی گشتگیر لەسەر شیعە لەهەموو شوێنێکو بەشێوەیەکی وەها ڕایان تەکێنێت کە ئیتر جارێکی تر ئاسوودەیی ڕوونەدات.

ئەگەر شیعە بیانزانیبایە کە چ کارەساتێك بەناوی ولایەتی فەقیهەوە کراوەو  ئەکرێت، ئەوا ئەم تیۆرەیان لەهەموو شارێکدا ڕیشەکەن ئەکردو مەڕ ئاسا خۆیان لەگورگ دوور ئەگرت، لە چرکەساتی نووسینی ئەم نووسینەدا لە ئێران شیعەدا کاردانەوەیەکی توند هەیە بەرامبەر بەمەزهەبو دەسەڵاتی فوقەهاو سەرچاوە مەزهەبییەکان ئەمەش دوای چەشتنی ئەو تاڵاوە بوو کە

گەلی ئێرانی بینی بەدەست ویلایەتی فەقیهەوەو نارەحەتییەکی وەها کە هەڕەشە لە کۆمەڵگەی شیعی دەکات لە ئێران بەدەرچوون لە ئیسلام کۆمەڵ بە کۆمەڵ.

بۆیە من دڵسۆزانە داوا لەخودا دەکەم کە ئەم پەیامە چاکسازیەم بگاتە دەستی شیعە لە ئێران بەر لەوەی فرسەت لەدەست بچێت بەڵکو حاڵی بن کە ڕێگەی ڕزگاری تەنها ڕووخاندن و ناڕزایی دەربڕین نییە ، بەڵکو دەست پێکردنی بنیاتنانەوەو چاککردنە.

بۆ ئەوەی کە خوێنەر وا بیر نەکاتەوە کە من مەبەستم کەسێکی تایبەتەییە لەو مەلایانەی کە جڵەوی دەسەڵاتیان بەدەستە بەناوی ولایەتی فەقیهەوە، پێم خۆشە بڵێم کە ئەوە بۆچوونێکی گشتییە هەمووی ئەگرێتەوە، مەبەستمان تاکە کەسێك نییە، وە ئێمە کاتێك بە بۆچوونێکی وردو پشکنەرەوە ئەڕوانینە ڕووداوە ئازار بەخشەکانی گۆڕەپانی ئیسلامیی‌و شیعە دەبینین کە ولایەتی فەقیه ڕۆڵێکی دیار دەبینێت لەڕووداوەکاندا، دژایەتی هەیە لەگەڵ بنەما سەرەکییە ئاشکراکانی ئیسلام، وە زۆربەی فوقەهاکان هەڵوێستی نەیارانەیان نییە لێی بەڵکو زۆربەیان لەنێوان پشتگیری لێکردن‌و بێ لایەنیدان مەگەر کۆمەڵێکی کەمیان نەبێت کە ژمارەیان ناگاتە ژمارەی پەنجەکانی یەك دەست.

## ڕاستکردنەوە:

ئەگەر شیعە بیانتوانیایە ئەو ڕێگە چاکسازیە کە ئێمە داوای دەکەین جێبەجێی بکەن بۆ ڕزگاربوون لەو سێ شتەی کە ئێمە ئاماژەمان پێدا لەم بەشەدا کە پەیوەندییەکی بنچینەیی بەوانەوە هەیە هەنگاوێکی گەورەیان

دەنا لەڕێگەی ڕاستکردنەوەداو دەروونی خۆشیان ئاسودە دەکرد وە لەو کۆت‌و پێوەندانەی کە پێچەوانەی فەرمانەکانی خوابوون‌و خەڵکیان پێ کۆت کردبوو ڕزگاریان دەبێت ئەو سی کارەش بریتین لە:

یەکەم: شوێنکەوتن یا لاسایی کردنەوە: کە بریتییە لە وەرگرتنی بۆچوونی موجتەهیدێك لە بابەتە شەرعییەکاندا وەکو ئەوەی کە زۆربەی شیعەکان دەیکەن و بەدەگمەن ماڵێك ئەبینی پەیامێك لەو پەیامە فقهیانەی تیا نەبێت کە موجتەهیدەکانیان نووسیویانە بۆ خەڵکی نەخوێندەورا، کە پێیان دە وترێت پەیامە کردەییەکان لە گەڵ زیادکردنی هەندێ ناو بۆیان وەکو توێشووی پیاوچاکان (ذخيرة الصالحين)و ڕێگای سەرفرازی (صراط النجاة)و توێشووی بەندەکان (ذخيرة العباد)و وێنەی ئەمانە.

کەسێك کەسەروکارو بەدواداچوونی هەبێ بۆ ئەم پەیامە کردەییانە ئەبینێت کە فوقەهاکان چەندین سەدەیەئێستاشی لەگەڵدا بێت یەکەم ڕووپەڕەی پەیامەکانیان بەم دەستەواژەیە دەست پێدەکەن.

هەر کەسێك کە تەکلیفی شەرعی لەسەرە یادەبێ موجتەهید بێ یان شوێن کەوتووبێ یان ئاگاداربێ لە سەرچاوەی بەڵگەکان،وەکردەوەی نەخوێندەوار لەبەشەکاندا (فروع) بەبێ شوێنکەوتن بەتاڵەو وەرناگیرێ.

ئەم تیۆرییەی کە فوقەهای ئیمامی لە دیارنەمانی گەورەوە تاکو ئێستا لەسەرکۆکن ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو کەسەی شارەزایە بە بەڵگەکان لەسەری نییە شوێنکەوتوو(لاسایی کەرەوە)بێت ڕای خەڵکی تر وەرگرێ.

بەڵام لە بنەماکانی باوەڕدا شوێنکەوتن دروست نییە بەڵکو واجبە لەسەر هەموو مسوڵمانێك بیروباوەڕەکەی لەسەرزانین‌و بەرچاوڕوونی بێ.

جا ئەو چارەسەرەی کە ئێمە دەیخەینەڕوو بۆ شیعەو داوایان لێدەکەین کە پەیوەست بن پێوەی بۆ دەستەبەرکردنی بەختەوەریان لە دونیاو دوارۆژدا

ئەوەیە کە لەسەر بەڵگە بڕۆن وەشوێنکەوتنی بەڵگە هیچ دەرچوونێکی تێدا نییە لە مەزهەب وپێچەوانەی کۆدەنگی زانایانی شیعە نییە وئەو دەرگایەشیان لەسەر دادەخات کە هانی خەڵکی بدەن دژی ئەم ڕاسکردنەوەیە هەڵسن یا لە سزای خوا بیانترسێنن.

بەڵام ئەگەر بابەتێکی تازە هاتە ئاراوە بۆ شیعە کە زۆر کەمن مەبەستمان لە بابەتی تازە ئەوانەن کە کتێبە فیقهییەکان لەمەوپێش باسیان نەکردوون، ئەو کاتە ئەکرێ ڕاوێژ بکرێت بە موجتەهیدێك یان چەند موجتەهیدێك بۆ چارەسەرکردنی.

من پشت بەخوا لەمەودوا ئەوە بۆ شیعە دابین دەکەم، بەدەرکردنی پەیامێکی کردەیی فقهی کە هەموو ئەو بابەتە کە مشتو مڕیان لەسەرە بگرێتە خۆ ئەویش بەهاوکاری زانایانو فوقەهای دڵسۆز کەمەبەستیان پاداشتو سوپاسی خەڵکی نەبێت لەبەرامبەر کردەوەکانیاندا.

## پێنجیەك

فوقەهای شیعەی ئیمامی کەوتنە ناو قەیرانێکی گەورەوە کاتێك یەك دەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە نیوەی پێنجیەك کە حەقی خواو پێغەمبەری خواو ئیمامی دیارنەبووە بدرێ بەو موجتەهیدەی کە خەڵکی نەخوێندەوار شوێنی دەکەونو نیوەکەی تریشی دابەش بکرێت بەسەر فەقیرە هاشمییەکانو هەتیوانو ئەوانەی کە لە ڕێگەوباندا پارەیان لێدەبڕێ، ئەوەیان لەبیرچوو ئەگەر ئەمە حوکمی شەرعی بێت دەربارەی شوێنکەوتوانی نەخوێندەوار، ئەی حوکم چییە دەربارەی ئەو کەسەی کە بۆچوونی یەك فەقیهی وەرنەگرتووە، ئایا پێنجیەکی لەسەر لائەچێ، یان ئەتوانێت بەهەرشێوەیەك کە بیەوێت خەرجی بکات.

لێرەوە دەردەکەوێ کە داهێنانی پێنجیەك بە تێگەیشتنێکی شەرعی لەگەڵ داکۆکی کردنی فوقەها لەسەری وردبینی تیا نییەو چەندەها بۆشایی تیایە کە بەڵگەی بەتاڵ بوونەوەیەتی بە ئاشکرا، داهێنانی پێنج یەك بە تێگەیشتنی شیعە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خواو خەلیفە ڕێنمونی کراوەکان و ئیمامانی شیعەیە چونکە پێنجیەك لە ئیسلامدا لەو کەلوپەلانەدایە کە لە شەڕدا گیراون (الغنائم) نەك لە قازانجی بازرگانیو شتی تایبەتیدا.

جا من لێرەوە داوا دەکەم لە شیعە لەم پەیامە ڕاست کەرەوەدا و هانیان ئەدەم کە ئەو پارەیە نەدەن بەهیچ فەقیهێك چونکە هیچ بەڵگەیەکی خوایی لەسەر نییە، لەژێر هیچ ناونیشانێکدا.

بەڵکو هانیان ئەدەم کە بەشداری بکەن لە کارە خێرخوازیەکانو هاوکاری هەژارانو ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان و پیشەییەکاندا ڕاستەوخۆ بەبێ ئەوەی کەسێك بکەوێتە نێوانیانەوە، وە بشزانن ئەو گەلانەی کە گەیشتوونەتە چڵەپۆپەی سەربەرزی بە هۆی دڵگوشادیو بەخشندەیی بووە، ئەگەر شیعە وتیان هاوکاری هەژارانو هەولدەرانو پیاوانی ئایینی بکەن ئەوە شتێکی چاكو جوانە، نەك یارمەتیان بدرێ بۆ جێبەجێ کردنی پێویستە تایبەتییەکانی خۆیانو ببنە هۆی گەیاندنو دابەشکردنی سەروەت بەسەر خەڵکی ترا کە تا ساتی نووسینی ئەم کتێبە هەربەردەوامە.

## ویلایەتی فەقیە:

من لێرەدا ئەوە دووبارە دەکەمەوە کە لەمەوپێش وتوومە کە باوەڕم وایە هیچ بیرو بۆچوونێکی ئاینی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بە ئەندازەی تیۆری ولایەتی فەقیە خوێنو خەفەتو ئازارو فرمێسکی بۆبەخەرج نەدراوە لەڕۆژی دەرکەوتنیەوە تاوەکو ئەمڕۆ، وە لەو بڕوایەشدا نیم کە پێویست بکات ئێمە داوا لە شیعە بکەین بەرهەڵستی ئەم بیروبۆچوونە بکاتو لە دژی بوەستێ، وە سوپاس بۆ خوا خۆی دەستی کردووە بەهەڵوەشاندنەوەی خۆی کاتێک ڕووخانی ناوەکی کارلێك دەکات لەگەڵ تیۆرێك یان بیروبۆچوتێك بەهۆی سەرنەکەوتنی لەبواری پراکتیك یان بەهۆی ئەو کارە خراپانەی کە بەناوی ئەوەوە دەکرێت ئیتر ئەو تیۆرە لەڕێگەی پوکانەوەو نەمانی تەواو دەچێت.

## زیادەڕەوی (الغلو)

(قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لاَ تَغْلُواْ فِي دِينِكُمْ غَيْرَ الْحَقِّ وَلاَ تَتَّبِعُواْ أَهْوَاء قَوْمٍ قَدْ ضَلُّواْ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيراً وَضَلُّواْ عَن سَوَاء السَّبِيلِ) (المائدة: ٧٧).

(کاتێك مرۆڤ دەگاتە پلەی کامڵیو بەرزدەبێتەوە بەسەر فریشتەکاندا، ئیتر بێنیاز دەبێت لەوەی شتی پڕوپوچو خەیاڵ ئامێز لەدەوری دروست بکرێت بۆ ئەوەی وێنەی پرشنگداری لێڵو تاریك بکات).

زیادەڕەوی (الغلو)

زیادەڕەوی تیۆری

زیدەڕەوی پراکتیکی(کردەیی)

١ـ زیادەڕەوی تیۆری:

زیادەڕەوی ڕواڵەتی زۆری هەیە کە بەزیادەڕەوی تیۆری دەست پێدەکاتو بەزیادەڕەوی کردەیی کۆتایی پێ دێت. بە کورتی زیادەڕەوی

تیۆری بریتییه له باوەڕی مرۆڤ بەوەی که کەسێك توانای هێنانی کەرامەت‌و موعجزات‌و شتی له یاسا بەدەرو ناسروشتی هەبێت که له توانای خەڵکی تردا نەبێت.

هەروەها باوەڕی مرۆڤ بەوەی که کسێك چ زیندوو بێت یا مردوو کاریگەری هەبێت لەسەر ژیانی خەڵکانی تر چ بە سوود پێگەیاندن یا زەرەر لێدان لەدونیاو قیامەتدا رواڵەتێکی گەورەیە له رواڵەتەکانی زیادەڕەوی.

ئەو زیادڕەوییە تیۆرییەی که له کتێبەکانی ریوایەت‌و حەدیسدا نوسراوەو ئەو شتە سەر سوڕهێنەر و لەتوانا بەدەرەی دراوەتە پاڵ ئیمامەکان‌و ئەولیاو مەشایخەکان هۆی گەشەسەندی زیادەڕەوی کردەیی و ئەو هەموو شتەن که خەڵکی عەوام دەیکات له سەر گۆڕی ئیمامەکان‌و ئەولیاو مەشایخدا له دەرخستنی پەرستش‌و پێشکەشکردنی قوربانی و ڕاستوخۆ داوای پێویستی کردن لێیان‌و چەندەها شتی تر که له ژماردن نایەن.

له ڕاستیدا زیادەڕەوی جێگەی خۆی کردووەتەوە له دڵی زۆربەی خەڵکیدا هەتا ئەگاتە نامسوڵمانەکانیش. کۆمەڵە ئیسلامییەکانی تریش وەکو شیعە زیادەڕەویان هەیە دەربارەی ئیمامەکان‌و ئەولیاکان سەلەفییەکان نەبێت که توانیویانە ئەو کۆت‌و پێوەندە بشکێنن که عەقڵ‌و دڵی خەڵکی پێ بەسترابوو.بەڵام ئەوەندە هەیە که شیعە زۆر پێش ئیسلامییەکانی تر کەوتووە لەم بوارەداو ئەم زیادە ڕەوییە زۆرەش دەگەڕێتەوە بۆ کتێبەکانی ڕیوایەتەکان که پاك نەکراونەتەوەو زانایانیش هەڵوێستیان نەبووە له پوچەڵ کردنەوەی ناوەڕۆکەکانیاندا. لەو کتێبانەی که بەلای شیعەوە پەسەندو متمانە پێکراون چیرۆکی وا باسکراوە لەسەر موعجیزەو کەرامەتی ئیمامەکان که هیچی کەمتر نییە لەو ڕوایەتانەی که لای ئیسلامییەکانی تر دەیبینین دەربارەی پیاوچاکان و ئەولیاو شێخەکانی تەسەوف.

من نامەوێ بچمە ناو ئەو چەلەقانێ نەزۆکەوە کە ئایا ئەم ریوایەتانە ڕاستن یا هۆندنەوەی خەیاڵن؟ وەلە سەردەمێکدا باسکراون کە دڵ و مێشکی ئەو خەڵکە سادەیە ڕازی نەبووەو ئارامی نەگرتووە تەنها بە بیستنی چیرۆکی وروژێنەر نەبێت لە ژیانی پیاوە گەورەکانیان،بەڵام ئەو خاڵە بنچینەییە کەمن پشتی پێدەبەستم لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەوەیە کە ئێمە وەکو مسوڵمانانو وەکو ئومەتێك باوەڕمان بەوە هەیە کە دەرهاوێشتە عەقڵییەکان زیاتر جێگەی ڕەزامەندی خەڵکنو شوێن کەوتەیان هەیە، ئەمەشە کە بێنیازمان دەکات لە ڕۆیشتن بەدوای تراویلکە (سراب)دا.

ئێمەی خەڵکانی شیعە بەتایبەتی کە ڕێچکەی عەقڵانیمان کردووە بەبەشێك لە هەڵهێنجانی یاسا فیقهییەکان ئەوەتا کولەینی لە (أصول الکافی)دا روایەتێك یەك لەدوای یەك (متواتر) لە ئیمام صادقەوە دەگێڕێتەوە کە (**أول ما خلق الله العقل، فقال له أقبل فأقبل، ثم قال له أدبر فأدبر، ثم قال فبعزتي وجلالي بك أعاقب وبك أثيب**)، واتە: یەکەم شت کە خوا دروستی کرد بریتی بوو لە عەقڵ، پێی فەرموو وەرە ئەویش هات، پاشان وتی پشت هەڵکەو بڕۆ، ئەویش ڕۆیشت پاشان فەرمووی بەعیزەتو گەورەیی خۆم بەهۆی تۆوە تۆڵە ئەسێنمو پاداشت ئەدەمەوە.

ئا لێرەوە شیعە ئەم یاسا عەقڵییەیان وەرگرتووە کە دەڵی (**کل ماحکم به العقل حکم به الشرع**) واتە: هەرشتێك عەقڵ پەسەندی کرد شەرعیش پەسەندی دەکات.

واتە ئەو شتانەی عەقڵ بەتەنیا خۆی دەتوانێت حوکمی بەسەردا بدات بۆ باشو خراپی شەرع هەمان بڕیاری هەیە، منیش دەپرسم: کوا هەڵوێستی عەقڵ لەم شتە پڕوپوچانەی ڕاوییەکان داویانەتە پاڵ ئیمامەکان لە

موعجیزەو کەرامەت؟ کوا هەڵوێستی عەقڵ لەو هەموو زیادەڕۆییەی ڕێگە لەمرۆڤ دەگرێت یادی خوا بکاتو ڕووی تێ بکات؟

پاشان بۆچی ئێمەی شیعە مافی ئیمامەکانمان نادەین لەو پلە بەرزەی کە داگیری دەکەن؟ ئەویش گەیشتنە پلەی مرۆڤی کامڵە کە لەخۆیدا موعجیزەیەکە لەسەرووی هەموو موعجیزەکانی ترەوە، لەفەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە(ﷺ):

"خودا مرۆڤی بەدیهێناو ژیریو شەهوەتی تێدا چاندو فریشتەی بەدیهێناو ژیری(عەقڵ) تێداچاندو ئاژەڵیشی بەدیهێناو شەهوەتی تێدا چاند، جا هەرکەسێك ژیرییەکەی زاڵ بێت بەسەر شەهوەتەکەیدا ئەوا لەمەلائیکە بەرزترەو هەرکەسێك شەهوەتەکەی زاڵ بێت بەسەر ژیرییەکەیدا ئەوا لە ئاژەڵ نزمترە.

ئەم پلە مرۆڤایەتییە بەرزەی خوا بەخشیویەتی بە ئیمامەکانو بەندە چاکەکارەکانی کە پێی گەیشتنە پلەیەکی بەرزتر لە پلەی مەلائیکە وایان لێدەکات پێویستییان بە هەڵبەستنی ئەو شتە پوچانە نەبێت بۆیان کە ئافرەتی کوڕ مردوو دەهێنێتە پێکەنین جگە لەوەش زیادەڕۆیی لە ستایشکردندا هەندێك جار وەردەگەڕێ بۆ شکاندن بۆ نمونە:

ئەو عیصمەتەی دەدرێتە پاڵ ئیمامەکان وەکو لە بەشەکانی پێشوودا باسمان کرد مەبەست لێی چەسپاندنی ئەو ریوایەتە درۆیانە بوون کە لەگەڵ ژیری و لۆژیکدا ناگونجێنو درانە پاڵ ئیمامەکان بۆ داخستنی دەرگای وتوێژ لەسەر ناوەرۆکەکانیان لەلایەن بلیمەتو ژیرەکانەوەو خەڵکی ناچار بکرێن بۆ قبوڵکردنیان چونکە لە کەسێکەوە دەرچوون کە هەڵە ناکات.

بەڵام عیصمەت لە ڕاستیدا کەم کردنەوەیە لە پلەی ئیمام نەك ستایشکردن بێت، چونکە لێکدانەوەی عیصمەت بەو شێوەیەی شیعە لێی

تێگەیشتوون واتە ئیمامەکان لەکاتی لەدایکبوونەوە تاوەکو ڕۆژی مردنیان بەویستی خوا هیچ گوناهێکیان نەکردووە، ئەمەش واتە لەدەستدانی ویست لەکردنی چاکەو نەکردنی خراپەدا، ناشزانم چ چاکییەك دەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی بەهۆی هێزو ویستێکی دەرەکییەوە لە خراپە دوورکەوێتەوە، بەڵێ ئەگەر عیصمەت بەو مانایە بێت کە ئیمامەکان لەگەڵ ئەوەی کە توانای خراپەکردنیان هەیە بەڵام لەبەر دەروون پاکی‌و ڕەوشت بەرزی سەرپێچی فەرمانەکانی خوا ناکەن، ئەم قسەیەش لەگەڵ ژیری‌و لۆژیکدا دەگونجێت، بەڵام لێرەشدا ناتوانین بڵێین ئەم دەروون بەرزییە تایبەتە بە هەندێك کەسی دیاریکراوەوە کە ئیمامەکانن بەڵکو سیفەتێکە هەموو مرۆڤێك دەتوانێت لەخۆیدا بەدی بێنێت ئەگەر بێتو سنوورەکانی خوا نەبەزێنێت‌و ملکەچی فەرمانەکانی بێت‌و خۆی دووربگرێت لەو شتانەی قەدەغەی کردووە لەسەری، قورئانیش نمونەیەکی جوان‌و وێنەیەکی کاریگەرمان بۆ باس دەکات لەو چاودێرییە خواییە لەسورەتی یوسفدا: "ئەو ئافرەتەی یوسف لەماڵیدا بوو داوای سەرجێیی لێکردو دەرگاکانی داخست‌و وتی وەرە بۆ سەرجێیی یوسف وتی پەنادەگرم بەخوا ئەو (مێردەکەت) ڕێزی لێگرتووم، ستەمکاران سەرفراز نابن، لەڕاستیدا ئەو ژنە نیازی سەرجێیی کرد لەگەڵ یوسفداو ئەویش ئەو نیازەی کرد ئەگەر ئەو بەڵگەیەی پەروەردگاری نەدیایە ئا بەوجۆرە بەڵگەمان نیشانی سویفدا بۆ ئەوەی خراپەو داوێن پیسی لێ دوور بخەینەوە لەبەرئەوەی کە ئەو لەبەندە چاك‌و هەڵبژاردەکانی ئێمە بوو" یوسف ٢٢-٢٣

زانستی لەدوننی[1] (لەلایەن خواوە بەبێ هەوڵی مرۆڤ) هەر لەم بابەتەیە، کەواتە چ هونەرێك‌و شانازییەك هەیە لەزانستێکدا بەبێ هەوڵ‌و کۆشش

---

[1] ئەو زانستەیە کە بە ئیلهام بەدەست دێت نەك بە هەوڵ‌و تێکۆشان .(نووسەر)

شیعەکان دەڵێن ئیمامەکانیان هەموویان لەم جۆرە زانستەیان هەبووە.(وەرگێڕ)

بەدەست هێنرابێت، لەمەش خراپتر ئەوەیە کە هەندێك لە زاناکانمان زۆر ڕۆچوونو دەڵێن ئیمام هەموو شتێك دەزانێتو زانیاری هەیە دەربارەی هەموو زانستو هونەرێك، نازانم چ هونەرێکی تێدایە ئەگەر ئیمام ئەندازیاریی یان زمانی یابانی بزانێت بەڵکو ئەوەندە بەسە کە زانایەکی ڕەببانی پارێزگاری شارەزابێت لەکاروباری ئاینندا، پاشان ئەگەر خوا لە قورئانی پیرۆزدا دەربارەی ئەو پەیامبەرەی کە ناردوویەتی بۆ خەڵکیو ڕوناکیو چرایە دەڵێت: "ئەی موحەممەد پرسیارت لێدەکەن لەبارەی ڕۆحەوە(کە چییەوچۆنە؟) بڵێ ڕۆح شێکە تایبەتە بە پەروەردگارمەوە وئێوە لە زانست شتێکی زۆر کەمتان پێدراوە" إسراء/ ٨٥.

هەروەها خوا زانینی غەیبو نادیاری لەلایەن پەیامبەرەوە ڕەت کردۆتەوەو فەرموویەتی: "ئەگەر من نادیارەکانم بزانیبایە خێرو خۆشی زۆرم بەدەست دەهێناو دووچاری هیچ زیانو ناڕەحەتییەك نەدەبووم" أعراف/ ١٨٨

ئیتر چۆن ڕێگە بەخۆمان بدەین سیفەتگەلێك بدەینە پاڵ ئیمامەکان بەرزتربێت لەوانەی دراونەتە پاڵ پەیامبەری خوا (ﷺ). بە نیسبەت ئەو موعجیزەو کەرامەتانەی لەلایەن پێغەمبەرانەوە جار جار ڕوویانددەداو قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێ دەدات ئەوە لەسەردەمی ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤایەتی بوو لەگەڵ پەیامەکانی ئاسمان و لە سەردەمانێکدا بوو کە مرۆڤایەتی نەیدەتوانی لەڕێگای لۆژیكو بەڵگەهێنانەوە لە چەمکە عەقڵییەکانو بەها بەرزەکان تێبگاتو پێویستی بە شێوازی تر هەبووە بۆ ئەوەی بخرێتە سەر ڕێگای باوەڕ بۆیە خوای گەورە پشتگیری پێغەمبەرانی کردووە بە موعجیزەو کەرامەت بۆ ئەوەی ببنە بەڵگەیەك لەسەر خەڵکیو خوا پێغەمبەری ئیسلامی ناردووە لەگەڵ موعجیزەیەکی هەتا هەتاییدا کە

قورئانی پیرۆزەو بەهاتنی موحەممەد کۆتایی هێنرا بە پێغەمبەرانو موعجیزەکانو ئاین دوا شێوەی خۆی وەرگرت وەکو لە قورئاندا بە ڕاشکاوی هاتووە: "ئەمرۆ ئاینەکەتانم بۆ تەواو کردو بەهرەی خۆمم بەتەواوی ڕشتە بەسەرتانداو ئیسلامم هەڵبژارد بە ئاینتان" المائیده/ ٣.

جارێکی تر دەڵێین: ئێمە باسی زیادەڕەوی تیۆری دەکەین لای شیعە پێش زیادەڕەوی کردەیی‌و دەرگا بەکراوەیی دەهێڵینەوە بۆ تاقمە ئیسلامییەکانی تر بۆ ئەوەی باسی ئەو زیادە ڕەوییە بکەن کە لە دڵی ڕۆڵەکانیانو ناواخنی کتێبەکاندا هەیە.

ئەوەی بەڕاستی جێی داخ‌و کەسەرە ئەوەیە کە زیادەڕەوی تیۆری هەروەکو زیادەڕەوی کردەیی چۆتە ناخی دڵەکانەوە لەڕێگای زانایانو موجتەهیدەکانی مەزهەبەوە، کەواتە بەرپرسیاریەتی یەکەم‌و کۆتایی دەکەوێتە ئەستۆی ئەوان چونکە ئەوانن کە ئەو خەڵکە ڕشۆکە ڕێنمایی دەکەن، شتگەلێکی زۆر هەیە کتێبەکانی شیعە داویانەتە پاڵ ئیمامەکانو زانایانی مەزهەب پەیڕەویان کردووەو لە کتێبە بڕوا پێکراوەکانی فەرمودەی شیعەدا هاتووە وەکو (أصول الکافی)و (الوافی)و (الاستبصار)و (من لایحضره الفقیه)و (وسائل الشیعة)و چەندینی تر لە کتێب‌و سەرچاوەکانی شیعە کە لەزۆرێکیاندا (ریوایەتەکان) زیادەڕۆیی هەیەو لەزۆرێکیشاندا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ سوککردنی ئیمامەکانی تێدایە، وە لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە هەندێك لەزانایانو موجتەهیدەکانمان بێبەری دەکەین لەو زیادەڕەویە کە هەڵوێستێکی میانڕەووبەئینصافیان هەبووە لەزیادەڕۆیی تیۆری‌و کردەیی بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان بە ڕێگەی زیادەڕۆییدا ڕۆیشتوون هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی. گرنگترین بوارەکانی زیادەڕۆیی ئەمانەن:

١ـ عیصمەت.

٢ـ زانستی لەدوننی (لەلایەن خواوە بێ هەوڵو کۆشش).

٣ـ ئیلهام.

٤ـ موعجیزەی ئیمامەکان.

٦ـ هەواڵ دان لە داهاتوو.

٧ـ ماچکردنی گۆڕەکانو داوای یارمەتی لێکردنیان.

لێرەدا حەزدەکەم بەڕوونیو ڕاشکاوی ئەوە بڵێم کە من کاتێك داوای لە بێژنگدانو بژارکاری کتێبە شیعییەکان دەکەم لەو ڕیوایەتانەی کە لەجێی ئەوەی عەقڵی مرۆڤایەتی پرشنگدارترو دامەزراوتر بکات زیانی پێگەیاندووە، داوا لە زانایانی تاقمە ئیسلامییەکانی تر دەکەم ئەوانیش لەلای خۆیانەوە کتێبەکان لەبێژنگ بدەنو بژارکاری بکەن لەو ڕیوایەتانەی لەڕووی لاوازیو ناپەسەندییەوە لەو ڕیوایەتانە کەمترنین کە لە کتێبەکانی شیعەدا هاتوون.

زیادەڕەوی کردەیی:

زیادەڕۆیی کردەیی بەرجەستە دەبێت لەداواکردنی پێویستییە دونیاییو قیامەتییەکان لە ئیمامەکانو داوای یارمەتی لێکردنیان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، هەروەها ماچکردنی قەبرەکانیان شتێکی بەربڵاوە لەناو شیعەدا.

بەڕاستی بێزارو بێتاقەت بووم لە گفتوگۆکردن لەگەڵ زاناکانماندا دەربارەی ماچکردنی قەبرەکانو داوای پێداویستی لێکردنیانو خوێندنەوەی زیارەتنامە[1] لەبەردەم قەبرەکانیاندا لە جیاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز،

[1] بەشێکی تایبەتمان بۆ ئەم بابەتە تەرخان کردووە. نووسەر

بەلآم هیچ وەلآمێکم لێ نەدەبیستن جگە لەدووپات کردنەوەی چەند قسیەك، ئەویش بیانوو هێنانەوەیە بەماچکردنی (حجر الاسود) لەلایەن پێغەمبەری ڕێزدارەوە، لەکاتێکدا کە ئەو کارەی پەیامبەر (ﷺ) بە سوننەت دەژمێردرێت بۆ شوێنێکی تایبەت کە خەلیفە عومەر لەبەردەمیدا وەستاو وتی: "تۆ بەردێکی نە زیان دەگەیەنیو نەسوود بەلآم بینیم پێغەمبەری خوا ماچت دەکات منیش ماچت دەکەم"

وە پێغەمبەری ڕێزدار (ﷺ) هەرگیز لێنەدەگەڕا کەس دەستی ماچ بکات بەڵکو تەوقەی لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکرد کە دەهاتنەلایو سەردانیان دەکرد، هەروەها نەمانبیستووەو نەمانخوێندۆتەوە کە ئیمامی عەلی ڕێگەی بەکەس دابێت دەستی یان جلەکەی ماچ بکات، ئەوە ئیمامی جەعفەری صادقە تووڕەدەبێت لە پیاوێك کە دەیەوێت ئەو گالۆکە ماچ بکات کە خۆی دەدا بەسەریدا لەڕۆیشتنداو پێی دەڵێت: "بەلاَ لێتدا ئەوە خوێنو گۆشتی پێغەمبەرە (ئاماژە بۆ دەستی دەکات) بۆچی ماچی شتێك دەکەیت نە سودت پێدەگەیەنیو نەزیان"

لەهەموو شت سەیرتر ئەوەیە کە زانایانمان بەڵگە بەماچکردنی بەردەڕەشەکە دەهێننەوە لەلایەن پێغەمبەرەوە بۆ ماچکردنی گۆڕەکان لە کاتێکدا کە ئەوان دژی پێوان (قیاس)ن لە هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکانداو لەجیاتی پێوان بەڵگەی عەقڵییان بەکارهێناوە بەلآم لەو شوێنانەی کە بەرژەوەندی خۆیانی تێدایە کاری پێدەکەن.

سەردانی مەزاری ئەولیاو پیاوچاکانم کردووە لەزۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکانداو زیارەتکەرانی ئەو شوێنانەم بەهەمان شێوەی ئەوانەی لای خۆمان بینی کە زیارەتی گۆڕی ئیمامەکان دەکەن، وە چوومەتە کەنیسەی

مەسیحییەکان لەزۆرێك لە وڵاتانی دونیادا، لەو شوێنانەش خەڵکیم بەهەمانشێوە بینی، ماچی پەیکەرەکەی مەسیحو قاچەکانی مەریەمی عەزرا دەکەنو خوایان خستووەتە لاوەو داوای یارمەتی لەوان دەکەن بۆ دونیاو قیامەت، وە چوومەتە پەرستگای بوزییەکانو شنتۆو هندۆسو سیخەکان، لەوانیش هەمان ئەو شتانەم بینی کە لە مەزارگای مسوڵمانانو مەسیحییەکاندا بینیم لە پێشکەشکردنی قوربانیو داوای یارمەتیو ماچکردنی پەیکەرەکانو سوجدەو کڕنوش بردن لەبەردەمیانداو بە ئارامیو ملکەچیەوە وەستان بەرامبەریان، بەو شێوەیە مرۆڤایەتیم بینی لە تراویلکەیەکی پڕ لە خەیاڵی بەتاڵ (سراب من الوهم)و ئەو زانایانەم زۆر بەرزنرخاند لەوێنەی ئیبن حەزمو ئەوانەی شوێن پێیان هەڵگرتبوو کە خوا عەقڵو ژیرییەکی گەورەی دابوونێو کردبوویانە مەشخەڵێك بۆ خۆیانو خەڵکی ترو بەچەندین سەدە پێش سەردەمی خۆیانیان دابوویەوەو گاڵتەو نەفرەتیان لەم جۆرە کارانە دەکرد، با پێکەوە ئەم ئایەتانە بخوێنینەوە کە بە ڕوونی وڕاشکاوی چارە سەری ئەم مەسەلەیە دەکەن:

١ـ "ئەی موحەممەد بڵێ من خاوەنی هیچ سودو زیانێك نیم بۆخۆم مەگەر ئەوەی خوا بیەوێت وە ئەگەر من نادیارەکانو داهاتووم بزانیبایە خێرو خۆشی زۆرم بۆ خۆم بەدەست دەهێنا وە هیچ خراپەو زیانێکم پێنەدەگەیشت، من تەنها ترسێنەرو مژدەدەرم بۆ خەڵکانێك کە باوەڕدەهێنن" أعراف/ ١٨٨

٢ـ من (مەبەست پێغەمبەرە (ﷺ)) پێتان ناڵێم گەنجینەکانی خوام لایەو ناشڵێم غەیبو نادیارەکان دەزانم وە ناڵێم من فریشتەم" هود/ ٣١.

٣ـ "بڵێ (ئەی موحەممەد) جگە لەخوا هیچ کەسێك لەوانەی لە ئاسمانەکانو سەرزەوین غەیب نازانن" النحل/ ٦٥.

٤ـ "وە ئەگەر بەندەکانم پرسیاری منیان لێکردی ئەوا من نزیکم وەڵامی نزای نزاکاران دەدەمەوە" البقرە/ ١٨٦

٥ـ "سوێند بێت ئێمە ئادەمیمان بەدی هێناوەو چاك ئاگادارین لەو خەیاڵو خەتەرانەی دێت بەدڵو مێشکیاندا و ئێمە لەوەوە نزیکترین لە شادەماری دڵی" ق/١٦.

## ڕاستکردنەوە:

جارێکی تر دەگەڕێینەوە بۆ بیرۆکە ڕاستکەرەوە گەورەیە ئەویش بژارکردنو لەبێژنگدانو پاڵاوتنی کتێبەکان لەو خڵتەو ریوایەتە ناڕاستانەی تیایاندا هاتووە، وە ئەگەر لەمەوبەر ناوی هەندێك لەو کتێبانەمان هێنا کەلای زانایانی شیعە پەسەندو جێی متمانەیەو لەسەردەمی یەکەمی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوعدا نووسراونەتەوە بەڵام ئەوەش گرنگە کە بڵێین ئەو کتێبانەی لەسەردەمی دووەمی ململانێدا نووسراوەتەوە، واتە لەسەردەمی سەفەوییەکاندا زۆر لەوانە خراپترن کە لەوەوبەر نووسراونەتەوەو هەندێك لەم کتێبانە قسەو شتی وا سیەری لەخۆگرتووە کە هیچ ژیرێكو هیچ هەوادارێکی ئەهلی بەیتی پێغەمبەر (ﷺ) پەسەندی ناکات، وە بەگونجاوی دەزانم کە لێرەدا بە شێوەیەکی تایبەت ئاماژە بە کتێبی (بحار الأنوار)ی مەلا موحەممەدی باقری مەجلسی بدەم کە بەزمانی عەرەبی نووسیویەتی زیاد لە بیست بەرگە[1] لەڕاستیدا ئەم کتێبە فراوانە یەکێکە لە بەکەڵکترینو زیانبەخشترین کتێب چونکە لەوکاتەی کە کلتورێکی دەوڵەمەندی

---

[1] لەم دواییەدا لە (١١٠) بەرگدا چاپ کراوەتەوە.

لەخۆگرتووە کە توێژەرو زاناکان سودی لێوەردەگرن لەهەمان کاتدا قسەی زیانبەخشی واو بابەتی کرچو کاڵی وای تێدایە کە زۆر زیان بە شیعەو یەکبوونی ئیسلامی دەگەیەنێ، وە لەگەڵ ئەوەی نووسەر دان بەوەدا دەنێت کە کتێبەکەی کە ناوی ناوە دەریای ڕوناکییەکان وەکو دەریا وایە شتی بەکەڵکو بێ کەڵکیشی تێدایە بەڵام بەداخەوە ئەو شتە زیانبەخشانەی کەتێیدایە لەهەموو نووسراوێکی تر زیاتر زیانی بە شیعەو یەکبوونی ئیسلامی داوە.

نووسەر بەشێکی زۆری لە کتێبەکەی تەرخان کردووە بۆ موعجیزەو کەرامەتی ئیمامەکانی شیعە کە پڕن لەزیادەڕۆیی‌و شتی وا سەیر کە دەشێت بۆ خڵەفاندنی منداڵان باس بکرێت.

لایەنی تری ڕوخێنەری ئەم نووسینە بەرفراوانە بریتییە لەو قسە ناشیرین‌و جنێوانەی بە خەلیفە ڕاشیدەکان دراوە کە هەندێك جار شتی قێزەونن کە بوونەتە کەرەسەیەکی باش بەدەست بازرگانانی تایەفەگەرییەوە بۆ ئەوەی ئاگری ناکۆکی‌و دوژمنایەتی لەنێوان شیعەو سوننەدا گەرمتر بکەن‌و تاکو ئێستاش ئەو کتێبانەی دژی شیعە دەنوسرێن بەشێوەیەکی تایبەت‌و ڕاستەوخۆ ئاماژە بە کتێبەکانی مەجلیسی دەدەن، هەروەها مەجلیسی کتێبێکی بە زمانی فارسی نووسیوە لەناوەرۆکدا کەمتر نییە لە کتێبە عەرەبیەکەی، گومانیشی تێدان نییە کە لەسەردەمی مەجلیسی‌و پشتیوانیکردنی ڕژێمی فەرمانڕەوا لەمەزهەبی شیعەو لە زانایانی شیعە گرنگترین هۆکاری نووسینی مەوسوعەی (بحار الانوار) بوون، ئەو کتێبەی کە دابینکەری ناکۆکی ئیجگاری‌و هەتاهەتاییە لەنێوان شیعەی ئێران‌و زۆرینەی موسوڵمانان کە خیلافەتی ئیسلامی عوسمانی دراوسێیان بەناوی ئەمیرولموئمنینەوە فەروانڕەوایی دەکردن.

مەجلیسی کە لە ساڵی ١٠٣٧ی کۆچی لەدایکبووەو لە ساڵی ١١١١ك مردووە هاوچەرخی شا سولەیمانو سوڵتان حوسێنی سەفەوی بوو وە پلەی شێخ الاسلامی پێدرابوو، کارو باری ئاینی لە ئێراندا درابووە دەستی ئەو بە فەرمانی ئەو دوو پاشایەی کە لە پرشنگدارترین سەردەمەکانی سەفەویدا فەرمانڕەوایی ئێرانیان دەکرد.

پێش زیاتر لە (٣٠) ساڵ کاتێك چاپخانەیەك لە ئێراندا ویستی کتێبی (بحار الانوار) چاپ بکاتەوە لەسەد بەرگدا ئیمامی تەباتەبایی بروجەردی پێشەوای گەورەی شیعەی ئەو سەردەمە فەرمانی دا کتێبەکە بپاڵێورێتو هەموو ئەو ریوایەتو چیرۆکانەی بریندارکردنی خەلیفەکانی تێدایە لابرێت، بەڵام بڵاوکەرەوەی کتێبەکە کەگەورەترین بازرگانی تایفەگەرێتی بووە بەهاوکاری لایەنگەلێکی گومان لێکراو دەستی کرد بە چاپکردنی کتێبەکەو خستییە کتێبخانەکانەوە بۆ ئەوەی ببێتە سوتەمەنییەکی نوێ بۆ ورژاندنی بوغزو کینە و ناکۆکی نێوان مسوڵمانان، وە لەم دواییەشدا هەواڵم پێگەیشت کە ئەو مەوسوعەیە جارێکی تر لە لوبناندا بە یارمەتی لایەنگەلێك کە پەیوەندی بەتینیان هەبوو لەگەڵ داگیرکەراندا کە سیایەتی (ناکۆکی بخە نێوان خەڵکییەوە زاڵ دەبێ بە سەریاندا) یان گرتۆتە بەر چاپکراوە.

وە لە چوارچێوەی باسکردنی بژارکردنو پاڵاوتنی کتێبەکانی فەرمودەی شیعەدا پێویستە زۆر بە ڕاشکاوی ئەوە بڵێین کە ئەو بەرگرییەی هەندێك لە زاناکانی مەزهەبمان دەیکەن ئەوەیە کە زانستی فەرمودەناسیو زانستی ناسینی پیاوانی زنجیرە پشتیوانی لەڕاستی ئەو ریوایەتانە دەکەن کە دراونەتە پاڵ ئیمامەکانی شیعەو دەرکەوتنی هەندێك موعجیزەو کەرامەت لەسەر دەستیان.

خۆزگە دەمزانی کامیان باشترە بۆ وەرگرتن پەیڕەوی لێکردن، زانستی فەرمودەناسیو پیاوانی فەرمودە ناسی یان کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی پاشانیش عەقڵو لۆژیكو بەڵگە؟ پێغەمبەری خواش دەفەرموێت: "هەرشتێك لەگەڵ قورئاندا گونجا وەریگرنو هەرچی پێچەوانەی بوو فرێی بدەن"[1]

پێش ئەوەی کۆتایی بەم بەشە بێنم پێویستە ئاماژە بە بابەتێکی زۆر گرنگ بدەم ئەویش ئەوەیە کە زۆربەی زانایانی مەزهەبو لایەنە پەیوەنددارەکان لە کارو باری شیعە بۆ ڕەتکردنەوەی پالاوتنی ئەو کتێبانە لەو بابەتانەی پشتی یەکبوونی ئیسلامی دەشکێنن بیانوو بەوە دێنێتەوە کە کتێبەکانی سوننەش پڕن لە جنێوو سوکایەتی کردن بە شیعەو تۆمەتبارکردنیان بە زەندەقەو کفرو دەرچوون لە ئیسلام.

ئێمە ڕاشکاوانە قسەیان لەگەڵ زانایانماندا کردووە لە مەزهەبی شیعەداو پێمان وتن کتێبەکانی ئێوە توانج لە خەلیفە ڕاشیدەکانو خێزانەکانی پێغەمبەرو یارانی دەگرن کە پلەو پایەیەکی زۆر گەورەیان هەیە لە دڵی مسوڵماناندداو بریندارییان دەکەن لە کاتێکدا کە ئەهلی سوننە شتانێکی لەم جۆرە بە ئیمامەکانی شیعە نالێن بەڵکو ڕێزیان لێدەگرنو بە باشی باسیان دەکەن بەڵام کاتێك دەیانەوێت بەرگری لە بەڕێزترینو خۆشەویستترین کەسانێك بکەن کە بەدرێژەدانی سەردەمی پەیامبەری دەزاننو دەبینن کتێبەکانی شیعە بە جۆرێکی نەشیاو باسیان دەکەن ناچارن تیرەکانیان ئاراستەی سنگی ئەو کەسانە بکەن کە ئەو جۆرە قسانەیان لە کتێبەکانیاندا

---

[1] راوییەکانی سوننەو شیعە کۆکن لەسەر ڕاستی ئەم فەرمودەیە (نوسەر).

نووسیوە، لێرەوە دەتوانین بڵێین کاریگەری کتێبە شیعییەکان کە بریندارکردنی خەلیفەکانو خێزانەکانو یارانی پێغەمبەری تێدایە گەورەترەو قورسترە لەسەر دڵی سوننە لەوەی کە ئەوان بە شیعەی دەڵێن، وە لەبەرئەوەی ئێمە دەمانەوێت بەویستی خوا ئەم ناکۆکییە هەتاهەتایە نەهێڵینو چارەسەری ڕاستکاری پێشکەش دەکەین پێویستە ڕێگای ڕاشکاوی بگرینەبەر بە تایبەت لە وێستگەیەکی ئاوهادا لە بەرمبەر خواو مێژوو مسوڵمانانداء بۆیە دەڵێین: لەهەندێك لە کتێبەکانی ئەهلی سوونەدا بریندارکردن بۆ هەندێك لە ئیمامەکانی شیعە بەدی دەکرێت، وە مەبەستیشمان لە ئیمامەکانی شیعە لێرەدا ئیمامەکانی ئەهلی بەیتەو لەڕووی مەجازەوە پێیان دەڵێین ئیمەکانی شیعە ئەگینا ئیمامەکانی ئەهلی بەیت لەوێنەی ئیمامی حەسەنو حوسەینو زەینەلعابدینو ئەوانی تریش ئیمامی ئەهلی سوننەشنو هەرکەسێك قسەیان پێ بڵێتو بریندار‌یان بکات لای سوننە تاوانبارە.

ئاشکراشە کەمن مەبەستم لەو نووسەرە خەواریجانە نییە کە هەڵوێستیان لە ئیمامی عەلی ئاشکرایە[1]، وە لەگەڵ ئەوەی کە دان بەوەدا دەنێم کە ئەو جۆرە کتێباتە ئێجگار کەمن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بازرگانانی تایەفەگەریو ئەوانەی نایانەوێت یەکێتی ئیسلامی سەربگرێت پشتی پێدەبەستنو دەیکەنە بیانوویەك بۆ وروژاندنی ناکۆکی نێوان مسوڵمانان.

وە من دڵسۆزانە لەخوا دەپاڕێمەوە کە یارمەتی چاکسازان لە ئوممەتی موحەممەد (ﷺ) بدات بۆ پاڵاوتنو بژارکردنی کتێبەکانیان بۆ ئەوەی کارەکەمان هەمە لایەنەو گشتگیرانە بێت.

---

[1] خەواریجەکان ئیمامی عەلی بە تاوانبارو یاخی دەزانن. (وەرگێڕ).

## چەند سەرنجێك:

لەبەر ئەوەی کە نووسەر ئەم کتێبەی بۆ شیعە نووسیوە زۆر بە درێژی باسی هەندێك لە مەسەلەکانی نەکردووە لەوانە بابەتی زیادەڕەوی لە ئیمامەکاندا کە قسەی زۆر زیاتر و گفتوگۆیەکی عەقڵی زۆر هەڵدەگرێت و تەنها بە ڕیز کردنی ناونیشانەکانی بابەتەکان لە کتێبێکی باوەڕپێکراوی وەکو الکافی یان هەر کتێبێکی تری فەرمووده قەوارەی ئەو زیادەڕەوییە دەردەکەوێت،بۆ نموونە: ئیمامەکان دەزانن کەی دەمرن و مردنیشیان بە ویستی خۆیانە، ئیمامەکان زانستی سەرەتاو کۆتایان پێیەو هەموو کتێبە ئاسمانییەکانیان لایە بەو زمانانەی پێی دابەزیون و هەموو ئەو زمانانەش دەزانن، ئیمامەکان دەسەڵاتیان بەسەر هەموو گەردیلەکانی گێتیدا هەیە، ئیمامەکان لە لێپرسینەوەی خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا بەشدارن و ئەوەی ڕایان لێنەبێت ناچێتە بەهەشت،ئیمامەکان لە پێغەمبەران گەورەترن،بیروباوەڕیان دەربارەی گەورەتری کەربەلا لە مەککەو مەدینە،ئەمانەو دەیان شتی تر کەدەبوایە نووسەر گفتوگۆی لەسەر بکردایە لەبەر ڕۆشنایی قورئان و لۆژیك و قسەی ئیمامەکان خۆیان وژیانی ئیمامەکان چونکە بەڕاستی بە تەماشاکردنێکی خێرا بۆ ژیانی ئیمامەکان دەردەکەوێت هەرچی دراوەتە پاڵیان هەمووی خەیاڵەو پێچەوانەی ژیانیانەو لە هۆنینەوەی پێشەوایانی مەزهەبە.سەیریش لەوەدایە کە ڕۆژهەڵاتناسێکی وەکو دوایت دۆناڵدش پەی بەم ڕاستییە بردووە کەچی شیعە دەرکیان نەکردووە، دوایت لە کتێبی عقائد الشیعە دا دەڵێت "ئەگەر بە وردی ژیانی ئیمامەکانی شیعە بخوێنینەوە ڕاستییەکی زۆر گرنگمان دەست دەکەوێت ئەویش ئەوەیە کە پیاوانێك هیچ شتێکیان لە ئاستی خەڵکی ئاسایی زیاتر نەبوو کەچی برانە ڕیزی

نەمرەکانەوە، ژیانیان خالّی بوو لە هەر جۆرە پیرۆزی و بەرزکردنەوە و شکۆدارییەك کەچی دواتر چیرۆکی وایان بۆ هەلّبەسترا کە بیانباتە ڕیزی پیرۆزان وپێغەمبەران و خواکانەوە. ل ٥٨

بەکورتی ئەم بابەتە،واتە زیادەڕوەی لە ئیمامەکاندا نووسینێکی تایبەتی دەوێت ومادەیەکی بە پیتە بۆ گفتوگۆ لەبەر ڕۆشنایی ئەو پێوەرانەی باسمان کرد بەتایبەتی ژیانی ئیمامەکان کە کەفیلە بە هەلّوەشاندنەوەی هەموو بیروباوەڕەکانیان دەربارەیان.

جا ئێستا بابزانین ئەو زیادە ڕەوییە دەربارەی ئیمامەکانیان لەگەلّ قورئان و عەقیدەی ئیسلامی و ژیانی ئیمامەکان خۆیان و لۆژیکدا دەگونجێت یان نا ؟.

لەڕاستیدا عەقیدەی شیعە دەربارەی ئیمامەکانیان وە ئەو شتانەی شیعە دەیلّێن دەربارەی ئیمامەکانیان لەگەلّ چوارشتدا دژایەتی هیەیە:

١. قورئان ٢. تەوحید ٣.عەقلّ و لۆژیك و ٤.ژیانی ئیمامەکان:

١. قورئانی پیرۆز ئەویش بەوەی کە:

أ- بەرزترین پلە لەبەهەشتدا بۆ پێغەمبەرانە پاشان صدیقەکان و ئینجا شەهیدان و پاشان پیاوچاکان. وەکو خوادەربارەی ئەو ئیماندارانەی کە گوێڕایەلّی لەفەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن دەفەرموێت ئەوان لەگەلّ ئەو کەسانەدا کە خوا نازو نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕژندوون. لە پێغەمبەران و صدیقەکان و شەهیدەکان و پیاوچاکان: (وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقاً) (النساء:٦٩).

ب) زانینی غەیب تایبەتە بەخواوە و تەنها لەهەندێك جاردا هەندێك شت بۆ نێرراوەکانی خۆی دەردەخات: (عَالِمُ الْغَيْبِ فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ

أَحَداً)(الجن:٢٦)، ( إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ.. )(لقمان: الآيه٣٤)

تەنانەت پێغەمبەرانیش و لە پێش هەمووشیانەوە سەروەری پێغەمبەران محمد(ﷺ) غەیب نازانن و هەموو پێغەمبەران بە قەومی خۆیانیان وتووە ئێمە غەیب نازانین: ( قُلْ لا أَقُولُ لَكُمْ عِنْدِي خَزَائِنُ اللَّه وَلا أَعْلَمُ الْغَيْب وَلا أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ..)(الأنعام: الآية٥٠)،

(وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ)(لأعراف: من الآية١٨٨).

جـ) هیچ کەسێك نازانێت کەی دەمرێت: ( وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ان الله عليم خبير)(لقمان: الآيه٣٤)

د) پێغەمبەری خواش زۆرشت هەبوو لە ڕابردوودا ڕووی دابوو، تاوەحی بۆ نەهاتایە نەیدەزانی وەزۆرجار کە پرسیاری شتێکیان لێدەکرد دەیفەرموو چاوەڕوانی نیگا بن وەکو بەسەرهاتی (أصحاب الكهف).

هـ) تەنانەت پێغەمبەری خوا نەیفەرمووە من هەمو کتێبە ئاسمانەیەکانم لایەو هەرهەمووی بەزمانەکەی خۆی دەزانم و هیچ کەسێکیش ئەو شایەتییەی بۆنەداوە.

٢. عەقیدەی تەوحید/ ئاشکرایە کە لە عەقیدەی ئیسلامیدا خوای گەورە خاوەنی گەورەترین تواناو دەسەڵاتە و توانا و دەسەڵاتی ڕەهای هەیە بەڵام شیعە کاتێك دەڵێن هەموو گەردیلەکانی گێتی لەژێر دەسەڵاتی ئیمامەکانماندایە ئەمەش بەخشینی دەسەڵاتی ڕەهایە بە ئیمامەکانیان، واتە لێرەدا بەخوایان شوبهاندوون.

هەروەها زانینی غەیب تەنها تایبەتە بەخواوە بەڵام ئەمان لەم سیفەتەشدا ئیمامەکانی خۆیانیان بەشدارکردۆتەوە لەگەڵ خوادا.

هەروەها زانستی ڕەها تایبەتە بە خواوە کە برتییە لە علمی (ماکان و مایکون و ماهو کائن) بەڵام شیعە ئەم سیفەتەشیان بڕیوەتەوە بەسەر ئیمامەکانیاندا.

خوا دەفەرموێت: ( وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجيب دعوة الداع اذا دعان فليستجيبوا لي وليؤمنوا بي لعلهم يرشدون)(البقرة: الآية١٨٦)

وە پێغەمبەریش دەفەرموێت: (وإذا سألت فأسأل الله ).

وە خوای گەورەش دەفەرموێت: (وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لا يَمُوتُ) (الفرقان: من الآية٥٨)

کەچی شیعە هاوار بەئیمامەکانیان دەکەن و لێیان دەپاڕێنەوە و وادەزانن لەپاش مردنیشیان دەتوانن دەست بخەنە دونیاو ژیانی خەڵکییەوە.

وەهەروەها لە عەقیدەی تەوحیدا سوود گەیەنەرو زەرەر گەیەنەر تەنها خوایە وە لەناوە پیرۆزەکانی خوا (النافع والچار) بەڵام شیعە وادەزانن ئیمامەکانیشیان سوود و زیان بەخەڵك دەگەیەنن.

لە عەقیدەی تەوحیدا قوربانی کردن و نەزرکردن بۆ غەیری خوا نابێت بەڵام شیعە بۆ ئیمامەکانیان دەکەن.

( قُلْ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) (الأنعام:١٦٢)

وەکو ئاشکرایە پێغەمبەر(ﷺ) بۆئەوەی ڕێگا بگرێت لە شرك نەهی کردووە لە هەڵگرتنی قەبرو دروستکردنی مزگەوت لەسەر قەبران بەڵام دەبینی شیعە ئەو مزگەوتانە زۆر بەپیرۆز دەزانن کەلەسەر قەبری ئیمامەکانیان دروست کراوە و ئەو نوێژە زۆر بەخێر دەزانن کە بەردە نوێژەکە لە خۆڵی قەبری ئیمامەکانیان دروست کرابێت.

٣. ژیانی ئیمامەکان:

وەکو وتمان شیعە دەڵێت ئیمامەکانمان غەیب دەزانن و زانستی ڕاردوو و داهاتوو و ئێستاشیان پێیەو دەزانن کەی دەمرن وە مردنیشیان بەدەستی خۆیانە وە هەموو گەردیلەکانی بوونەوەر لەژێر دەسەڵاتیاندایە وپارێزراون لەهەڵەو گوناهی گەورەو بچووك!

جا بزانین ئەم شتانە لەگەڵ ژیانی ئیمامەکانیاندا تاچ ڕادەیەك دەگونجێت.

١- ئەگەر ڕاستە هەمو گەردیلەکانی بوونەوەر لەژێر دەسەڵاتی ئیمامەکاندایە چۆن توانرا خیلافەتیان لی زەوت بکرێت وە بچەوسێنرێنەوە (بە پێی قسەی شیعە ئەگینا ئێمە لەو باوەڕەداین خیلافەتیان لی. زەوت کراوە و هەموو ئەهلی بەیت نەچەوسێنراونەتەوە بەڵکو هەندێکیان).

٢- ئەگەر ڕاستە ئیمامەکان دەزانن کەی دەمرن و بەدەستی خۆیان نەبێ نامرن بۆچی ئیمام عەلی نەیزانی عبدالرحمن ی کوڕی مولجیم لەمزگەوتەکەیدا خۆی شاردۆتەوە تا برینداری کرد، تەنانەت دوای بریندارکردنیشی هەر نەیزانی کێ لێی داوە تاگرتیان و هێنایان بۆلای کاتێك بینی عبدالرحمن ی کوڕی مولجیمە وتی ئەوە خۆتی، خۆمن چاکەی زۆرم بۆت هەبووە (أوأنت؟ لطالما أحسنت إليك).

چۆن ئیمام حەسەن نەیزانی ژنەکەی ژەهری بۆ کردۆتە ناو خواردنو ئەو خواردنەی خواردو ژەهراوی بوو مرد؟

چۆن ئیمامی حوسەین نەیزانی خەڵکی کوفە غەدریان لێ کردووە و پشتی نوێنەرەکەیان بەرداوە پاشگەز بوونەتەوە لەو بەیعەتەی کە پێیان تاگەیشتە کوف ئینجا ئەوەی بۆ دەرکەوت؟

ئایا ئیمامی حوسەین کەچوو بۆ کوفە بۆ ئەوە چوو لەوێوە شۆڕش بکات یا لەوێ بەو شێوەیە بکوژرێت؟

نەڵێی بۆ ئەمی دووەمیان چوو چونکە کاتێك زانی خەڵکی کوفە خیانەتیان لێ کردووە داوای کرد لەو مەفرەزەیەی کە نێررابوو بۆ ڕێگا لێگرتنی بەسەرۆکایەتی حورری عاملی ڕێگای بدات بگەڕێتەوە بۆ مەدینە بەڵام حور ڕێگای نەدا.

هەروەها ژیانی هەرکام لە ئیمامەکانیان دەخوێنیتەوە دەبینی بەزەقی ئەو عەقیدەیە بەدرۆ دەخاتەوە و هەربەقسەی شیعە خۆیان زۆربەیان دەرمانخوارد کراون و بەوە مردوون!!

٣) ئەگەر هەموویان مەعصومن و هەڵە ناکەن بۆچی ئیمامی حوسەین ڕازی نەبوو بەو صوڵحەی ئیمامی حەسەن و گلەیی لێ دەکرد؟

ئەگەر گوناه نەکەن ئەو هەموو دوعایانە چییە کە لێیانەوە ڕیوایەت دەکرێت کە تێیدا دان بەگوناه و کەم تەرخەمی خۆیان دەنێن؟[1]

ئەگەر هەموویان مەعصومن بۆچی فەتواکانیان جیاوازی تێداهەیە؟[2]

٤- ئەگەر ئیمامەکانیان دەیانزانی کەی دەمرن و بەویستی خۆیان نەبێت نامرن بۆچی محمد المهدی (ئیمامی دوازدەهەمینیان ) لە ترسا خۆی شاردەوە؟ چووە ئەو کونەوە لەسامەڕا وتا ئێستا کەس نازانێ خەریکی چییە!؟

٥- ئەگەر شیعە کۆنەکان ئیمامەکانیان بەمەعصوم دەزانی بۆچی ئەوەندە سەرپێچییان لە فەرمانەکانیان کردووە، ئەوە تا یەکەم گروپ کە خەوارجەکانن لە ئیمامی عەلی هەڵگەڕانەوە و بوون بە دوژمنی لەبەرئەوەی ڕازی نەبوون بە دانوستان لەگەڵ معاویەدا، ئەگەر بەمعصومیان بزانایە بۆچی

---

[1] بۆئەو مەبەستە تەماشای نهج البلاغة و صەحیفەی سەجادی بکە.

[2] تەماشای الكافي و من لایحضره الفقیة بکە و ببینە چەند جیاوازی هەیە لە نێوان فەتواکانی محمد الباقر و جعفر الصادق و موسی الكاظم دا.

بەگوێیان نەدەکرد یا ئەو کاتەی خۆی گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردن بۆچی نەیدەگوت من مەعصومم و هەڵە ناکەم و هیچ شتێك لە خۆمەوە ناکەم.

بەهەر حاڵ گریمان خەواریجەکان لە ڕێی ڕاست لایانداو ڕەنگە بڵێن صەحابەکانیش دەیانزانی پێغەمبەر مەعصومە و سەرپێچییان لەفەرمانەکانی دەکرد، ئەی ئەوانەی تا سەر لەگەڵ ئیمامی عەلیدا بوون و بەباوە گەورەی شیعەکانی ئەمڕۆ دەژمێررێن بۆچی بەگوێیان نەدەکردو سەرپێچییان لەفەرمانەکانی دەکرد؟

گەورەترین بەڵگەش (نهج البلاغة)یە کە پڕە لە سکاڵای ئیمامی عەلی لەدەستی شوێن کەوتوانی؟

یان بۆچی ڕازی نەبوون و بەوناشتییەی ئیمامی حەسەن بەرقەراری کرد لەگەڵ معاویەدا و پەلاماریان داو لەسەر ئەسپەکەی هێنایانە خوارەوە و بریندارییان کرد؟

٦- ژیانی ئیمامەکان هەمووی ناکۆکە لەگەڵ ئەوەی کە شیعە دەیڵێت کە گوایە ئیمامەت وەکو پێغەمبەرایەتی وایەو لەلایەن خواوە دیاری دەکرێت.. ئەگەر وابێت ئیمامی عەلی بۆچی بەیعەتی دا بەئەبوبەکر و عومەر و عوسمان؟ دەبوایە بیوتایە من خوا دایناوم بە ئیمام و بۆم نییە دەست بەرداری ئەم شتە بم کە خوا خستوویەتە ئەستۆم.

ئایا بۆی هەبوو إجتهاد بکات لەمەسەلەیەکدا کە بەو شێوەیە گەورە بێت و دەقی لەسەر بێت و بەرژەوەندی موسوڵمانانی لەسەر بەند بێت؟

ئایا پێغەمبەر بۆی هەبوو دەست لە پێغەمبەرایەتی هەڵگرێت ئەگەر هەموو دونیا دژی بوەستانایە بیانوتایە بایەکێکی تر غەیری تۆ پێغەمبەر بێت بۆ نموونە موسەیلەمە یا هەر کەسێکی تر؟

ئەگەر دەڵێن عەلی لەبەر پاراستنی یەکریزی موسوڵمانان دەستی لەو مافەی خۆی هەڵگرت ئەڵێین ئەی لەگەڵ معاویەدا بۆ ئەو کارەی نەکرد مەگەر معاویە لەئەبوبەکر و عومەر خراپتر بوو بەلای ئێوەوە؟

ئەگەر بڵێین ئەویان سەرەتای ئیسلام بوو ئەمەیان ئیسلام ڕەگی داکوتابوو ئەی حەسەن بۆ وای نەکردو تەنازولی لێکرد بۆ معاویە؟

ئەگەر لەبەرئەوەی عەلی کەسێکی وای لە پشت نەبوو تەنازولی کرد بۆ ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان خۆ حەسەن تا ئەوکاتە عێراقو حیجازیشی لەگەڵدا بوو وە هەمان ئەو لەشکرەی باوکی پێ بوو؟

ئەی پاش مردنی حەسەن بۆچی حوسەین شۆڕشی دژی معاویە بەرپا نەکرد؟

بۆچی معاویە لە یەزید باشتر بوو؟ ئەگەر بڵێی لەکاتی معاویەدا دەسەڵاتی نەبوو خۆلەکاتی یەزیدیشدا دەسەڵاتی نەبوو؟

یا بۆچی حوسەین بێ گوێی حەسەنی نەکردو ئەو لەشکرەی عێراق کە ئەوکاتە ئامادەبوو وە لەژێر دەستیاندابوو بەکاریتەهێنا دژی معاویە؟ ئایا سەرپێچی کردن لە فەرمانی خوا گەورەتر نییە لە فەرمانی ئیمام؟

یا ئەگەر ئیمامەکان خیلافەتی ئەمەوی‌و عەبباسییان بە هەڵە دەزانی بۆچی علی الرضا کە ئیمامی هەشتەمە قەبوڵی کرد ببێ بەوەلی عەهدی مأمون؟

ئەگەر دوژمنایەتییەکی وا سەخت لە نێوانیاندا هەبوو چۆن هەڵبژێررا بەجێگری مأمون؟

ئایا مأمون لەعلی الرضا دەترسا یا لە شیعەکەی؟ ئەگەر لە شیعەکەی دەترسا چۆن زاتی کرد عەلی ڕەزا دەرمان خوارد بکات( وەکو شیعە دەیڵێت)؟

بەکورتی ژیانی ئیمامەکان هەموو ئەو شتانەی شیعە دەخاتە درۆوە ودەریدەخات کە جگە لە ئیدعای بێبنەما هیچی تر نییە، وە خۆش بەختانەش ژیانی ئیمامەکانیان زانراوە کە چۆن ژیاون و چۆن مردوون و چیان بەسەردا هاتووە، جا ژیانیان زانراوە شیعە ئەو هەموو شتەیان داوەتە پاڵیان ئەگەر نەزانرایە چییان دەووت؟

ئێمە دەربارەی ئەوەی کە دەڵێن ئیمامەت وەکو پێغەمبەرایەتی وایە و دەبێ خوا دیاری بکات بە شیعە دەڵێین: بۆچی لەسەرەتاکاندا (مقدمات) لەگەڵ پێغەمبەرایەتیدا یەکی دەخەن و لەئەنجامەکاندا (النتائج) لەیەکیان جیادەکەنەوە؟ ئەگەر ئیمام بەدەست خۆی یا موسوڵمانان نەبێت هەڵیبژێرن بۆ ئیمامەت چۆن بەدەستی خۆیەتی دەستی لێهەڵبگرێت؟

سەیریش لەوێدایە دوای دەست هەڵگرتنیش ئەوان هەر بەئیمامی دەزانن؟

ئەوەتا حەسەن بەرەزامەندی خۆی دەستی لە خیلافەت کێشاوەو بەیعەتی دا بە معاویە کەچی هەر بەئیمامی دادەنێن!!

٣. دژایەتی کردنی عەقیدەی شیعە دەربارەی ئیمامەکانیان لەگەڵ عەقڵدا: ئەوانەی شیعە دەیڵێن دەربارەی ئیمامەکانیان لەوسیفەتانەی باسمان کرد هیچی لە تەرازووی عەقڵدا جێی نابێتەوە.

ئەگەر زانستی( ماکان ومایکون وماهو کائن) یان پێ بێت چۆن تووشی ئەو هەموو دەردەسەرییە دەبن لە کاتێکدا کە خوا لەسەر زمانی پێغەمبەر دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ...... ﴾(لأعراف: الآية١٨٨)

یا ئەگەر ئەو هەموو دەسەڵاتەیان هەبوایە بەسەر بوونەوەردا دیسانەوە چۆن تووشی ئەو هەموو ناڕەحەتییە دەهاتن و هەندێکیان خیلافەتی لێ

زەوتکراوە و هەندێکی تریان زیندانی کراوە و هەندێکی دەرمان خوارد کراوە لەلایەن کێشەوە؟

لەلایەن ژنەکانیانەوە، واتە نەشیانزانیوە کە ژنەکانیان خیانەتکارن!!.

چ حیکمەتێك هەیە لەوەی کە هەموو کتێبە ئاسمانییەکان بزانن و بەوزمانەش کەپێی دابەزیوە؟

ئەگەر وابووە بۆچی هیچیان لێ ڕیوایەت نەکراوە لەوشتانەی لەوکتێبانەدا هەیە؟ بۆچی ئەوشتانەی کە تەحریف کراوە لەوکتێبانە ئاشکرایان نەکردووە بۆ خەڵکی؟

دیارە ئەگەر ئیمامەکان ئەو هەموو شتەیان زانیبێت پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندە و زیاتری زانیوە، جا ئەگەر ئیمامەکان لەبەرهەرهۆیەك بێت ئەو کتێبانەیان نەخستۆتە بەردەستی خەڵکی و هەروەکو چۆن قورئانی ڕاستەقینەیان لەشوێن کەوتوانیان شاردۆتەوە بەهەمان شێوە ئەو کتێبانەشیان شاردۆتەوە، ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی دەری نەخستوون بەتایبەت ئەو هەموو موناقەشەیەی لەگەڵ ئەهلی کیتابدا کردووە؟

شیعە لەگەڵ ئەوەی کە عەقڵ بەیەکێك لەسەرچاوەکانی ئیجتیهاد دەزانن و خۆیان وانیشان دەدەن کە زۆر ڕێز لە عەقڵ دەگرن کەچی کاتێك دێتە سەرباسی ئیمامەکانیان و پلەوپایەیان یەك تۆزقاڵ عەقڵ بەخەرج نادەن و ئەوەی بشێ و نەشێ دەربارەیان دەیڵێن..

تەنانەت کاتێك ئەو شتانە دەنووسن بیر لەوە ناکەنەوە کە دەیان شت هەیە لەگەڵ ئەو قسانەیاندا ناگونجێت و تەعاروزی لەگەڵیاندا هەیە.

کەسیان ئاگای لەوەی تریان نامێنێت و لەهەر مەجلیسێکدا بەگوێرەی ئەو مەجلیسە شت دەڵێت و لەگەڵ هەرکەسێکدا بەگوێرەی دڵی ئەوکەسە قسە ئەکەن ئیتر بێ ئەوەی ئاگایان لەپاش و پێشی خۆیان بمێنێت!!

لەڕاستیدا ئەوەی بەچاوی عەقڵ تەماشای ئەوشتانە بکات کە شیعە دەیدەنە پاڵ ئیمامەکانیان و ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەر و ئیمامەکانی دەگێڕنەوە دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە:

١- شیعە یەکێکن لە ئاینە لادەرەکان لە ڕێگای ڕاست و تووشی زیادەڕەوی و ئینحرافێکی زۆر بوون.

٢- بۆ ڕەواج دان بەمەزهەبەکەیان درێغیان لە هیچ درۆو دەلەسەیەك نەکردووە و هیچ مەبەستیان نەبووە ئەو درۆیانە بدەنە پاڵ خوا یان پێغەمبەری خوا یا پیاوچاکانی نەوەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆربەی زۆری ڕاوییەکانیان درۆزنن و زۆربەی زۆری فەرموودەکانیان درۆیە و هەڵبەستراوە بەسەر زمانی ئەو زانایانەوە.

## زیارەتی گۆڕی ئیمامەکان:

تاکو ئێستا وەڵامێکی تێرو تەسەلم نەبیستووە لە زاناکانمان (خوا لێیان خۆش بێت) دەربارەی پەسەندتر گرتنی قسەی بەدیهێنراو بەسەر قسەی بەدیهێنەردا.

زیارەتی گۆڕی ئیمامەکان

لەبەشی زیادەڕەویدا باسی خاڵی هاوبەشی نێوان شیعەو تاقمە ئیسلامییەکانی ترمان کرد لەبارەی سەردانیکردنی گۆڕی ئیامەکانو ئەولیاکان جگە لە سەلەفییەکان (کە بەناڕەوای دەزانن)،لەم بەشەشدا باسی خاڵی جیاوازییەکان دەکەین لە نێوانیانداو ئەو لایەنانەی کە تایبەتە بە شیعەوە لە زیارەتی گۆڕی ئیمامەکانیاندا.

لەڕاستیدا شیعە ڕێڕەوی زیارەتی گۆڕی ئیمامەکانی گۆڕیوە لەکارێکەوە کە دەبێ بۆ خوا بێت بۆ زیارەتێکی سیاسی ئیعلامی ڕۆشنبیریو مەزهەبی.

من لەو کاتەی کە ئەم دێڕانە دەنووسم ڕۆژانە بەشەوو ڕۆژ دەیان هەزار کەس لە شیعە زیارەتی گۆڕی ئیمامەکان دەکەن لە ئێرانو عێراقو مەدینەی پیرۆزدا، وە لەو باوەڕەدام لەم هەزارەها کەسەدا کەسێك نییە کاتێك دەچێتە سەرگۆڕی یەکێك لەو ئیمامانە سورەتی فاتیحە یان هیچ سورەتێکی قورئان بخوێنێت بەڵکو چەندین سەدەیە دابونەریت وایە لەبەردەم گۆڕەکاندا دەستەواژەگەلێکی دوورو درێژ بخوێنرێتەوە کە پێیان دەوترێت (زیارەتنامە) کە بریتییە لە ستایشی ئیمامەکانو جنێو بە دوژمنانیان لەگەڵ کەمێك نزاو پاڕانەوە،وە بەدەگمەن ماڵێکی شیعە دەبینی کتێبی (مفاتیح الجنان) (واتە: کلیلەکانی بەهەشتەکان)ی تێدا نەبێت کە سەدان زیارەتنامەی تێدایە هەریەکەو بۆ ئیمامێك یان ئیمام زادیەكو هەموویان لەیەك دەچن لەگەڵ

جیاوازییەکی کەم لەنێوانیاندا. با پێکەوە چەند بڕگەیەك لە زیارەتنامەی (الجامعة الكبيرة) کە گرنگترین زیارەتنامەیەو لەسەر قەبری هەموو ئیمامێکدا دەخوێنرێتەوە بخوێنینەوە:

صەدوق لە کتێبی (الفقيه)دا ریوایەتی کردووە کە ئیمامی دەیەم عەلی کوڕی موحەممەدی جەواد یەکێك لە هاوەڵە نزیکەکانی خۆی کە موسای کوڕی عەبدوڵڵای نەخعیە فێری ئەمزیارەتنامەیە کردووە: "سڵاوتان لێبێت ئەی ئەهلی بەیتی پێغەمبەرایەتیو جێگەی پەیامو کۆبوونەوەی فریشتەکانو دابەزینی نیگا، جێی متمانەی خوای بەبەزەییو زنجیرەی پێغەمبەرانو پوختە نێردراوانو خزمی باشترین بەندەی خوا..

شایەتی دەدەم کە ئێوە پێشەوای پێگەیشتوو وڕێ نیشاندەرو پارێزراو لەگوناهو هەڵەو ڕێزدارو نزیك لەخواو پارێزکارو ڕاستگۆن..

هەرکەسێك پشتتان تێ بکات لە ئاین دەرچووەو ئەوەی دەستان پێوە بگرێت دەتانگاتێو ئەوەی ڕێگری لەمافی ئێوە بکات تیاچووەو ڕاستی و ڕەوایی لای ئێوەو لەناو ئێوەو لە ئێوەو بۆ لای ئێوەیەو ئێوەی شیاوو کانزای ئەو شتەنو میراتگری پێغەمبەرایەتینو گەڕانەوەی خەڵکی بۆلای ئێوەیەو لێپرسینەوەیان بەدەستی ئێوەیەو دوا بڕیار لای ئێوەیەو.. ئەوەی لایەنگرتان بێت لایەنگری خوایەو ئەوەی دوژمنایەتیان لەگەڵدا بکات ئەوە دەوژمنایەتی لەگەڵ خوادا کردووەو ئەوەی خۆشی بوێن خوای خۆشویستووەو ئەوەی ڕقی لێتان بێت ڕقی لەخوایە...

خوا بەشایەت دەگرمو ئێوەش بەشایەت دەگرم کەمن لایەنگرو هەواداری ئێوەو لایەنگرانتانم و ڕقم لە دوژمنەکانتانەو دوژمنایەتییان لەگەڵدا دەکەم، ئاشتیم بۆ ئەوەی ئاشتیاتن لەگەڵدا دەکاتو شەڕم بۆ سەر ئەوەی شەڕتان

لەگەڵدا دەكات، بەئێوە ڕێگای ڕەزامەندی خوا دەگیرێتەبەرو هەركەسێك نكۆڵی لە پێشەوایەتیتان بكات بەرخەشمی خوا دەكەوێت[1]

بەو شێوەیە ئەو زیارەتنامەیە لەسەر ئەم جۆرە دەستەواواژانە بەردەوام دەبێتو پاشان بە نزایەكی كورت كۆتایی پێدەهێنرێت.ئەم زیارەتنامەیەی چەند بڕگەیەكمان لێ باسكرد یەكێكە لە هەرە زیارەتنامە میانڕەوەكانو ناوەرۆكدارەكان ئەگینا زیارەتنامەی تر هەیە توندوتیژییەكی زۆریان پێوەیەو هەندێكیان بریندارکردنی خەلیفە ڕاشیدەكانی تێدایە؛ بەڵام شێوازی گشتی ئەم زیارەتنامانە ناڕەزایی دەربڕینە لەوانەی ستەمیان لە ئەهلی بەیت كردووەو داننانە بە چاكیو لەپێشی عەلیو نەوەكانیو لەبەرتربوونیان بۆ جێنشینی، وە هەندێك زیارەتنامە هەیە تایبەت بە ئیمام حوسەینەوە لەگەڵ ناڕەزایی لەبەنی ئومەیەو جنێودان پێیان بەڕاشكاوی. گومانیشی تێدانییە كە كوشتنی ئیمام حوسەین لەكەربەلاداو جنێودان بە ئیمامی عەلی لەسەر مینبەرەكان كە معاویەی كوڕی ئەوبوسوفیان دایهێناو بەردەوام بوو تا سەردەمی خیلافەتی عومەری كوڕی عەبدولعەزیز كە لە ساڵی ٩٩ك لای برد كە كاردانەوەیەكی توندی دروستكردبوو لای شیعەو بووە هۆی ئەوەی سیفەتێكی شەرعی بدرێت بەو جنێوو قسە ناشیاوانەی لە زیارەتنامەكاندا دەخوێنرێنەوە لەسەر گۆڕی ئیمامەكان[2]

وە لەكاتی پشكنینم بۆ ئەو زیارەتنامانەی لە كتێبەكانی (مزار البحار)و (مفتاح الجنان)و (ضياء الصالحين)و (مفاتيح الجنان)دا هاتووە بەڕوونی بۆم

---

[1] مفاتيح الجنان، القمی ص١٠٠٨.

[2] ئەمە تەنها تۆمەتێكە شیعە هەڵیبەستووە ئەگینا با چەند نمونەیەك لەو جنێوانەمان بۆ بگێڕنەوە كە لەسەر مینبەرەكان بە عەلی دراوە. وەرگێڕ

دەرکەوت کەناوی خەلیفە ڕاشیدەکان بەڕاشکاوی یان بە ناڕاستەوخۆ لەسەردەمێکی دواتردا خراونەتە ناو ئەم زیارەتنامانەوە بۆیە لەکەمێکیاندا نەبێت ناویان نابینین.

ئەوەی بەوردی بیربکاتەوە لەم زیارەتنامانەو بەدوای ئەو هۆیانەدا بگەڕێت کە لە پشتی دانانی ئەم زیارەتنامانەو بڵاوبوونەوەی خوێندنەوەیان لەسەر گۆڕی ئیمامەکانو پشت هەڵکردنی تەواو لە خوێندنی قورئانی پیرۆز کە فەرمایشتی خوایەو لەهەموو ڕوویەکەوە بەرزترەو چاکترە لە قسەی مرۆڤ، بۆی دەردەکەوێت کە مەبەستی ڕاستەقینەی بڵاوکردنەوەی بیری مەزهەبییە کە گرنگترین بنەماکانی شیاوتری ولەبەرتربوونی ئەهلی بەیتە بۆ جێنشینی.

وە پێویستە لەسەرمان ئەوە بڵێین کە زیارەتی گۆڕی ئیمامی حوسەین دوای چل ڕۆژ لە شەهیدکردنی دەستی پێکرد کاتێك یەکەم قافڵە لە هاوەڵانی کە هاتبوون بۆ سڵاولێکردنیو ئیتر دوای ئەوە قافڵەی سەیرانکەرانی گۆڕەکەی ساڵ دوای ساڵ بەردەوام بوو تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ.

وە کاتێك دەگەڕێینەوە بۆ ئەو هۆیانەی لە پشتی ئەو کۆبوونەوانەوە بوون کە لەسەر قەبری ئیمامی حوسەین بەناوی زیارتەوە ئەنجام دەدرا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوانە کۆبوونەوەو بەیەك گەیشتنی شیعەکانی هەموو دونیا بوون هاتبوون بۆ بەدەستهێنانی پاداشتو بڵاوکردنەوەی مەزهەبیو شیعەو نارەزایی دەربڕین لە خیلافەتی ئەمەویو پاشانیش عەبباسیو لەهەمانکاتدا خۆپیشاندانێکی شیعەییانە بوو بۆ یەکخستنی ڕیزەکانو بڵاوبوونەوەی ئامانجەکانی مەزهەبی شیعە.

لەبەرئەوە بەلامەوە سەیر نییە کاتێك لەهەندێك لە کتێبەکانی فورمودەدا هەندێك ڕیوایەت دەخوێنمەوە کە دراونەتە پاڵ ئیمامەکانی شیعە هانی

خەڵکی دەدەن بۆ زیارەتی ئیمام حوسەین لە هەندێکیاندا هاتووە: "بەهەر هەنگاوێك هەر کەسێك بۆ زیارەتی حوسەین دەینێت کۆشکێکی لەبەهەشت پێدەدرێت"[1]

نەك هەر ئەوەندە بەڵکو تەنانەت پلەو پایەیەکیان داوەتە کەربەلاو زۆر بەرزترەو پیرۆزترە لە کەعبە بەرادەیەك کە شاعیرێکی شیعە دەڵێت: "دەربارەی کەربەلاو کەعبە، بەرزی پلەی کەربەلا ئاشکرایە"

هەروەها ریوایەتی تر دەڵێت: "هەرکەسێك بگری بۆ حوسەین یان خۆی بگرێنێت خوا لەگوناهی رابردوو و داهاتووی خۆش دەبێت.."[2]

ئەم جۆرە ریوایەتانەو دانیانە پاڵ ئیمامەکان چالاکییەکی بێوێنەی بەخشیوە بە شیعەکان بۆ هەوڵدان بۆ گەیشتنە کەربەلا لەگەڵ زەحمەتی سەفەرو مەترسییەکانی لەو سەردەمانەدا.

لەبەر ئەوەبوو لەسەردەمی خیلافەتی ئەمەوی‌و عەبباسیدا کەربەلا خۆپیشاندانی گەورەی بەخۆوە دەبینی لەمانگی موحەررەم‌و سەفەردا بەتایبەتی لەدەی موحەررەمدا کەرۆژی شەهیدکردنی حوسەین بوو.

زیارەتکەران بەبێدەنگی لەدەوری قەبر کۆدەبوونەوەو ریزەکانیان رێکدەخست بۆ خوێندنەوەی زیارەتنامەکان کە بەشێوەیەك دارێژراون شیعەکان لەسەریەك هێڵی پتەو راگرن‌و یەك جۆر بیرکردنەوەیان بۆ دروست بێت.

بەراستی نەخشەکێشەرانی ئەو زیارەتانە بیلمەت‌و لێهاتووبوون وتوانیویانە باش لە دەروونی شیعە تێبگەن لەسەردەمی ئەمەوی‌و

---

[1] بروانە بۆ نیشنانەی هەڵبەستن لەم فەرمودەیەدا: بەهەر هەنگاوێك کۆشکێك! واتە هەر شیعەیەك ملیۆنەها کۆشکی هەیە لەبەهەشتدا!.(وەرگێر)

[2] ئیتر شیعە نوێژیان بۆچیەو رۆژووگرتنیان بۆ چییە؟!.(وەرگێر)

عەبباسییەکاندا بۆیە ئەو زیارەتانەیان وا ڕێکخستبوو کە وەکو کۆبوونەوەیەکی ڕێکخراوو بەردەوام وابوو بۆ بەرهەڵستی کردنی خیلافەت، بەو شێوەیە پێگەیاندنی مەزهەبی لەڕێگای ئەو زیارەتانەوە بووە شتێکی باوو پەیڕەوکراو سەرەڕای نارەزایی دەسەڵات.

هەموو ئەم شتانە لەسەردەمێکدا ڕوویاندا کە ڕۆژنامەو قوتابخانەی گشتیو دەزگاکانی ڕاگەیاندنو هۆیەکانی چاپەمەنیو ڕێکخستنە حزبییەکان بوونیان نەبووە، بۆیە سەیرمان لێنایەت گەر بزانین خەلیفە متەوەکیلی عەبباسی زیارەتی قەبری حوسەینی قەدەغەکردو فەرمانیدا گۆڕەکەی بکێڵرێت بۆ ئەوەی شوێنەورای نەمێنێت.

ئەمڕۆش دوای ئەوەی هەموو شتێك کۆتایی پێهاتو ئەمەویو عەباسییەکان تیاچوون ئەو ململانیٚ فکرییەی دەربارەی خیلافەتو خەلیفەکان هەبوو بەسەرچوو، ئایا ئێمەی شیعە دەمانەوێت بەهەمان ڕێگەدا بڕۆین کە هەزارو سێسەد ساڵ لەمەوبەر لەسەری ڕۆیشتووینو لەسەر گۆڕی ئیمامەکان بووەستینو قسەگەلێك بڵێینەوە کە چەندین سەدەیە دەیڵێینەوە بێ ئەوەی هیچ سودێك یان ئەنجامێکی هەبێت؟ مەگەر هەندێك بڕگە لە پاڕانەوە تایبەتەکان کەبەشێکی زۆر کەم لەو زیارەتنامانە پێك دێنن، پاشان تاکو کەی قسەی مرۆڤ لەبەرتر بزانین لە قسەی خوای بەدیهێنەر؟ وە ئیمامەکان چ سودێکیان پێدەگات لە خوێندنەوەی ئەم وتارە زرنگەدارانە لەسەر گۆڕەکانیان؟

ئایا باشتر نییە لەسەر سوننەتی پێغەمبەر بڕۆینو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بخوێنینەوە لەسەر گۆڕی ئیمامەکانمان کە پاداشتو بەزەییو ڕوناکیو هیدایەتی تێدایە نەك تەنها بۆ زیارەتکەر بەڵکو بۆ زیارەتکراو با پێغەمبەر یان ئیمامیش بێت؟

## ڕاستکردنەوە:

لەو هەمووەی کە ڕابورد بەڕوونی دەردەکەوێت کە ئەم زیارەتنامانەی کتێبەکانی زیارەتنامەیان پڕ کردووەتەوەو هەموو شیعەیەك لەماڵەوە هەیەتی‌و لەکاتی سەردانی گۆڕی ئیمامەکاندا دەیخوێنێتەوە زیارتنامەگەلێکی فێرکارییە لەسەردەمێکدا دانراون شیعە پێویستیان بەڕۆشنبیری مەزهەبی هەبووە.

وە من گومانم نییە کە ئەگەر ئیمامی عەلی گوێی لەهەندێك لەبڕگەکانی ئەو زیارەتنامانە بێت کە هەندێك سیفەت دەدەنە پاڵ ئیمامەکان لەسەرووی سیفەتی مرۆڤەوەیەو نزیکە لە سیفەتەکانی خوا یان هاوبەشە لەگەڵیاندا داری حەددی لەدانەرەکەی‌و خوێنەرەکەی دەدا.

لێرەدا دەمەوێت داوا لە شیعە بکەم لەهەموو ڕووی زەوی کە بەوردی بیربکەنەوە لەزیارەتەکانیان بۆ گۆڕی ئیمامەکان بەم دەستەواژانەوە کە هیچ کەڵکێکی نییە نە بۆ خۆیان وە نە بۆ ئیمامەکانیان، هەروەها دەمەوێت جارێکی تر بەپرسیارێتی بخەمە ئەستۆی پێشەوا مەزهەبییەکان کە شیعەیان لەسەر ئەم ڕێگایە بارهێناوەو تاکو ئەمڕۆ هیچ یەکێك لەو مەرجیعانەم نەبینی لەکاتی چوونە سەر گۆڕی ئیمامەکان قورئان خوێندنی لە خوێندنەوەی ئەەم زیارەتنامانە پێ باشترو لەبەرتبێت وە من نازانم بۆچی ئێمەی شیعە واز لە فەرمایشتی خوا دێنین‌و ڕوو دەکەینە قسەی بەندەکان با لە گریمانەیەکیشدا ئەو قسانە لەزاری ئیمامەوە دەرچووبێت؟ بۆچی قسەکانی ئەو لەسەرووی قسەکانی خواوە دادەنێین؟

وە ئەگەر بێت‌و مەبەست لەو زیارتنامانە بەدەستهێنانی پاداشتی دوا ڕۆژ بێت ئەوە خوێندنەوەی قورئان ئەو پاداشتە مسۆگەر دەکات، وە ئەگەر

مەبەست لێی ڕێزنان بێت لە ئیمام ئەوە خوێندنەوەی قورئان ئەوەشی بۆ مسۆگەر دەکات[1]

من دڵنیام کە ئەم تێڕوانینە ڕاستکارییە ڕووبەڕووی ئەو وەڵامە کلاسیکییە دەبێتەوە لەلایەن زاناکانمانەوە کە ئەم زیارەتنامانە لەلایەن ئیمامەکانەوە هاتووەو ئەوانیش بەدڵنیاییەوە لە ئێمە زاناترو شارەزاترن، وە لەگەڵ ئەوەی کەمن ناتوانم گفتوگۆ لەگەڵ ئیمامەکاندا بکەم کە بەربەستی ژیانو مردن لە نێوانماندایە بەڵام ئەگەر لەسەردەمی عەلی کوڕی موحەممەددا بومایە لەگەڵیدا بچومایەتە سەر گۆڕی ئیمام حوسەینو گوێم لێبوایە زیارەتنامەی (الوارث)و (الجامعة) دەخوێنێتەوە لەبەردەم گۆڕەکەدا ئەم گفتوگۆیەم لەگەڵیدا ئەنجامدەدا:

من: ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا ئەم زیارەتنامەیە قسەی خوایە یان قسەی بەدیهێنراو؟

ئیمام: قسەی بەدیهێنراوە (مرۆڤ).

من: ئایا قسەی بەدیهێنراو گرنگترو لە پێشترە یان قسەی خوا؟

ئیمام: قسەی خوا.

من: ئەی بۆچی باوی قسەی مرۆڤتدا بەسەر قسەی خواداو قورئانت نەخوێند؟

نازانم وەڵامی ئیمام چی دەبوو کە دەگەیشتینە ئەم خاڵە.

بەبیرداهاتنی ئەم جۆرە گفتوگۆیە ئەوە ناگەیەنێت کەمن باوەڕم وایە ئەم جۆرە زیارەتنامانە لەلایەن ئیمامەکانی شیعەوە هاتبن بەڵام من ئەوپەڕی

---

[1] لە ڕاستیدا خوێندنەوەی قورئانیش لەسەر گۆڕستان سوننەت نییە چجای ئەم زیارەتنامەی کە پڕە لە شیرکیاتو دەمارگیریو دووبەرەکیو ڕقو کینەبازی.(وەرگێڕ)

مەسەلەکەم گرت بۆ ئەوەی کردەوەی ئیمام بە بیانوو بێنمەوە بۆ ئەم جۆرە شتانە.

ئەم بەشە بەم فەرموودەیە کۆتایی پێدێنم کە کتێبە ڕاستەکانی فەرموودە لە پێغەمبەرەوە گێڕاویانەتەوە کە دەفەرموێت: "دوو شتی بەنرخم بۆ بەجێهێشتوون، کتێبی خواو سوننەتەکانی خۆم (فەرمودەو کردەوە) ئەگەر دەستیان پێوەبگرن هەرگیز لەدوای من گومڕاو سەر لێشێواو نابن"

بەڵام شیعە ئەم فەرموودە ڕیوایەت دەکات: "دوو شتی بەنرخم بۆ بەجێ هێشتوون: کتێبی خواو وەچەکەم: ئەهلی بەیتەکەم، ئەگەر دەستیان پێوە بگرن گومڕاو سەر لێشێواو نابن"[1]

---

[1] هەندێك لەکتێبە ڕاستەکانی وەکو تەرمەزی ئەم فەرمودەیانە بەو شێوەیەی شیعە ڕیوایەت کردووە (نووسەر)ا.

شیعە بەڵگە بەو فەرمودەیە دەهێننەوە کە پێی دەوترێت (حديث الثقلين) کە بەچەند شێوە هاتووە و قسەی زۆر هەڵدەگرێت ئێمە بە کورتی لەسەری دەدوێین: فەرمودەکە لە سنن الترمذي دا بەم شێوەیە هاتووە: عن زيد بن الأرقم قال: قال رسول الله (ص) اني تارك فيكم ما ان تمسكتم به لن تضلوا بعدي احدهما أعظم من الآخر ،كتاب الله حبل ممدود منالسماء الى الأرض وعترتي أهل بيتي ولن يتفرقا حتى يردا علي الحوض فانظروا كيف تخلفوني فيهما.رواه الترمذي وقال حديث حسن غريب(٩٨٦). بەڵام لە صحيح مسلم دا بەم شێوەیە هاتووە:عن زيد بن أرقم : "قام فينا رسول الله (ص)خطيبا بماء يدعى خمًا بين مكة والمدينة ،فحمد الله ، وأثنى عليه ، ووعظ وذكر، ثم قال:" أما بعد ، ألا أيها الناس ، فإنما أنا بشر يوشك ان يأتيني رسول ربّي فأجيب ، وانا تارك فيكم ثقلين اولهما كتاب الله ، فيه الهدى والنور ،من استمسك به وأخذ به كان على الهدى ، ومن أخطأ ضلّ ، فخذوا بكتاب الله ، واستمسكوا به " فحث على كتاب الله ، ورغب فيه ثم قال:" وأهل بيتي ، أذكركم الله في أهل بيتي ، أذكركم الله في أهل بيتي،أذكركم الله في أهل بيتي" . اخرجه مسلم (٢٤٠٨،٣٦).

زانایان دەربارەی ریوایەتەکەی ترمزی دەڵێن : فەرمودەکە بەو لەفزە لاوازە ، بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە کتێبی منهاج السنه النبویه بتحقیق محمد احمد شبراوی ج٤ ص١٠٩ ،ج٧ ص٢١٥

چەند تێبینی یەك:

١. لە بۆنەی هاتنی فەرمودەکەدا ئەوە دەردەخات کە زەید کاتێك داوای گێڕانەوەی ئەو ڕووداوەیان لێ کردووە پیر بووەو فەرموویەتی بیرم وەکو جاران نەماوە بۆیە هەرچیم لە بیر مابوو بۆتان دەگێڕمەوە

٢. دەست گرتن بە ئەهلی بەیتی پێغەمبەرەوە جگە لە خۆشویستن و ڕێز لێ گرتن هیچی تر هەڵناگرێت ، چونکە لە ریوایەتەکەی موسلیمدا بە ڕوونی دەردەکەوێت کە پێغەمبەر ماوەیەك باسی قورئان دەکات و هانی دەست پێوە گرتن دەدات و پاشان دەفەرموێت خواتان لە بیر بێت بۆ ئەهلی بەیتەکەم ،سێ جار دووبارەی دەکاتەوە، ئەمەش شتێکی سروشتییە کە پێغەمبەر دوو شتی جیاواز بەیەکەوە گرێ بدات یەکێکیان بۆ پەیڕەوی لێ کردن کە قورئانە ، دووەمیشیان بۆ ڕێز لێگرتن و خۆش ویستن کە خزمانێتی . وەکو چۆن قورئان دەفەرموێت ( یا أیها الناس اتقوا ربکم الذي خلقکم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا کثیرا ونساءا واتقوا الله الذی تساءلون به والأرحام ان الله کان علیکم رقیبا) النساء١،دەبینی لێرەدا خوا فەرمان بە گوێ ڕایەڵی لە خواو چاکە لە گەڵ خزماندا بە یەکەوە گرێ دەدات.

٣. بە لێکدانەوەی دەقەکە لە ڕووی دەروونی و لۆژیکییەوە دەردەکەوێت کە ئەهلی بەیت دەسەڵات ناگرنە دەست بۆیە بەو شێوازە ئامۆژگاری موسوڵمانان دەکات و سێجار دەفەرموێت خواتان بەبیر دێنمەوە لە خزمانمدا و لە ریوایەتێکیشیاندا دەفەرموێت بزانن چۆن دوای من مامەڵەیان =لە گەڵ دەکەن(فانظروا کیف تخلفونی فیهم). لە کاتێکدا ئەگەر فەرمان بە گوێڕایەڵی بوایە بۆیان بەو شێوە سۆزدارییە دەری نەدەبڕی ، بەڵکو چۆن لە گەڵ قورئاندا دەفەرموێت دەستی پێوە بگرن و گوێ ڕایەڵی لێ بکەن دەربارەی ئەوانیش بە هەمان شێوە قسەی دەکرد

٤. ئیمامی عەلی بە خۆی ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە ، ئەویش لە دوای بەیعەت دان بە ئیمامی ئەبو بەکر لە سەقیفەدا کاتێك لە هەندێك لە ئامادەبوانی پرسی چی

ڕوویدا و بۆیان باس کردو گفتو گۆی نێوان ئەنصار و موهاجیرەکانیان بۆ گێڕایەوەو وتیان ئەنصارییەکان وتوویانە ئەمیرێك لە ئێمەو ئەمیرێك لە موهاجیرەکان فەرمووی چۆن داوای سەرۆکایەتی دەکەن مەگەر نازانن پێغەمبەری خوا ئامۆژگاری موسوڵمانانی کرد باش بن لە گەڵیاندا ، ئەگەر فەرمانڕەوایی لەناو ئەواندا بووایە پێغەمبەر ئامۆژگاری ئەوانی دەکرد باش بن لە گەڵ موسوڵماناندا ، لە عەرەبیشدا جیاوازی هەیە لەنێوان( وصّی لهم ) و (وصّی بهم) ، یەکەمیان وەسییەت کردنە بۆ کەسێك کە شتێکی پێ بدرێت و دووەم بە مانای بە چاکی جووڵانەوە دێت لە گەڵ ئەو کەسەدا.

٥. لە هەمووش گرنگتر ئەوەیە کە ئیمامی عەلی هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژان ئاماژەی بەم فەرموودەیە نەکردووە وەکو بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی کە دەبێت فەرمانڕەوایی لەوو لە نەوەکەیدا بێت ، بەڵکو بیرمەندانی شیعە ئەم حوکمەیان لێ هەڵێنجاندوە ، وەکو ئەوەی بڵێین ئێمە لە عەلی زیاتر لە مەبەستەکانی پێغەمبەر تێ دەگەین

٦. ئەگەر مەبەست لە جیا نەبوونەوەی قورئان وئەهلی بەیت لە یەکتر ئەوە بێت کە دەبێ موسوڵمانان گوێ ڕایەڵی هەردوکیان بن و گوێ ڕایەڵی کردن لە ئیمامەکان بە مانای فەرمانڕەوایی بێت دەپرسین: ئیمام لە ساڵی ٢٦٠ ی کۆچییەوە نەماوە ئیتر چۆن پەیڕەوی لێ بکەین؟ لێرەدا یا دەبێت مەبەست لە ئەهلی بەیت ئەو چەند کەسە نەبن کە شیعە دیاری دەکەن بەڵکو هەموو ئەو خزمانە بن کە وەرگرتنی صەدەقە بۆیان حەرام بوو ، کە ئەوەی عەبباس و عەقیل و جەعفەر و هەروەها خێزانەکانی پێغەمبەر و ئەو کاتەش فەرمانڕەوایی ناگرێتەوە و ئەوَ مەبەستەی شیعە نادات بەدەستەوە وە یا مەبەست خۆش ویستنی نەوەکانی پێغەمبەر بێت بە شێوەیەکی گشتی ، ئەمەیان ڕێی تێ دەچێت و دەستەبەر بووەو هەموو موسوڵمانان نەك هەر خزمەکانی سەردەمی پێغەمبەریان خۆش دەوێت بەڵکو تا ئەمڕۆش هەرچی کەسێك بڵێت من لە نەوەی پێغەمبەرم موسوڵمانان خۆشیان دەوێن و ڕێزیان لێ دەگرن. هەر ئەمەشە وای کردووە زۆر کەس بەدرۆ خۆیان بدەنە پاڵ خانەوادەی پیغەمبەر(د.خ).کەواتە لە هیچ حاڵەتێکدا ئەو فەرموودەیە بە مانای خیلافەت و فەرمانڕەوایی ئەو چەند کەسە دیاری کراوەی شیعە نایەت چونکە ئەوان لە ساڵی ٢٦٠ی کۆچییەوە لە قورئان جیا بوونەتەوەو قوڕئان بەتەنها ماوەتەوە

٧. ئەو دەستەواژەیەی کە دەڵێت یەکێکیان لەوی تریان گەورەترە پێچەوانەی عەقیدەی ئیسلامییەو کەس لە قورئان گەورەتر نییە چونکە قسەی خوایەو قسەی خواش لە بەندەکانی خوا گەورەترە و لەسەر هەموانە پەیڕەوی لێبکەن بە پێغەمبەریشەوە ،مەگەر بەو مانایەی کە بڵێی خۆش ویستنیان وەکو یەك وایە چونکە فەرمانی خوایە بۆ بەندەکانی کە هەردوکیان خۆش بوێن و ڕێزیان لێ بگرن

٨. ئەو فەرموودەیەی کە ئەهلی سوننە ریوایەتی دەکەن لۆژیکی ترە و گونجاوترە لە گەڵ ڕۆحی ئیسلامدا ئەویش ئەوەیە کە ئیمامی مالیك لە پێغەمبەرەوە دەیگێڕێتەوە کەدەفەرموێت : "**ترکت فیکم أمرین لن تضلوا ما تمسکتم بهما کتاب الله وسنة نبیه** " **الزرقانی علی الموطأ** ٣٠٧\٤ و هەروەها ئەو فەرمودەیەی کە بوخاری ریوایەتی کردووە" **ان احسن الحدیث کتاب الله وخیر الهدي هدي محمد وشر الأمور محدثاتها" فتح الباری** ٢١٢\١٣-٢١٣ دەبینی ئەم فەرمودانە لە گەڵ واقیعدا دەگونجێن و زۆر لۆژیکین و پیاو تووشی هیچ پەشێوییەك ناکەن بۆ تێگەیشتنی ، فەرموودەو ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ڕوون کەرەوەو ڕاڤە کەری قورئانن و ئیمامەکانی سوننەو شیعەش ناچاردەبن بۆ تێگەیشتن لە ئاین بگەڕێنەوە بۆیان! لەیەك جیانەبوونەوەش بۆ قورئان و فەرمودەر ڕێنماییەکانی پێغەمبەر گونجاوترە کە سەرچاوەی ئەشریعن بۆ موسوڵمانان نەك بۆ قۆرئان و ئەهلی بەیت کە لە ساڵی ٢٦٠ی کۆچیەوە لەیەك جیا بوونەتەوە سەیریش لەوەدایە کە شیعە ئەم جۆرە فەرمودە لۆژیکیانە ریوایەت ناکەن کە موحکەمن و ماناکانیان و دەلالەتەکانیان ڕوون و یەکلاکەرەوەن بەڵام دەچن دەست بەو ریوایەتانەوە دەگرن کە تەمو مژاوین و ماناو دەلالەتەکانیان ڕوون نین دەترسم شیعە لە ناخیاندا باوەڕیان بەوە هەبێت کە مەهدی قورئانی لە گەڵ خۆیدا بردووەو قورئان لای ئەوەو پێش ڕۆژی قیامەت دەیهێنێ و فەرمانڕەوایی پێ دەکات ، ئەگینا کوا ئیمامەکانی ئەهلی بەیت تاوەکو موسوڵمانان دوایان کەون ؟

بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم مەسەلەیە بگەڕێرەوە بۆ کتێبی: **أهل بیت النبوة في ضوء الکتاب والسنة – محمد فاروق ابو سنة**

چەند جوانترو باشترە بۆ شیعە کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوابن‌و کتێبی خواو ئەهلی بەیتی پێغەمبەر (ﷺ) بەیەکەوە گرێ بدەن لەیەك شوێنێکدا بەپێی ئەو فەرمودەیەی لە پێغەمبەروە ڕیوایەت کراوە.

# لەخۆدان لەڕۆژی عاشووورادا

هیچ شۆڕشێکی پیرۆز لەمێژوودا نەشێوێنراوە وەکو ئەوەی شیعە شۆڕشی حوسەینیان شێواندووە بە بیانووی خۆشەویستی حوسەینەوە.

لەخۆدان لەڕۆژی عاشوورادا

ناچارین بەشێك تەرخان بکەین بۆ باسکردنی لەخۆدان بەزنجیرو شمشێر لە ڕۆژی عاشورادا بۆ ئیمام حوسەین.وە لەبەر ئەوەی ئەم کارە ناشیرینە تاکو ئێستاش بەشێکە لەداب‌و نەریتی ئاهەنگی ماتەمینی گێڕان بۆ ئیمامی حوسەین‌و لە ئێران‌و پاکستان‌و هندستان‌و لوبنانداو ساڵانە دەبێتە هۆی ململانێیەکی خوێناوی لەنێوان شیعەو سونتەداو لەهەندێك شوێنی پاکستاندا سەدان کەس لەهەردوو لا دەبنە قوربانی، پێویستی کرد بە شێوەیەکی سەربەخۆو بەدرێژی لەسەری بدوێین.

وەکو وتمان لەبەشێکی پێشوودا شیعەکان چەندین سەدەیە لەڕۆژی عاشوردا ئاهەنگی ماتەمینی دەگێڕن و جگە لەو زیارەتنامانەی کە باسمانکرد شاعیران هۆنراوەیان لەبەردەم گۆڕەکەدا دەخوێننەوە وە تەنانەت شاعیری عەرەبی شەریفی ڕەزی کاتێك هۆنراوە ناسراوەکەی خوێندەوە لەسەر قەبری حوسەین کە سەرتاکەی دەڵێت:

کربلاو لازلت کرباو وبلا

واتە: ئەی کەربەلا هێشتا هەر ماتەمینی‌و نارەحتی‌و ئێش‌و ئازاری.

وە کاتێك گەیشتە ئەم دێڕە:

کم علی تربك لما صرعوا　　من دم سال ومن قتل جری

واتە: چەند لەسەر خاکەکەت کاتێك لێدران خوێن ڕژاو خەڵك کوژرا:

ئەوەندە گریا تا لەخۆچوو، ئەوەی کە چەسپیوە ئەوەیە کە ئیمامەکانی شیعە لەڕۆژی عاشورادا لەماڵەوە دادەنیشتن‌و پێشوازیان لەسەرخۆشیکەران

دەكردو نانیان دەبەخشیەوەو لەبەردەمیاندا وتارو هۆنراوە دەخوێنرایەوە بەیادی شەهید بوونی ئیمامی حوسەینو كەسوكارەكەی پێغەمبەر(ﷺ).

وە لەكەربەلاداو لەدەوری گۆڕی حوسەین زیارەتكەران تاك تاكو پۆل پۆل تێدەپەڕینو بەگریانەوە زیارەتنامەیان دەخوێندەوە وەكو بەشێكی تەواوكەر بۆ ئەو ئاهەنگو زیارەتە، ئەمە نەریتێكە تاكو ئێستاش ئەنجام دەدرێت لەكۆڕی ئازێتباری ئیمامی حوسەین لە جیهانی شیعەداو دەبێت بەگریان كۆتایی پێ بهێنرێت چونكە: "هەر كەسێك بگرییێت یان خۆی بگرییێنیت بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت" ئەمە یەكێكە لەو ڕیوایەتانەی دراونەتە پاڵ ئیمامەكانو پەنا بەخوا شتی وا لە ئیمامەكانەوە دەربچێت.

هەروەها شیعەكان جلی ڕش دەپۆشن لەمانگی موحەڕڕەمو صەفەردا وەكو ماتەمینییەك بۆ حوسەین، وە ئەم نەریتەش لەسەردەمی یەكەمی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوعدا كاتێك كە شیعەكان دەستیان كرد بە دەركەوتن لەسەر شانۆی سیاسیو ئیسلامی وەكو هێزێك دەیەویست حكومەت بڕوخێنێتو بوەیهییەكان كە بەناوی پارێزەرانی خیلافەتی عەبباسی فەرمانڕەوایی ئێرانو عێراقیان دەكرد ڕۆڵێكی بەرچاویان بینی بۆ پەرەسەندنی ئاهەنگەكانی عاشورا بەڵام ئەم ئاهەنگانە شێوازێكی گشتی گرتەبەرو بووبە بەشێك لە پێكهاتەی شیعە كاتێك شا ئیسماعیلی صەفەوی دەسەڵاتی گرتە دەست لە ئێرانو ئێرانی كردە وڵاتێكی شیعەو یەكڕیزییەكی مەزهەبی پێكهێنا بۆ وەستان لەڕووی دەوڵەتی عوسمانی دراوسێی ئێران، وە كۆشكی شایەتی هەموو ساڵێك ماتەمینی ڕادەگەیاند لە دەڕۆژی یەكەمی موحەڕڕەمداو شا خۆی پێشوازی لەسەرخۆشیكەران دەكردو لەكۆشكدا ئاهەنگی تایبەت بەم بۆنەیەوە بەرپادەكراو جەماوەرێكی زۆر كۆدەبوویەوەو

شا خۆیشی ئامادەی دەبوو، هەروەها شا عەبباسی صەفەوی کە فەرمانڕەواییەکەی پەنجا ساڵی خایاندو یەکێك لەگەورەترین پاشاکانی صەفەوی لەڕووی بەکارهێنانی فێڵو هێزو سەرکوتکردنەوە جلی ڕەشی لەبەردەکردو ناوچەوانی خۆی لەقوڕدەگرت لە عاشوراداو پێشی کۆڕەکە دەکەوتو کە بەجادەکاندا دەڕۆیشتنو سرودی دەخوێند لە ستایشی ئیمامی حوسەینو ناڕەزایی دەربڕینو قسە وتن بە بکوژانی.

نازانین لەخۆدان بەزنجیر لە ڕۆژی عاشورادا کەی سەری هەڵداو بڵاوبوویەوە لەناوگەلێکی وەکو عێراقو ئێران بەڵام ئەوەی گومانی تێدانییە ئەوەیە کە بەشمشێر لەخۆدانو قلێشاندنی سەر لە هندستانەوە دزەی کرد بۆ ئێرانو عێراق لەسەردەمی داگیرکردنی هیندستان لەلایەن ئینگلیزەوەو ئینگلیزەکان نەفامی شیعەو خۆشەویستیان بۆ حوسەین قواستەوەو ئەم نەریتەیان لەناویاندا داهێنا تاکو ماوەیەکی نزیکیش سەفارەتی بەریتانی لە بەغداو تاران کۆمەکی کۆڕەوی حوسەینییان دەکرد کەبەو شێوە قێزەونە لە سەر جادەکانو ناو کۆڵانەکان دەردەکەوێت، مەبەستیش لەو سیاسەتە داگیرکارییە لەبرەودان بەو نەریتە ناشیرینانە پاساودان بوو بە حکومەتی ئینگلیز لەبەردەم گەلەکەیو ئەو ڕۆژنامە ئازادانەی نەیاری داگیرکردنی هیندستانو وڵاتە ئیسلامییەکانیان دەکرد بە نیشاندانی ئەو گەلانە لەوشێوە دڕندەو دواکەوتووەدا بۆ ئەوەی قەناعەت بکەن کە پێویستیان بەسەرپەرشتیار هەیە ڕزگاریان بکات لەو نەفامیە، وێنەی ئەو کۆڕانەی بە جادەکانو کۆڵانەکاندا دەڕۆیشتنو بەزنجیرو شمشێر لەخۆیانیان دەداو خوێنیان بەسەرو باڵای خۆیاندا دەهێنا دەگێرانو لەڕۆژنامە ئینگلیزیو ئەوروپییەکاندا بڵاو دەکرانەوەو سیاسەتمەدارە داگیرکەرەکان وایان لەخەڵکی دەگەیاند کە داگیرکردنی ئەو

ولاّتانە ئەرکێکی مرۆڤانەیە لە سەرشانیان بۆ ڕزگارکردنی گەلانێکی بەو شێوەیە دواکەوتوو و دەرکردنیان لەو دواکەوتنە بەرەو مەدەنییەتو پێشکەوتن.

دەگێڕنەوە کە یاسین الهاشمی سەرەك وەزیرانی عێراق لەسەردەمی داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەوە کاتێك دەچێت بۆ لەندەن بۆ وتوێژ لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بۆ کۆتایی هێنان بە ئینتیداب ئینگلیزەکان وەڵامیان دایەوە کە ئێمە لەعێراقداین بۆ یارمەتیدانی گەلی عێراق بۆ ئەوەی هەڵسێتەوە بەرەو بەختیاریو لەو دڕاندایەتییە ڕزگاری بێت، ئەم وەڵامە سەرەك وەزیرانی عێراقی تورەکردو ژووری وتوێژی بەجێهێشت، دواتر ئینگلیزەکان بەشێوەیەکی بلیمەتانە وەڵامیان دایەوەو داوایان لێکرد تەماشای فیلمێکی دۆکیومێنتی بکات دەربارەی عێراق، فیلمەکە لەسەر کۆڕەوە حوسەینییەکان بوو لە جادەکانی نەجەفو کەربەلاو کازمیەو دیمەنگەلێکی قێزەونو دڕندانەی نیشاندەدا لە خۆدان بەزنجیرو شمشێر، وەکو ئەوەی ئینگلیزەکان بیانەوێت بەهاشمی بڵێن ئایا گەلێك کەمترین بەشی هەبێت لە ڕۆشنبیریو مەدەنییەت وا لەخۆی دەکات؟

لێرەدا قسەیەکی جوانی پڕ لە لۆژیكو ڕوناکبیری باس دەکەم کە پێش ٣٠ ساڵ لەیەکێك لە زاناو پیاو ماقوڵانی شیعەم بیست، ئەو پیاوە پیرە بە تەنیشتمەوە وەستابوو کاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆ لەڕۆژی عاشورادا لەبەردەم مەزاری ئیمام حوسەیندا، کاتێك پێری لەخۆدەران بە شمشێر بەلاماندا تێپەڕین و خوێن بەدەمو چاوو باڵایاندا دەهاتە خوارەوەو بەو شێوەیە چوونە ژوورەوە بۆ ڕەوزەی حوسەینیو پاشان پێڕێکی تر هاتن بە زنجیر لە شانو پشتی خۆیانیان دەداو خۆیانیان خوێناوی کردبوو ڕوی تێکردمو لێی پرسیم:

ئەمانە چییانە وا ئەم هەموو ئێش و ئازارەیان بەخۆیان گەیاندووە؟ وتم: وەکو ئەوەی گوێت لیّ نییە چی دەڵێن: ئەوانە دەڵێن "وا حسیناه" واتە: هاوار بۆ حوسەین، لەغەمو خەفەتیان بۆ حوسەین.

پاشان پرسی: ئەی حوسەین ئێستا لە بەهەشتدا نییە لای پەروەردگاری( فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ) (القمر: ٥٥ )؟

وتم: بەڵێ.

جارێکی تر پرسی: ئەی حوسێن ئێستا لەبەهەشتێکدا نییە بەبەرینیَ ئەرزو ئاسمانەکان کە بۆ پارێزکاران ئامادەکراوە (جَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ) (آل عمران: ١٣٣ )؟

وتم: بەڵێ.

لێرەدا ئەو زانا پیرە هەناسەیەکی هەڵکێشاو بەدەنگێك کە پڕ بوو لەداخو کەسەر وتی: داماو خۆیان کە گێلو نەفامن، بۆ وا بەخۆیان دەکەن بۆ ئیمامێك کە ئێستا لەبەهەشتدایەو لەناو نازو نیعمەتدایەو مێردمنداڵانی بەهەشت لەپەرداخو سوراحی جواندا شەرابیان بۆ دەگێڕن (يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ*بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ) (الواقعە: ١٧ -١٨).

لە ساڵی ١٣٥٢ی کۆچی کاتێك گەورە زانای شیعە لە سوریا سەید محسن الامین العاملی ئەم کردەوانەی قەدەغە کردو جورئەتێکی بێ وێنەی نیشاندا لەدەربڕینی بۆچوونی خۆیو داوای لە شیعە کرد دەست لەم کارانە هەڵگرن ڕووبەڕووی بەرهەڵستییەکی بەهێز بووەوە لەلایەن زانایانو پیاوانی ئایینی شیعەو لە پشتیانەوە ئەو خەڵکە نەفامو ڕەشۆکەو لەوەدا بوو هەنگاوە چاکسازییەکانی سەرنەگرێت ئەگەر باپیرەمان سەید ئەبولحەسەن کە ئەو کاتە پێشەوای گەورەی شیعە بوو پشتی نەگرتایەو پشتگیری ڕەهای خۆی بۆ خۆیو فەتواکەی دەرنەبڕیایە.

ئەم هەڵوێستەی باپیرمان ڕەهەندێکی گەورەی بەخشی بەو بزووتنەوە چاکسازییەی سەید محسن الامین، وە لەگەڵ ئەوەی کە زۆرێك لەزاناو موجتەهیدەکانی شیعە بەرهەڵستی سەید ئەبولحەسەنیان کرد بەهەمان شێوەی کە پێشتر بەهەرڵستی (سەیید محسن الامین)یان کرد بەڵام لە کۆتاییدا خۆڕاگرتنی زاڵ بووە بەسەر هەموانداو جەماوەرەکە بەگوێی فەتواکەیان کردو ئەو کردەوانە وردە وردە دەستی کرد بەکەم بوونەوەو بزربوون لەسەر گۆڕەپانی شیعە بەڵام بەتەواوی لەناو نەچوونو هەندێك دیاردەی کەمی هەرمایەوە تاوەکو مردنی باپیرەمان ساڵی ١٣٦٥ك کە هەندێك لە پێشەوا مەزهەبیە نوێکان دەستیان کردەوە بە هاندانی خەڵکی لەسەر ئەو کردەوانەو دیسانەوە سەریان هەڵدایەوەو تەشەنەیان کرد بەڵام نەگەیشتە ڕادەی ئەوانەی پێش ساڵی ١٣٥٢ك.

وە دوای ئەوەی کە لە ئێراندا جمهوری ئیسلامیی ڕاگەیانراو ویلایەتی فەقیە دەسەڵاتی گرتەدەست بڕیارەکان دەرکران بۆ نوێ کردنەوەی ئەو جۆرە نەریتانە وەکو بەشێك لە سیاسەتی مەزهەبی جمهوری ئیسلامی ساوا دەستی کرد بە یارمەتیدانی شیعەکان لەسەرانسەری دونیاداو بەشێوەی ماددیو مەعنەوی کۆمەکی دەکردن بۆ زیندووکردنەوەی ئەم بیدعەتەی کە سیاسەتی داگیرکەرانەی ئینگلیز پێش دووسەد ساڵ هێنایە ناو جیهانی شیعەوە بۆ ئەوەی ئیسلام لە شێوەیەکی ناشیریندا نیشان بداتو پاساوی داگیرکردنی ئەو وڵاتانەی بەدەستەوە بێت[1]، وە کاتێك کە ئەم دێڕانە دەنووسم شارە شیعەکانی

[1] .یەکێك لە قسەکانی خومەینی ئەمەیە "بگرین لەخۆبدەن، ئەم گریانە بوو ئەم شۆڕشەی سەرخست"

ئێرانو پاکستانو هیندستانو لوبنانم دەبینی بەداخەوە لەڕۆژی عاشورادا سالآنە کۆمەڵ کۆمەڵ بە جادەکاندا دەڕۆنو پێش ئاوابوونی ئەو ڕۆژە چەندین وێنەی ناشیرینو دڕندانەو شێتانەی ترسێنەر لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن لە ڕۆژهەلآتو ڕۆژئاوادا لێدەدرێت بۆ ئەوەی هێزێك ببەخشێت بە دوژمنانی ئیسلامو مسوڵمانان[1]

## ڕاستکردنەوە:

پێویستە لەسەر چینی ڕۆشنبیری شیعە هەموو هەوڵێك بدەن بۆ ڕێگرتن لەنەفامی شیعە لەهەستان بەم جۆرە کارانەی کە دیمەنی شۆڕشی حوسەینی شێواندووە، وە پێویستە لەسەر ئامۆژگاریکەران ڕۆڵێکی ڕۆشنترو چاکتر ببینن، وە ئەو ڕاستییەی کە دەمەوێت بەڕاشکاوی بیلێم ئەوەیە کە ئەو هۆیەی وای لە حوسەین کرد خۆی بە کوشتن بدات لەڕۆژی عاشورادا زۆر لەو وێنەیە گەورەتر بوو کە شیعە بۆی دەکێشێت.

حوسەین بۆ ئەوە شەهید نەبوو کە خەڵکی بۆی بگرینو لە خۆیان بدەنو لە شێوەی کەسێکی بێچارەی داماودا نیشانی بدەن بەڵکو ئیمام دەیویست وانەیەکی کاریگەر بەخەڵکی دابدات لە ئازایەتیو جوامێریو خۆبەخت کردن لەڕوویەڕووبوونەوەی ستەمو تاگڕەویدا، بۆیە ئاهەنگ گێڕان لە یادی

---

[1] ئەو کاتەی نووسەر ئەم کتێبەی نووسیوە حکومەتی عێراق ئەو جۆرە کارانەی سنووردارکردبوو بۆیە نووسەر ئاماژەی پێنادات، وە ئەوانەی ئەو کاتە زۆر کەم بوون لەچاو ئەوەی ئێستا لە عێراقدا دەکرێنو ڕۆژدوای ڕۆژ لە عێراقدا زیاتر پەرەی پێدەدرێتو بۆنەی نوێ دادەهێنرێتو ئەو کۆڕەوانە قۆرخ نەماون بە عاشوراو موحەڕڕەمەوە بەڵکو ئێستا لەیادی مردنی هەموو ئیمامێکدا ئەو بەزمە دەگێڕنو سۆزی خەڵکی دەوروژێننو عەقڵیان دەکوژێننەوە.

شەھیدبوونی حوسەیندا پێویستە بەشێوەیەك بێت شیاو بۆ پلەو پایەی حوسەین‌و دوور لە نەفامان‌و ھەرچی‌و پەرچییان (غوغاء)و ئەو کردەوانەی کە گریێنەرو پێکەنین ھێنەرن، وە چەند جوانە ئەو ئاھەنگە ڕۆشنبیرییانەی کە وتارو ھۆنراوەی کاریگەرو ژیانی پێغەمبەرو ئەھلی بەیت‌و یارانی تێدا دەخوێنرێتەوە دەربارەی جیھادو خۆبەختکردن لە پێناوی خوادا.

بەو شێوەیە دەبێت خۆمان بنیات بنێین لەیادی حوسەینیدا نەك بیڕوخێنین،وە پێویستە حوسەین مافی خۆی بدەینێ لەبەرەکانی تێکۆشاندا نەك بیشێوێنین‌و لەکەداری بکەین ئەگەر بەڕاستی لایەنگرو ھەواداری حوسەینین.

## چەند سەرنجێك:

سەیرم لە موسوڵمانان دێت کە چۆن لە ئاستی لەخۆدانی شیعە بەو وەحشییەت و نامرۆیانەیە لە عاشورادا بێدەنگ دەبن یا هەندێك جار هەنێکیشیان بەشداری تێدا دەکەن. کردەوەگەلێك کە بە هەموو پێوەرێك ناشەرعی و نا مرۆیانەیەو کاریگەری لە چاندن و وروژاندنی ڕق و کینە لە نێوان موسوڵماناندا زۆر زۆرەو ئەو ئەدەبییاتەی تێدا دەخوێنرێتەوە هەمووی ڕق و قین و دوژمنایەتی لێ دەبارێ و تێکڕا هاندانە بۆ تۆڵە سەندنەوە کەچی زۆرێك لە موسوڵمانان نەك هەر گوێ بەلایەنە شەرعییەکەی نادەن بەڵکو کاریگەرە نێگەتیڤەکەشی نازانن لەسەر پەیوەندی نێوان شیعەو سوننە ! کارەساتێکی دڵتەزێن زیاد لە هەزارو سێسەد ساڵە ڕوویداوە، ئەنجامدەرانی هەموو لەدونیادا بە تۆڵەی خۆیان گەیشتن (تۆڵەی دوارۆژیش بوەستێت)، موختاری سەقەفی هەموو بەشداربووانی لە کوشتنی حوسەیندا کوشت، عەبباسییەکان تۆوی ئەمەوییەکانیان چنی و منداڵی سەر بێشکەشیان کوشتن و چەند کەسێکیان نەبێت دەرباز بوون بۆ ئەندەلوس ماباقی تۆویان بڕاو لە سزای بەناحەق کوشتنی نەوەی پێغەمبەر خوا نەوەی بۆ نەهێشتن کەچی شیعە تا ئەمڕۆ بۆ مەبەستگەلێکی سیاسی ساڵانە ئەو هەموو سیناریۆیە دەگێڕن !. وەئەگەر گومانت هەیە لەوەی کە ئەوە سیناریۆی سیاسیی و پڕپاگەندەی مەزهەبییە بڕوانە بۆ قەبری هەردوو ئیمامی عەلی هادی و حەسەنی عەسکەری، کاتێك تەقێنرانەوە چییان بۆ کردن و چی خوێنیان لە پێناویدا ڕشت و چەند ماڵی خوایان ڕوخاند کەچی تاکو ئێستا نەچوون بەلایداو وەکو خۆی هێشتوویانەتەوە بەڵام بۆ ڕق هەڵساندنی شیعە هەمیشە شیوەنی دەکەن. دەبوایە ئەگەر ڕاست دەکەن خۆشیان دەوێن یەکسەر چاکیان بکرنایەتەوە نەك وەکو خۆی بیهێڵنەوەو شیوەنی بۆ بگێڕن!

٢-لەوەش سەیرتر بێدەنگی ڕێکخراوە مرۆییەکان و ناحکومییەکانە لە ئاستی ئەو کارە نامرۆییانەداکە لە عاشورادا دەکرێت لەکاتێکدا کە دونیا دەوروژێنن لەسەر سعودییە لەسەر ئەوەی کە ڕێگە بە ئافرەت نادەن شۆفێر لێخوڕێت!. بێدەنگی ئەو لایەنانە گومانێك دروست دەکات کە جۆرە هاوپەیمانێتییەك هەبێت لەنێوان شیعەو ڕۆژئاوادا.

٣-پێویستە لێکۆڵینەوەی ورد بکرێت لەسەر ئەوڕێوڕەسمەی لەعاشورادا دەکرێت وئەو ئەدەبییاتەی تێیدا دەخوێنرێتەوە وکاریگەری نێگەتیڤی لەسەر دەروونی خەڵکی وکاریگەری لە سەر بڵاوبوونەوەی ڕق و کینەو دووبەرەکی لەنێوان موسوڵماناندا. لەو باوەڕەدام یەکێك لە هۆیەکانی بێدەنگی ڕۆژئاوا لەو ڕێوڕەسمەو ئەو شتە نامرۆییانەی تێیدا دەکرێت و ئەو ئەدەبییاتە دووبەرەکی خەرەوەیەی کە تێیدا دەخوێنرێتەوە لەبەر ئەوەیە کە ئەو شتانە ناکۆکی لە نێوان موسوڵماناندا دەنێنەوە،ئەمەش شتێکە دەڕژێتە خانەی دوژمنانی ئیسلامەوەو مەبەست و ئامانجی ئەوان بەدیدەهێنێت.هەروەها لەبەر ئەوەی بۆ ناشیرین کردنی ئیسلام سوودی لێوەرگرن لە بەردەم هاوڵاتییانی خۆیاندا.

٤- نازانم کەی کاتی ئەوە دێت کە ڕۆشنبیرانی شیعە بە زاناکانیان بڵێن: ئەرێ ئەوە بەس نەبوو، ئەم شین و لەخۆدانە تاکەی ؟ ساڵێ نەبوو دەنەبوو سەد نەبوو هەزار نەبوو، کەس بە مەزڵومی نەکوژرا حوسەین نەبێت ؟ پاشان ئەم شینە بۆ کێ دەکەن ؟ئەگەر بۆ حوسەینە ئێستا ئەو لە بەهەشتەو دەرئەنجامی کردەوەی بکوژانیشی بینیوەو لای پەروەردگاری خۆییەتی لەوپەڕی خۆشی و بەختەوەریدایەو بکوژانیشی لە ناو سزاو لە سەرشۆڕیدان ئیتر چ پێویستی بەو شین و زارییە هەیە؟

٥- له سەرووی هەموو ئەمانەشەوە ئەم کردەوانە ئەوە دەگەیەنن کە شیعە تەماشای شەرعی بوون و ناشەرعی بوونی شتەکان ناکەن بەڵکو تەنها تەماشای بەرژەوەندی دەکەن و تاقە پێوەریان بەرژەوەندییە(ئەڵبەتە بە پێوەری خۆیان).

## شایەتمانی سێهەم

زانایانی شیعە کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێك شایەتمانی سێهەم بەو نیازەوە بڵێت کە شتێکە لە شەرعدا هاتووە ئەوە کارێکی حەرامی ئەنجامداوە.

شایەتمانی سێهەم

زانای گەورەی شیعە (السید المرتضی) کە لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا ژیاوە دەڵێت: هەر کەسێك لە بانگی نوێژەکاندا بڵێت "أشهد أن علیا ولی الله" کارێکی حەرامی کردووە، لەم بۆچوونەوە بۆت دەردەکەوێت کە شایەتمانی سێهەم لەدوای غەیبەی گەورەوە چووەتە ناو بانگی نوێژەوە بەڵام بەشێوەیەکی فەرمی وەکو تایبەتمەندییەکی مەزهەبی دەرنەکەوت تاوەکو شا ئیسماعیلی صەفەوی ئێرانی کرد بە شیعەو فەرمانیدا بە بانگدەران شایەتمانی سێهەم بخەنە ناو بانگەوەو لەسەر بڵنگۆکان بیخوێننەوە، بەو شێوەیە ئیمامی عەلی ئەو شوێنە نەگۆڕەی پێدرا دوای پێغەمبەر (ﷺ) لە جێنشینیدا.

لەوڕۆژەوە مزگەوتەکانی شیعە لەسەر ئەو ڕێچکەیە دەڕوات کە شا ئیسماعیلی سەفەوی گەشەی پێداو بڵاوی کردەوەو یەك مزگەوتی شیعە نییە لەم سەری دونیا بۆ ئەو سەری دونیا ئەم نەریتەی تێدا بەدینەکرێت.

سەیر لەوەدایە زاناکانمان هەموو یەکدەنگییەکی تەواو ڕەهایان هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم شایەتمانە لەسەردەمێکی درەنگدا ئاخنراوەتە ناو بانگەوەو تاوەکو سەدەی چوارەمی کۆچی نەزانرابوو، وەکۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەگەر ئیمامی عەلی لە ژیاندا بوایەو گوێی لەناوی خۆی بوایە لە بانگدا داری حەددی لەو کەسە دەدا کە ئەوەی دەوت.

لەگەڵ ئەوەشدا هیچ یەکێك لە زاناکانمان نەك هەر ئەم بانگەیان قەدەغە نەکردووە بەڵکو دژی ئەو زانا کەمە وەستاون کە بەرهەڵستی ئەم بیدعەتەیان کردووەو بەدەرچوون لە تەشەیوع تاوانبارکراوەو لە عەلیو نەوەکەی بێبەری کراوەو ناویان زڕاندووەو خەڵکی ڕەشۆکیان لێی هانداوە.

لێرەدا ئەو دەمارگیریە کوێرانەیە دەردەکەوێت کە دڵی هەندێك زاناو نەزانەکانی ڕش کردووەتەوەو کردونیەتە پاڵپشتی یەك.

بەڕاستی بێزاربووم لە گفتوگۆ لەگەڵ زاناکانماندا لەسەر ئەم مەسەلەیەو وەڵامێکی کلاسیکی هەیە چەندین سەدەیە ڕاهاتوون لە سەریو هیچ شتێکی نوێی تێدا نییە، ئەویش ئەوەیە کە شایەتمانی سێهەم بەشێك نییە لەنوێژ تاوەکو بەتاڵی بکاتەوەو هیچ ڕێگرێك نییە لەبەردەم خستنیە ناو بانگەوە.

پێمان وتن کێشەکە لەوەدا نییە کە ئەم شایەتمانە بەشێکە لەنوێژ یان نا، بەڵکو مەسەلەکە زۆر لەوە گەورەترە چونکە بانگ شێوازێکە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی چەسپاندوویەتیو بووەتە سوونەتێکی نەگۆڕ کە نابێت لێی لابرێت یان شتی بخرێتە سەر با وەکو شتە زیادکراوەکان ڕاستو ڕەوان بن.

وتیان: شایەتمانی سێهەم بووەتە دروشمێك لە دروشمەکانی شیعە.

پێمان وتن: دروشمی ئیسلام لە دروشمی شیعە گرنگترە، ئینجا ئایا شیعە شتێکەو ئیسلامیش شتێکی تر تاوەکو پێویستی بەدروشمێك هەبێت پێی بناسرێت؟

لێرەدا ویستیان بەرپرسیارێتیەکە بخەنە ئەستۆی خەڵکانی تر وتیان: ناتوانین داوا لە شیعە بکەین دەست لە شایەتمانی سێهەم هەڵبگرن چونکە بووەتە بەشێك لە پێکهاتەی شیعەو چۆن منداڵێك وابەستەیە بە مەمکی دایکییەوە ئەوەندە ئەوان وابەستەن بەم شایتمانەوەو هەرچییەك لە بارەی لابردنیەوە بڵێین بەفیڕۆ دەڕوات.

پێمان وتن: ئەگەر ئێوە لەسەر یەك ڕاو بۆچوون کۆببنەوەو دەنگتان بکەنەیەك‌و حوکمی خوا بەڕاشکاوی‌و بوێرانە ڕوون بکەنەوە دوو کەس دوا ناکەوێت‌و بێ گوێییتان ناکا، پاشان ئێوە ئاشکراکردنی حوکمی خواتان لەسەرە نەك جێبەجێکردنی.

هەروەها وتیان: خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (حي على خير العمل)ی لە بانگ گۆڕیوە بۆ (الصلاة خير من النوم)[1]

پێمان وتن: ئەم وەڵامە هیچ شتێك لەمەسەلەکە ناگۆڕێت وە ئەگەر ئەم شتەی دەیڵێن ڕاست بێت ئیمامی عەلی لەسەردەمی خۆیدا لایدەبردو وەکو پێشووی لێدەکردەوە، وە لە لۆژیکی ئێوەدا کردەوەی ئیمام بەڵگەیە لەسەر ڕاستییەکەی، پاشان ئێوە هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەم شایەتمانە لەسەردەمی پێغەمبەرو ئیمامەکاندا نەبووەو دواتر زیادکراوە بۆ سەر بانگ بەڵام دەستەواژەی "الصلاة خير من النوم" مەسەلەیەکە جیاوازی هەیە لەنێوان مسوڵمانانداو هەموو مسوڵمانان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی لەسەردەمی پێغەمبەردا داهاتووە، شیعە نەبێت کە دەڵێن عومەری کوڕی خەتتاب زیادی کردووە بۆ سەر بانگ، وە جیاوازیش زۆرە لە نێوان مەسەلەیەك هەموو مسوڵمانان کۆك بن لەسەری‌و مەسەلەیەکیش ناکۆکی و ڕاو بۆچوونی جیاواز هەبێت لەسەری.

ڕاستکردنەوە:

من هیچ گومانم نییە لەوەی کە شایەتمانی سێهەم کە بووەتە بەشێك لە بانگ لای شیعە لە مزگەوتەکانیاندا لەکاری تاکە کەس چووەتە دەرەوەو

---

[1] ئەمە یەکێکە لەو بوختانانەی شیعە بۆ ئیمامی عومەریان هەڵبەستووە

سروشتێکی کۆمەڵایەتی‌و مەزهەبی‌و سۆزداری(عاتفی) وەرگرتووەو گۆڕینی کارێکی ئاسان نییە بەتایبەت گەر ئەوە بزانین کە دەوڵەتێکی مەزهەبی هەیە لەناوچەکەدا برەو بەسۆزە مەزهەبییەکە دەداتو بەکاری دەهێنێت بۆ ململانێی سیاسی لەگەڵ وڵاتانی دەوروبەریدا کە سوننەن، بۆیە پرۆسەی ڕاستکردنەوە لە ئێراندا ڕووبەڕووی زەحمەتێکی گەورە دەبێتەوە وەکو هەموو هەنگاوە چاکسازییەکانی تر کە بانگەشەمان بۆ کردووە.

لەوانەیە ڕۆژێك بێت ڕژێمی جمهوری ئیسلامی توندڕەو لە ئێران بگۆڕێت بە ڕژێمێکی میانڕەوویەکێك لە ئامانجەکانی یەکڕیزی مسوڵمانانو بەرژەوەندی ئیسلام بێت، ئەوکاتە چوون بەدەم بانگەوازی ڕاستکردنەوەوە بە شایەتانی سێهەمەوە کارێکی ئاسان دەبێت، بەڵام لەم کاتەدا پێویستە لەسەرمان داوا لە شیعە بکەین لەهەر کوێیەك هەن بگەڕێنەوە بۆ ئەو بانگەی لەکاتی پێغەمبەرو ئیمامی عەلی‌و ئیمامەکانی تردا باوبووەو ئەرکی سەرشانی چینی ڕۆشنبیرو هۆشیاری شیعەیە کە ڕۆڵی چاکسازی‌و ڕاستکردنەوە لە مەزهەبەکەیاندا ببینن.

جارێکی تر من بێئومێدم لە زاناکانمان کە بتوانن قسەی ڕاست بڵێن‌و لەم بوارەدا لەگەڵماندا بووەستن، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەوان لەهەموو کەس زیاتر پشتگیری ئەم بیدعەتەو کارپێکردنی دەکەن لە مزگەوتەکاندا.

سوێند بەخوا ئەگەر ئیمامی عەلی لە ژیاندا بوایەو گوێی لەناوی خۆی بوایە لەسەر بڵندگۆکان لەگەڵ بانگدا دەخوێنرێتەوە داری حەددی دەدا لەو کەسەی ئەنجامی دەداو لەوەشی کە بووەتە هۆی ئەنجامدانی، ئیتر بۆچی کارێك لەپێناوی عەلیدا بکەن کە ئەو پێی قایل نییە!؟

جارێکی تر داوا لە شیعە دەکەین لەم بزوتنەوە چاکسازییەدا بگەڕێنەوە بۆ ئەو بانگەی بیلالی حەبەشی لە مزگەوتی پێغەمبەرو لە خزمەتی

پێغەمبەرو عەلیو یارانیدا دەیداو داوا لە بانگدەران بکەن لە مزگەوتەکانی شیعەکاندا پابەندبن بەو بانگەوە، جا ئەگەر لە مزگەوتەکاندا بانگدەران ئەو کارە بکەن ئەوە سەردەکێشێ بۆ ماڵەکانیش هەروەکو چووە ماڵی عەلیو فاتیمەی زەهرا.

## سەرنج:

شایەتمانی سێهەمیش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە شیعە پابەند نین بە دەقی شەرعەوە بەڵکو بەرژەوەندی و حەزی خۆیان چۆن بێت وادەکەن.

هاوسەرگیری کاتی (موتعە)

گەلێك کە موتعە بەرەوا دەزانێت

یان کاری پێدەکەن چۆن دەتوانێت رێز لەو

دایکانە بگرێت کە خوا بەهەشتی خستووەتە ژێرپێیان.

هاوسەرگیری کاتی

مەبەست لە موتعە ئەو هاوسەرگیرییە کاتییەیە کە شیعە لە ئێرانو ئەو شوێنانەی دەسەڵاتیان هەیە تێیدا ئەنجامی دەدەن. لێرەدا دەمەوێت بڵێم کە چوونە ناو مشتومڕی فقهی نەزۆکەوە کە چەندین سەدەی بەسەردا تێپەڕیوە ناواخنی کتێبە فیقهییەکانو تەفسیرەکان پاراستوویانە هیچ سودێکی نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەمەوێت وێنیەکی بچوكو کورت کراوە بخەمە بەردەمی خوێنەر لەم مشتومڕە فیقهیەو دوای ئەوە بچمە سەرباسی ئەو مەترسییە گەورانەی ڕوو لە شیعە دەکەن لەڕووی ئەخلاقیو کۆمەڵایەتیو مرۆڤایەتییەوە ئەگەر بێتو دەست لەم بیرۆکە گەندەڵە هەڵنەگرن، وە من بەرپرسیارێتی یەکەمو کۆتاییش دەخەمەوە ئەستۆی زاناکان کە گەنجەکانی شیعە بەو ئاقارە دژوارو ناشیرینەدا دەبەن.

زاناکانی شیعە دەڵێن: موتعە لەسەردەمی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو بەشێکی سەردەمی عومەر ڕێگە پێدراو بوو تا وەکو عومەر قەدەغەی کردو فەرمانیدا بە مسوڵمانان دەستی لێهەڵگرن، بەڵگەش بەهەندێك ریوایەت دێننەوە کە لە کتێبەکانی شیعەو هەندێك لە کتێبەکانی سوننەدا هاتووە، بەڵام تاقمە ئیسلامییەکانی تر دەڵێن موتعە نەریتێکی سەردەمی پێش پێغەمبەر بوو (سەردەمی نەفامی) خەڵکی لەسەرەتای ئیسلامدا ئەنجامیاندەدا تاوەکو پێغەمبەر لە ڕۆژی خەیبەردا یان لەحەجیماڵئاواییدا قەدەغەی کرد هەروەکو چۆن عەرەق دوای چەند ساڵێك بەناردنی پێغەمبەر قەدەغە کراو تایبەتی لەسەر دابەزی.

ئەمە کورتەی ئەو مشتومڕە فیقهییەیە کە زیاد لە هەزارساڵە لەسەر موتعە دەکرێت.

وە بەڕاستی جێی داخە کە هەندێك لەزانا گەورەکانی شیعە بەرگری لە موتعە دەکەنو کتێبیان لەوبارەیەوە نووسیوەو شانازی پێوە دەکەنو سەریان بەرز دەکەنەوە، لەو باوەڕەشدام پێویستم بە ماندووبوونێکی زۆر نەبێت بۆ ڕوونکردنەوەی وێنەی ڕاستەقینەی ئەم بیدعەتە نارێکە لەگەڵ زەوق و ڕێزی مرۆڤایەتیدا، بەڵام پێش ئەوە دەمەوێت ئەو تیۆرییە فیقهییە بەهەڵە بخەمەوە کە دەڵێت موتعە ڕێگەی پێدراوە لە شەرعداو پاشان بچمە سەر شتی لەوە گەورەتر بۆ ئەوەی شیعە مەترسی ئەو کارەو گەورەیی ئەو بەڵایە ببینن.

هاوسەرگیری کاتی یان موتعە بەگوێرەی نەریتی شیعەو بەو شێوەیەی زاناکانمان ڕێگەیان پێداوە ڕێگە داتە بە ئەنجامدانی سێکس تەنها بەیەك مەرج ئەویش ئەوەیە ئەو ژنە مێردی نەبێت ئیتر پیاو دەتوانێت بیخوازێت

بەدوو وشەو بێئەوی پێویستی بە شایەت بێت یان بەوەی کە پیاو مەسرەفی ئەو ژنە بکێشێتەو بۆ ئەو ماوەیەی کە دیاری دەکاتەو لەگەڵ پاراستنی ئەو دەسەڵاتە ڕەهایە بۆ پیاو کە دەتوانێت لەیەك کاتداو لەیەك شوێندا موتعە لەگەڵ هەزار ژندا بکات.

ئەو تیۆرییە فیقهییە کە دەڵێت موتعە بەفەرمانی عومەری کوڕی خەتتاب قەدەغەکراوە کردەوەی ئیمامی عەلی لەکاتی دەسەڵاتی خۆیدا بەدرۆی دەخاتەوە، ئیمامی عەلی لەسەردەمی خۆیدا موتعەی بەحەرامی هێشتەوەو فەتواو فەرمانی نەدا بە ڕێگەپێدانی، کردەوەی ئیمامیش لەنەریتی شیعەو بە ڕای زاناکانمان بەڵگەیە لەسەر شیعە بەتایبەت ئەگەر بێتو ئیمام دەسەڵاتی هەبێتەو بتوانێت ڕای خۆی دەربڕێتەو فەرمانەکانی خوا ئاشکرا بکات، ئیمامی عەلیش وەکو دەزانین خیلافەتی ڕەتکردەوەو مەرجی دانا بۆ وەرگرتنی ئەویش ئەوەیە کە بە ئیجتیهادو بۆچوونی خۆی فەرمانڕەوایی بکات.

کەواتە هێشتنەوەی موتعە بە حەرامی ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کارە لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) حەرام کراوە ئەگینا ئیمامی عەلی دژی ئەو حەرامکردنە دەوەستاو حوکمی خوای ئاشکرادەکرد لەبارەیەوە، کردەوەی ئیمامیش بەڵگەیە لەسەر شیعە ئیتر نازانم چۆن زاناکانمان دەتوانن ئەم شتە بدەن بەتەختی دیواردا؟.

وەکو کەمێك لەمەوبەر وتم مشتومڕی فیقهی دەخەمە لاوەو لەچەند لایەکی زۆر گرنگی ترەوە تیشك دەخەمە سەر موتعەو پاشان ئەو وێنەیە دەخەمە بەردەم چینی ڕۆشنبیرو هۆشیاری خاوەن ئینساف لەڕۆڵەکانی شیعەی ئیمامی، ئەوانەی کەپشتیان پێ دەبەستم لە ئەنجامدانی ئەم

ڕاستکردنەوەیەو ئومێدو هیوام بەوانە کە پێشەوایەتی ئەم چاکسازیو ڕاستکردنەوەیە بکەن.

ئەو ئیسلامەی کە هاتووە بۆ ڕێزنان لە مرۆڤ وەکو ئەم ئایەتە دەفەرموێت: "ئێمە ڕێزمان لەنەوەکانی ئادەم ناوە" إسراء/ ٧٠.

پێغەمبەریش دەفەرموێت: "من نێردراوم بۆ ئەوەی ڕەوشتە جوانەکان تەواوو پتەو بکەم"

ئایا ئاوها ئاینێك یاسایەك دادەهێنێت بەڕەڵایی سێکسیو بێ ڕێز کردنی ئافرەتی بەڕادەیەك تێدابێت کە تەنانەت لە کۆمەڵگە ئیباحییە کۆنو نوێکانیشدا نەبینرێت؟ تەنانەت لویسی چواردەهەم لە کۆشکەکەی خۆی لە فەرسایو سوڵتانە تورکەکانو پاشا فارسەکان لە کۆشکەکانیاندا جورئەتی شتی وایان نەبووە.

نەوەکانی ئادەم لە ئایەتەکەدا پیاوو ژن وەکو یەك دەگرێتەوەو ئەو ڕەوشتانەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە جوانترینیان بەرپا بکات بۆ هەردوو ڕەگەزەکەیە، ئایا ڕێزو پلەو پایەو پاراستنی ڕەوشتی ئافرەت لەکوێی یاسای موتعەدا بەدی دەکرێت؟ ئافرەت لەم یاسایەدا جگە لە سوکایەتی پێکردنو وەکو کەرەستەیەك تەماشا کردن کە پیاو دەتوانێت لەسەر یەك بێ ژمارەو بێ سنوور کەڵکەیان بکات هیچی تری تێدا نییە.

ئەو ئافرەتەی کە خوا ڕێزی ئەوەی لێناوە ببێت بە دایكو گەورە پیاوانو گەورە ژنانی لێ ببێتو خوا پلەیەکی پێ بەخشیوە بەکەسی تری نەبەخشیوە کاتێك بەهەشتی خستووەتە ژێر پێیانەوە وەکو پێغەمبەری بەڕێز (ﷺ) دەفەرموێت: "بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە"

ئایا شیاوە بۆ ئاوها ئافرەتێك کاتی خۆی لەکۆشی پیاواندا یەك لەدوای یەك بباتە سەر بەناوی شەریعەتی موحەممەدەوە؟

هەندێك لەزاناكانمان ویستیان موتعە وا نیشان بدەن كە چاكەیەكە لەلایەن خواوە بۆ ئەوەی ڕێگری لە پیاوان بكات لەوەی بكەوتە زیناوە بەڵام لە یادیان چووە كە ئیسلام تەنها ئاینی پیاو نییە بەڵكو بۆ هەموو مرۆڤایەتییە بە پیاوو ژنەوەو یاسا خواییەكانو شەریعەتە ئاسمانییەكان بۆ ئەوە نەهاتوون بەناوی یاساو شەریعەتەوە ئارەزووەكانی خەڵك تێر بكەن.

ئیسلام هاتووە خەڵكی لەوبەرەڵڵایی سێكسیە ڕزگاربكات كە لەسەردەمی نەفامیدا پەیڕەوی دەكراو بیانبەستێتەوە بەڕەوشتی بەرزو چاكەوە نەك پیرۆزی شەریعەتو یاسای خوایی ببەخشێت بەو نەریت ودیاردە جاهیلییانە.

ئەو ئیسلامەی كە لەچوار ژن زیاتری قەدەغەكردووەو مەرجی زۆر قورسی بۆ فرەژنی داناوە وەكو لەم ئایەتەدا هاتووە: "ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو كە دادپەروەر نەبن ئەوا تەنها یەك ژن بێنن" نساء/٣.

بەرپاكردنی دادپەروەریش كارێكی قورسو سەختەو ئەم مەرجە بۆ ئەوەیە كە پیاو ببەستێتەوە لەوەی كە بەمەیلی خۆی فرەژنی بكاتو ڕێگای شەهوەتەكانو ئارەزووەكان بگرێتەبەر زیاد لەوەی كە سروشتو پێویستی مرۆڤایەتیو ڕێكخستنی خێزانو نەوەو بەرژەوەندی میللەت دەیخوازێت لێرەوەیە كە زۆر سەرزەنشتی تەڵاق كراوە وەكو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "خراپترین حەڵاڵ بەلای خواوە تەڵاقە"

تەڵاقیش پاوان كراوە بەهەندێك مەرجو پێوەندی قورسەوە، لەوانە ئامادەبوونی دوو شایەتی دادپەروەر بۆ ئەوەی تەڵاق جێبەجێ ببێت[1]

---

[1] ئامادەبوونی شایەت لەكاتی تەڵاقدا تەنها لەمەزهەبی شیعەدا هەیە، ئەمەش یەكێكە لە شتە سەیرەكانی مەزهەبی شیعە، لەلایەكەوە سێكس بەرەهایی ئەنجام دەدرێتو زەواجی موتعە

ئاینێکی ئاسمانی ئەمە هەڵوێستی ڕاشکاوو نەگۆڕی بێت لە ژنهێنانو مەرجەکانی، ئایا بە عەقڵەوە دەچێت کە یاسایەکی تر دابنێت پێچەوانەی ئەو بێتو ئەوەندە بەرەڵلایی تێدابێت کە ئاسمانو زەوی بهێنێتە لەرزەو پاشان مرۆڤەکان سەرپشك بکات لەنێوانیاندا؟

لێرەدا دوو وێنەی هاوسەرگیری دەخەمە بەردەمی خوێنەر، یەکێکیان هەموو مسوڵمانان لەسەری کۆکن بە شیعەو سوننەوە ئەویش هاوسەرگیری هەمیشەییە، ئەوی تریشیان کە هاوسەرگیری کاتییە یان موتعە کە تەنها شیعەی ئیمامی فەتوای حەڵاڵی دەدەنو داوا لە شیعە دەکەم قسەی خۆیان لەم بارەوە بڵێن.

---

هەرتەلاقدانی تێدا نییەبەڵکو کە کاتە دیاریکراوەکە تەواو دەبێت هەریەکەو دەڕوا بەلایەکدا، لەولاشەوە بۆ تەلاق مەرجی دوو شایەت دادەنێن، دیارە ئەمەشیان بۆ پاوانکردنی پیاوان داناوە بۆ ئەوەی هەموو ڕۆژێك ژنەکانیان تەلاق نەدنو هەر ڕۆژێك موتعەیەکیان کرد ژنەکانی خۆیانیان لەبەرچاو نەکەوێتو لە کەشو هەوایەکی شاعیریدا ژنەکانی خۆیان تەلاق بدەن. ئاشکرایە کە یەکێك لە هۆکارەکانی دەست گرتنی پیاووژن بە ژیانی هاوسەرێتییەوە پێویستی هەردوولایە بەیەکتر بەڵام ئەگەر لایەنێکیان هەست بکات زۆر پێویستی بەوی تر نییە دەسبەرداری دەبێت وەکو ئەوەی کە ئەمڕۆ لە ڕۆژئاوا ڕوودەدات ، لەبەر ئەوەی کە پیاوو ژن ئازادن لە مومارەسەی سێکسدا ژیانی ژن و مێردایەتی درێژ ناخایەنێت و لە یەك جیابوونەوە زوو زوو ڕوودەدات. نەك هەر ئەوە بەڵکو لە هەر شوێنێك ئەنجامدانی سێکس ئاسان بێت و گەنج بە ئاسانی ئەو شتەی دەسکەوێت پشت لە ژن هێنان هەڵدەکەن موتعەش هەمان شتە هەر پیاوێك ڕۆژی لە گەڵ ژنێکدا موتعە بکات بەتەنگ ژنیەوە نامێنێت و دەست لێهەڵگرتنی یا پێشێل کردنی مافەکانی بەلاوە ئاسان دەبێت بۆیە پێویستی کردووە پیاو پاوان بکرێت و مەرجی سەخت بۆ تەلاق دابنرێت .بەڵام بە نیسبەت سوننەوە وانییە و پێویستی بەردەوام پیاو بە ژنەکەی وای لێدەکات دەستی پێوە بگرێت و پێویستی بە هۆکاری دەرەکی نەبێت وای ناچاری بکات دەست بە ژنەکەیەوە بگرێت .

مەرجەکانی هاوسەرگیری هەمیشەیی کە هەموو مسوڵمانان لەسەری کۆکن:

١ـ هاوسەرگیری بەئەنجام دەگەیەنرێت بەوتنی شێوازی گرێبەندی هاوسەرگیری لەلایەن هەردوو لاوە بە ئامادەبوونی دوو شایەت.

٢ـ لەسەر پیاوە خەرجی ژن بکێشێت بە پۆشاكو خواردنو نیشتەجێ بوونەوە.

٣ـ پیاو بۆی نییە لەیەك کاتدا چوار ژن زیاتری هەبێت، ئەویش بەمەرجی قورس.

٤ـ ژن میراتگری مێردەکەیەتی لەدوای مردن.

٥ـ ڕازی بوونی باوك (یان سەرپەرشتیار) بۆ کچ.

٦ـ ماوەی هاوسەرگیرییەکە بەردەوامە تا لە ژیاندا ماون.

هاوسەرگیری کاتی کە تەنهاشیعەی ئیمامی ئەنجامی دەدەن.

١ـ هاوسەرگیری پێك دێت بەوتنی شێوازی گرێبەندی هاوسەرگیری کاتی لەلایەن هەردوولاوە بەبێ شایەت.

٢ـ پیاو هیچ خەرجییەکی لەسەر نییە تەنها ئەوەی لەکاتی مارەبڕینەکەدا دەیدات.

٣ـ پیاو بۆی هەیە لەیەك کاتدا بێشومار ژنی کاتی هەبێتو بەبێ هیچ مەرجێك.

٤ـ ژن هیچ میراتییەکی مێردەکەی بەرناکەوێت.

٥ـ ڕازی بوونی باوك (یان سەرپەرشتیار) لە هیچ کاتێکدا مەرج نییە.

٦ـ ماوەکەی لە چارەکەسەعاتێکەوە بۆ نەوەد ساڵەو بەو شێوەیەی کە پیاو پێشنیازی دەکات و ژن پەسەندی دەکات.

مەرجەكانی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیری هەمیشەیی:

١ـ جیابوونەوە ڕوودەدات بە ئامادەبوونی دوو شایەتو وتنی شێوازی تەڵاق.

٢ـ عیددەی تەڵاق بۆ ئافرەت چوار مانگو دە ڕۆژە.

٣ـ ئەگەر ئافرەت لە حەیز (بێ نوێژی)دا بێت تەڵاقەكە ناكەوێت.

٤ـ خەرجی ژن لەماوەی عیددەدا لە سەر پیاوە.

مەرجەكانی هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیری كاتی:

١ـ جیابوونەوە ڕوودەداتو پێی دەوترێت هەڵوەشاندنەوەی گرێبەندەكە بەبێ شایەتو بەوشەی هەڵوەشاندنەوە یان ماوەكەم بەخشی.

٢ـ عیددەی ئافرەتەكە وەكو هی كەنیزەك وایە واتە نیوەی عیددەی ئافرەتی ئازاد.

٣ـ تەڵاق لەهەموو حاڵەتێكدا دەكەوێت.

٤ـ پیاو هیچ خەرجییەكی لەسەر نییە لەماوەی عیددەدا.

تێڕوانینێكی پشكنەرانە بۆ ئەم خشتەیەی كێشامان ئەوەمان لەكۆڵ دەكاتەوە بەدرێژی باسی خراپەو مەترسییە كۆمەڵایەتییەكانی موتعە بكەینو دڵنیام لەوەی كە بانگەوازی ڕاستكردنەوە هەموو ئەو كەسانە كۆ دەكاتەوە لەدەوری خۆی كە دڵو ژیرییەكی هەیەو دەتوانێت پەی ببات بە گەورەیی ئەو كارەساتو گاڵتەجاڕیو سوكایەتییە لەمەسەلەیەكدا كە لەڕۆژی نیوەڕۆ ڕونترە.

## ڕاستکردنەوە:

مەسەلەکە لێرەدا زۆر لەڕاستکردنەوە گەورەترە، خراپەیەکی بی وێنەیە چووەتە ناو هزری شیعەوە و ئەو ڕیوایەتانەی کە دەڵێن حەڵاڵە چ کتێبەکانی شیعە باسیان کردبێت وە یان غەیری ئەوان وە تەنانەت ئەوانەش کە دەڵێن لەسەرەتادا حەڵاڵ بووەو دوایی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب حەرامی کردووە هەمووی ڕیواتگەلێکن وێنە گەشەکەی ئیسلام دەشێوێنن.

تاقمە ئیسلامییەکانی تر پەیان بە مەترسی مەسەلەکەو گەندەڵیە کۆمەڵایەتیی‌و ئەخلاقییە گەورەکەی بردووە بۆیە هەڵوێستی ڕاست‌و ڕەواو چاکیان لێوەرگرتووە، بەڵام زاناکانمان پەیان بەمەترسی ئەم بیرۆکەیە نەبردووە، یا بردوویانە بەڵام لە ئەنجامی سووربوونیان لەسەر خۆ جیاکردنەوە لەسەرجەم مسوڵمانان‌و ڕەفتارکردن بە پێچەوانەیانەوە لەسەر بنەمای ئەو فەرمودەیەی کە بە درۆو بوختان دراوەتە پاڵ ئیمام جەعفەری صادق کە گوایە دەڵێت: "ڕاستی لەوەدایە پێچەوانەیان بکەن" واتە لە پێچەوانەکردنی ئەهلی سوننە، موتعەی نەفرەت لێکراویان ڕێگەپێداوەو خەڵاڵ کردووە.

وە سەرباری ئەم گرێ کوێرەی زاناکانمان لەهەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکاندا (واتە پێچەوانەیی کردنی ئەهلی سوننە) پێدەچێت بیرۆکەی حەڵاڵکردنی موتعە بەکارهێنبراوە بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی بەتایبەت گەنجان لەدەوری شیعە لەبەر ئەو ئاسانکارییانەی تێیدا کراوە بە تایبەت لەم ڕووەوە، گومانیشی تێدا نییە کە بەرەڵلایی سێکسی بەناوی ئاینەوە حەڵاڵ بکرێت گەنجان‌و کەسانی دەروون نزم لەهەموو سەردەمێکدا بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن، لەبەرئەوە بەلامەوە سەیر نییە کاتێك لە کتێبەکانماندا ڕیوایەتگەلێك دەخوێنمەوە لەسەر چاکی‌و پاداشتی موتعەو هاندانی خەڵکی

بۆ ئەنجامدانی بدرێتە پاڵ ئیمامەکانمان، هەڵوێستیشم لەم ریوایەتانە ڕوونو ئاشکرایەو ڕاشکاوانە ئاماژەم پێداوە لەزۆر شوێنی ئەم کتێبەدا، هەموو مەبەستیشمان ڕزگارکردنی شیعەیە بە ئیزنو ویستی خوا، وە من کاتێك ئەم دێڕانە دەنووسم بۆیەك چرکەش نائومێدی نامگرێ دەبارەی داهاتووی شیعەو هەڵوێستی لە ڕاستکردنەوەو گەڕانەوەیان بۆ بنەماکانی ڕاستکردنەوە.

بەڵێ لەوانەیە ڕاستکردنەوە ڕووبەڕووی دژوارییەکی زۆر ببێتەوە لەسەرەتادا بەڵام وتەی ڕاستیو ڕەوا لە کۆتاییدا جێی خۆی دەکاتەوە ، وە کۆبوونەوەی چینی ڕۆشنبیری هۆشیار لەدەوری کە دەتوانێت خۆی لەو نیشتووە فکریانە ڕزگار بکات کە باوکانو دایکانو زاناو مامۆستا ئاینییەکان فێریان کردوون باشترین دابینکارن بۆ داهاتووی شیعە لە جیهاندا.

جارێکی تر دەگەڕێمەوە بۆ هاوسەرگیری کاتیو لەو زانایانەمان دەپرسم کە فەتوای حەڵاڵی دەدەنو هانی خەڵکی دەدەن بۆ کردنی، ئایا ئەوان بەئاوها شتێك قایل دەبن بکرێت لەگەڵ کچەکانیانو خوشکەکانیانو خزمەکانیان یان کاتێك شتی وا دەبیستن ڕەش دادەگەڕێنو شادەمارەکانی دەموچاویان پڕ دەبێت لە توڕەییداو توڕەییەکەشیان ناشارنەوە؟

زانای گەورە محسن الامین العاملی ویستی بە قسەیەکی نزیك لەوەی من بەرگری لەم بۆچوونە بکات وتی: "ئەگەر موتعە ڕێگەپێدراوبێت مەرج نییە هەموو کەسێك بیکات چەندین شتی ڕێگە پێدراو هەیە خەڵکانێك بە شیاوو گونجاوی نازانن بیکەن" (خۆیانی لێ بەدوور دەگرن)[1]

---

[1] شیعە لەنێوان ڕاستی خەیاڵدا ل٣٥٧.

بەڵام دەڵێم: ئاشکرایە کە مەسەلەکە بەم شێوەیە نییە واتە ئەوانەی کە ڕازی نابن خوشکانو کچانو خزماتی خۆیان موتعە بکەن لەبەرئەوە نییە کەخۆیان بەدوور دەگرن لێی بەڵکو دەزانن کە ئەمە شورەییەو لەگەڵ ڕێزو پایەداری خێزاندا ناگونجێتو لەهەندێك شوێنی شیعەنشینندا لەوانەیە خوێنی لەسەر بڕژێت گەر کەسێك داوای شتێکی وا لە زانایەك بکات گەر خۆی سەرگەورەی هۆزەکەی بێت، تەنانەت لە ئێرانیشدا بەهیچ شێوەیەك ناتوانی ناوی موتعە بێنی، ئەمما لە غەیری ئێراندا بەتایبەت لەوڵاتە عەرەبییەکاندا کە شیعەیان تێدایە باسکردنی موتعە کێشەیەو لەوانەیە ببێتە هۆی خوێن ڕشتن[1].

دەربارەی پاکستانو هیندستانو ئەفریقا بەوردی ئاگام لێی نییە بەڵام لەهەموو ئەو شوێنانەدا زانای شیعە فەتوای خۆی دەدات بە حەڵاڵی موتعە ئەگەر پرسیاری لێبکرێت بەڵام پابەندە بەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی تێیدا دەژیو مووی گرژ دەبێتو دونیا دەشێوێنێ بەسەریەکدا ئەگەر کەسێك داوای لێبکات کچەکەی بەماروبڕینی کاتی بخوازێت.

بەو شێوەیە بەڕوونی دەبینین بەرپرسیارێتی ئەم کارە زشتو نەشیاوە هەمووی هەر لەسەرمتاوە ئاکۆتایی دەکەوێتە ئەستۆی ئەوانەی ناموسو شەرەفی خەڵکییان هەرزان کردووەو هی خۆیانیان پاراستووە، ئەمەش ئەو پەڕی پەندی تێدایە بۆ کەسێك دڵی هەبێت.

---

[1] ئێستا وا نەماوە بەتایبەت لە عێراقدا.

## چەند سەرنجێك:

پێوەرێك بۆ ئەوەی بزانی کە شیعە شوێن کەوتووی ئارەزووەکانن نەك پابەندی شەرع: باشترین بەڵگەی بەرجەستە بۆ ئەوەی بزانی کە شیعە بەگوێرەی مەزهەب فەرموودەیان لەسەر زمانی پێغەمبەر و ئیمامەکانیان هەڵبەستووە تەقییەو زەواجی موتعەیە کە تایبەتن بەمەزهەبی شیعەوە.بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم خاڵە دەڵێین: لە شەرعدا دووشت هەی پێیان دەوترێت روخسەت و عەزیمەت بۆ نموونە وەستان لە رووی فەرمانڕەوای ستەمکارداو قسەی حەق وتن و خۆ خستنە بەر مەترسی زیندان وئازارو ئەشکەنجەو کوشتن بەرزترو پاداشتی زۆرترە لە شاردنەوەی ڕاستی و وتنی شتێکی ناحەق لە پیاهەڵدان و زۆر لەوەش زیاترە کە پێچەوانەی ڕاستی بڵێیت و شتی ناشەرعی بڵێی بۆ پاراستنی گیانی خۆت و خۆ دەربازکردن بەتایبەت بۆ زاناو پێشەوایان. حاڵەتی یەکەم عەزیمەیە و دووەم پێی روخصەیە کە تەقییە کردنە بەڵام شیعە دەبینی لەسەر تەقییە کە روخسەتە دەیان فەرموودەیان داوەتە پاڵ ئیمامەکانیان،لەوانە:لە جەعفەری صادقەوە: "تەقییە ئاینی من و باپیرانمەوئەوەی تەقییە نەکات ئایینی نییە" اصول الکافی ج٢ ص٢٢٣." نۆ لەسەر دەی ئاین لە تەقییەکردندایە وە ئەوەیشی تەقییە نەکات ئاینی نییە".اصول الکافی ج٢ ص٢١٧.لەو تەفسیرەی دەدرێتە پاڵ حەسەنی عەسکەری(ئیمامی یازدەهەمی شیعە) هاتووە کە دەڵێت: "خوا لەهەموو گوناهێکی بڕوادار خۆش دەبێت لەدونیاو دوارۆژدا دووگوناه نەبێت: وازهێنان لە تەقییەو فەوتاندنی مافی برایان" تفسیر الحسن العسکری ل١٣٠، وسائل الشیعة ج١١ص٤٧٤ .

نموونەیەکی تر هاوسەرگیری کاتی وهاوسەرگیری هەمیشەییە، ئاشکرایە کە هاوسەرگیری هەمیشەیی لە هاوسەرگیری کاتی گەورەترە لەشەرعدا بە بەڵگەی ئەو هەموو ئایەت و فەرموودانەی لەسەری هاتوون و هەموو ئەحکامەکانیان بە دوورو درێژی باسکردووە بەپێچەوانەی زەواجی کاتییەوە کە تەنها یەك ئایەت هەیە ئەویش جێی مشت و مڕە کە ئایا لە سەر زەواجی کاتییە یان لەسەر هەمیشەیی، هەروەها بەبەڵگەی ژیری وواقیع و لۆژیکیش زەواجی هەمیشەیی گەورەترو شیاوترو بەکەڵکترە بۆ مرۆڤ بەڵام شیعە دەیان فەرموودەیان داوەتە پاڵ پێغەمبەر و ئیمامەکانیان دەربارەی پاداشتی موتعە لەوانە: ئەم دوو ریوایەتەی داویانەتە پاڵ پێغەمبەر: "ئەگەر کەسێك یەك جار موتعە بکات سێیەکی( لەشی) لە ئاگر رزگاری دەبێت وە ئەگەر دووجار بیکات دوولە سەرسێی لەشی لە ئاگر رزگاری دەبێت وەئەگەر سێ جار بیکات هەموو لەشی رزگاری دەبێت ".تفسیر منهج الصادقین ملا فتح الله کاشانی ج٢ل٤٨٩.

"هەرکەسێك یەکجار موتعە بکات پلەی وەکو پلەی حوسەینە وەهەرکەسێك دووجار بیکات وەکو پلەی وەکو پلەی حەسەنە وەهەر کەسێك سێجار بیکات پلەی وەکو پلەی عەلییە وهەرکەسێك چوارجار بیکات پلەی وەکوپلەی منە".هەمان سەرچاوەل٤٩٣: (تێبینی: نەمانزانی ئەوەی پێنج جار بیکات دەگاتە پلەی کێ!؟)

هەروەها لەسەر زمانی محمد الباقر دەگێڕنەوە کە دەڵێت: "کاتێك پێغەمبەر بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان وتی: جبریلم پێ گەیشت و پێی وتم:ئەی موحەممەد خوای گەورە دەفەرموێت من لەو ئافرەتانەی ئوممەتت خۆشبووم کە موتعە دەکەن".من لا یحضره الفقیه لابن بابویه القمی ج٣ ص٤٦٣.

٢- هۆی جیاوازی نێوان مەسوڵمانان دەربارەی  حەرامی و حەڵاڵی موتعەو کاتی حەرامکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە موتعە شتێك بووە زۆر بەکەمی ئەنجام دراوە بەبەڵگەی ئەوەی کە هیچکام لە هاوەڵە نزیکەکانی پێغەمبەر نەیکردووە، هەروەها هیچکام لە ئیمامەکانیش نەیانکردووە، ئەوەتا ئیمامی حەسەن ناسراو بوو بە  ژنهێنان و ژن تەڵاقدان بەڕادەیەك کە باوکی بێتاقەت دەبێت و بەیەکێك لەوانەی حەسەن داوای ژنیان لێدەکات دەڵێت ژن بەم کوڕەی من مەدەن چونکە  زوو زوو ژن  تەڵاق دەدات، ئەوانیش وتیان بەخوا سەدجاریش تەڵاقی بدات  ئێمە هەر ژنی دەدەینێ (بۆ فەڕ وبەرەکەت).لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ریوایەتێك نییە لەسەر ئەوەی کە حەسەن موتعەی کردبێت.جا ئەگەر بڕیار بووایە کەسێك موتعە بکات دەبوایە ئیمامی حەسەن بیکردایە.

لەبەر ئەوە شتێکی ئاسایی بوو ئەگەر هەموو هاوەڵان لەیەك کاتدا حەرامی موتعەیان نەبیستبێت و  هەریەکەیان بە گوێرەی زانیاری خۆی فەتوای دابێت. بەڵام ئەوەی کە گرنگە ئەوەیە کە دوای ئەوەی حەزرەتی عومەر حەرامی موتعەی بە هەموو موسوڵمانان ڕاگەیاند چیتر کەس ئەنجامی نەدا تەنانەت ئیمامی عەلی لە سەردەمی خۆیدا کە پێنج ساڵی ڕەبەقی خایاند هیچ هەنگاوێکی بە ئاڕاستەی حەڵاڵ کردنی نەنا،ئاشکراشە کە ٥ ساڵ بەسە بۆ ئەوەی کەسێك بەرنامە سیاسییەکەی خۆی بەرپابکات بە تایبەت کەسێکی وەکو ئیمامی عەلی کە ئامادەنەبوو هیچ موجامەلەیەك لە سەر حیسابی ئایینەکەی بکات.

٣- شیعە بۆ شەرعییەتدان بە موتعە هەوڵدەدەن بیشوبهێنن بەو زەواجانەی کە لە هەندێك شوێندا سەریهەڵداوە  وەکو زەواجی عورفی و

زەواجی مسیار لەکاتێکدا کە( لە گەڵ هەڵوێستی جیاوازی زانایان لەو جۆرە زەواجانە)جیاوازی زۆرە لە نێوان موتعەو ئەو زەواجانەدا وشوبهاندنیان بەیەك تەکەللوفێکی زۆری تێدایە و بە زانینی سروشتی هەریەکێك لەوانە جیاوازی نێوانیان دەزانرێت بەڵام ئەم سەرنجانە جێگەی ئەوە نییە.

٤- لەسەر ئەو بنەمایەی کە پێغەمبەر (د.خ) دایناوە: چاکە ئەوەیە کە دڵ و دەروون پێی ئارام ودڵنیادبێت و خراپەش ئەوەیە کە دڵت پێی نائارام بێت و پێت ناخۆش بێت خەڵکی پێی بزانێت دەڵێین: ئەگەر ڕاستە موتعە حەڵاڵە با شیعە بەبێ سانسۆر و ڕازاندنەوە وەکو ئەوەی کە لە کتێبەکانیاندا هاتووە باسی بکەن.بەڵام هەیهات هەرگیز ناتوانن ئەو شتە بکەن چونکە لە ڕاستیدا ئەو موتعەیەی شیعە بانگەشەی بۆ دەکەن جگە لە زینایەك کە لە بەرگی زەواجدا پێشکەشی دەکەن هیچی تر نییە.

ئەگەر بڵێین ئەگەر موتعە وەکو زینا وایە چۆن پێغەمبەر یەکسەر حەرامی نەکرد ؟. لەوەڵامدا دەڵێین: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە موتعە زۆر دەگمەن بووەو بەو شێوەیەش نەبووە کە شیعە ئەمرۆ ئەنجامی دەدەن.

## سوجده لەسەر خۆڵی حوسەین:

سوجده بردن لەسەر خۆڵی گۆڕی حوسەین لەسەردەمی دووەمی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوعدا سەری هەڵداو پاشان هەموو شیعەی گرتەوە.

سوجده لەسەر خۆڵی گۆڕی حوسەین

بەدەگمەن ماڵێکی شیعە دەبینی ئەو پارچە بەردە خۆڵینەیەی تێدا نەبێت کە شیعە سوجدەی لەسەر دەبەن لەنوێژدا، ئەو بەردەش لەخۆڵی کەربەلایە، ئەو شارەی حوسەینی تێدا شەهیدکراو تەرمە پیرۆزەکەی تێدا نێژراوە.

من باش دەزانم زاناکانمان چی دەڵێن دەربارەی سوجدە بردن لەسەر خۆڵی گۆڕی حوسەین بەوەی جیاوازی دەخەن لەنێوان ئەوە سوجدەی بۆ دەبرێتو ئەوەی سوجدەی لەسەر دەبرێت، سوجده لەسەر ئەو پارچە خۆڵە سوجده بردن نییە بۆی بەڵکو سوجده بردنە لەسەری چونکە سوجده لەمەزهەبی شیعەدا دەبێ یان لەسەر خۆڵ یان شتێك لە خۆڵ دروستکرا بێتو سوجده بردن لەسەر شتێك لەبەربکرێت یان دووراوبێت یان بخورێت دروست نییە.

سوجده بردن لەسەر خۆڵی حوسەینی وەکو دەیزانینو شیعە خۆشیان دەیزانن لەم ئاستە فیقهیەدا ناوەستێتو مەسەلەکە تەنها سوجده لەسەر خۆڵ نییە بەڵکو زۆر لەوە دوورترە، وە زۆرێك لەوانەی سوجده لەسەر ئەو خۆڵە دەبەن ماچی دەکەنو بەخۆیانی دەسوون بۆ بەرەکەتو هەندێك جاریش کەمێك لەخۆڵی کەربەلا دەخۆن بەنیازی چاکبوونەوە لەنەخۆشی لەکاتێکدا کەخواردنی خۆل لە مەزهەبی شیعەدا حەرامە، هەروەها لەو خۆڵە شێوەی جیا جیا دروست دەکەنو لەگەڵ خۆیاندا هەڵیدەگرنو لە گەشت و سەفەریشدا پێیانەو وەکو شتێکی پیرۆزو بەرێز مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن.

تاکاتی نووسینی ئەم دێڕانە ملیۆنەها شیعە لەرۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای دونیادا سوجده لەسەر خۆڵی کەربلا دەبەنو مزگەوتەکانیان پڕە لێی وە ئەگەر

لە مزگەوتی تاقمە ئیسلامییەکانی تریشدا نوێژ بکەن پەنا دەبەن بۆ تەقییەو ئەو بەردە دەشارنەوە لەترسی ئەوەی رەخنەیان لێ بگیرێت.

ئەم مەسەلەیەش سەری لە زۆر کەس شێواندووەو وا گومان دەبەن کە ئەم بەردانە بتن و شیعە سوجدەی لەسەر دەبەن و لەهەندێك شوێندا خەریك بوو کێشەو ئاشوبی رووبدات لەو مزگەوتانەی کە هیچیان دەربارەی ئەم بەردە نەزانیبوو، وە ناشزانم ئەم بیدعەتە کەی چووە ناو شیعەوە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز سوجدەی لەسەر خۆڵی کەربەلا نەبردووەو ئیمامی عەلی و نەوەکانیشی دوای خۆی سوجدەیان لەسەر شتێك نەبردووە ناوی خۆڵی کەربەلا بێت و پیرۆزگرتنی خۆڵ شتێکی باو نەبووە لەناو مسوڵمانانندا، لەوانەیە ئەم دیاردەیە دوای سەردەمی صەفەوییەکان دەستی کردبێت بەبڵاوبوونەوە کاتێك کە قافڵەی زیارەتکەران رویاندەکردە کەربەلاو لەگەڕانەوەدا خۆڵی گۆڕی ئیمام حوسەینیان لەگەڵ خۆیاندا دەبردەوە.

بیدعەیەکی تریش زیادکرا بۆ سەر بەکارهێنانی خۆڵ پێشی بیدعەکانی تری داوەتەوە ئەویش فەتوای زاناکانە بۆ ئەوانەی زیارەتی گۆڕی حوسەین دەکەین کە بۆیان هەیە نوێژ کورت نەکەنەوەو بەتەواوی بیکەن کاتێك کە بە (١٥) باڵ نزیك دەبنەوە بە گۆڕەکە، ئەوەش کە کۆدەنگی زانایانی شیعەیە ئەوەیە کە رێبوار فەرزە لەسەری لەسەفەردا نوێژەکان کورت کاتەوە بەڵام ناوچەی گۆڕی ئیمام حوسەینیان خستەدەرەوە لەو بنەمایەو ناشزانم زاناکانمان چۆن توانیان ئیجتیهاد لەمەسەلەیەکدا بکەن کە بە هیچ شێوەیەك شوێنەواری نەبووە لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)و دوای ئەوەی شەریعەت کۆتایی پێهێنراو پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کردو نیگا پچڕا، جا ئایا پێغەمبەر (ﷺ) رێگای دا بە رێبوار هەڵبژێری لەنێوان کورتکردنەوەو

تەواوکردنی نوێژ لەدەوروبەری گۆڕی حوسەیندا پێش ئەوەی شتێك هەبێت بەم ناوە یان یاسایەکی خوایی دانرا بۆ شتێك کە هێشتا هیچ شوێنەوارێکی لەسەردەمی پێغەمبەردا نەبووە.!

بەڵێ هەندێك ریوایەت دەدرێتە پاڵ ئیمامەکانی شیعە دەڵێت رێبوار سەرپشکە لەنێوان کورت کردنەوەو تەواوکردنی نوێژداو لەسەر ئەو ریوایەتانە زاناکانمان ئەو فەتوایەیان داوە.

ئەمەش لەوانەیە ئەوە بگەیەنێت کە ئیمام بەلای زاناکانمانەوە سەرچاوەیەکە بۆ تەشریع دانان ئەمەش جیاوازە لەوەی لایەنگرانی ئەهلی بەیت پێش سەرهەڵدانی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوع باوەڕیان پێی هەبوو ئەویش ئەوەیە کە ئیمامەکانی ئەهلی بەیت لەخەڵکی تر شارەزاترن بە ئەحکامەکانی ئیسلام چونکە قورئان لەماڵیاندا هاتووەتە خوارەوە وەکو ئاماژەمان پێداوە زیاتر لەجارێك، وە ئەوەی بەڕاستی جێی داخە ئەوەیە کە ئەم بیرۆکەیە (واتە ئیمام سەرچاوەی تەشریعە) بەدڵی زۆرێك لەزاناکانماندا دێت ئەگینا سەرپشك بوونی رێبوار لەتەواوکردنی یان کورت کردنەوەی نوێژدا لەچوارچێوەی حەوشەی مەرقەدی ئیمام حوسەیندا چ دەگەیەنێت؟ وە لەسەر چ بنەمایەکی شەرعی ناوحەوشەی مەرقەدی حوسەین ئەم تایبەتمەندێتییەی وەرگرت‌و حوکمێکی خوایی ئاسمانی پێش بەدیهاتنی ئەم حەوشە بەنیو سەدە دابەزیبێت؟

جارێکی تر دووپاتی دەکەینەوە کە تاقە رێگای رزگاربوون لەم دواکەوتنە فکرییە قوڵەی کە چەندین سەدەیە تێیداین‌و لەهەموو لایەکەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆ دەورەی داوین بێژانەوەی کتێبەکانمانە لەم جۆرە ریوایەتانەی دراونەتە پاڵ ئیمامگەلێکی رێنیشاندەر کە ئەوان لێی بێبەرین، و هەروەها

بەخۆداچوونەوەی زاناکانمان خۆیان چونکە زۆربەیان لە پشتی سەرهەڵدانی ئەم بیدعەتانەو گەشەپێدانیانن چونکە ئیمامەکان لەلایەن خۆیانەوە هیچ یاساو حوکمێکیان نەهێناوە بەڵکو هەیەو نییە ئەوان لە خەڵکی تر شارەزاتر بوون[1] بەکتێبی خواو سوونەتی باپیرەیان (ﷺ) وە زانستیان لە ماڵی پەیامبەرو جێی دابەزینی نیگاوە وەرگرتووە، حوکمە شەرعییەکانیان نەوە بەنەوە بچوك لە گەورەی وەرگرتووە.

## ڕاستکردنەوە:

ئەگەر شیعە پابەند بن بەو بنەما شەرعییەی کە ڕایانگەیاندووە لەوەی کە سوجدە بردن دەبێت لەسەر خۆڵو پێکهاتەکانی بێتو زاناکانمان پابەندبن بەم فەتوایەوە ئەو کاتە کێشەکە زۆر گەورە نەدەبوو وە تاقمە ئیسلامییەکانی تر بەچاوی ڕێزەوە دەیانڕوانییە ئەم بۆچوونەو پەسەندیان دەکرد، بەڵام شیعە هەروەکو کاری هەمیشەیی زاناکانمان سنووری ئەم بنەما شەرعییەیان

---

[1] ئەمە جگە لە قسەی بێ بەڵگە هیچی تر نییە وە هیچ کام لەوان لەوانەی سەردەمی خۆیان شارەزاتر نەبوون بە کتێبی خواو فەرمودەکانی پێغەمبەر، بەڵگەشمان ئەوەیە کە هەرچی زانستی ئاینی هەیە هەمووی لەداهێنانی ئەهلی سوننەیەو لەهیچ زانستێکدا شیعە پێشڕەو نەبوونە، ئەگەر دەشتەوێت ڕاستی ئەم قسەیە بزانیت برۆ مێژووی سەرهەڵدانی هەموو زانستە شەرعییەکانو دامەزرێنەرەکانی بخوێنەرەوە بزانە هەموی لەداهێنانی ئەهلی سوننە نییە، بۆ نمونە زانستی (علوم القرآن)، (علوم الحديث)، (علم الرجال)، (أصول الفقه)، (علوم التجويد)، عیرفانو تەصەوفو ....واقعی ژیانیش ئەوە دەسەلمێنێت کە زانست دەدرێ بەو کەسەی هەوڵی بۆ دەدا ئیتر با لە خێزانێکی تەخوێندەواریش بێت و ئەوەیشی هەوڵی بۆ نەداو خۆی لە پێناویدا ماندوو نەکات با باوکیشی عەللامەی زەمانیش بێت یان ماڵیان پڕبێت لە کتێب هیچ فێر نابێت.(وەرگێڕ)

تێپەڕاندووەو سوجدەبردنی لەسەر خۆڵیان قۆرخ کردووە بەسەر شوێنێکی تایبەتدا کە کەربلایەو لە گڵەکەی شێوەی جۆراو جۆریان دروست کردووە، لاکێشەو چوارگۆشەو بازنەیی کە لەسەفەرو لەشاردا لەگەڵ خۆیاندا هەڵیدەگرنو لەکاتی نوێژدا بەکاری دەهێنن، وە شیعە وا ڕاهاتوون کە ئەو بەردە بشارنەوە لەمزگەوتەکانی مسوڵمانانی تردا بە تەقییە یان لەترسی ڕوودانی ئاژاوە وە یا لەشەرمی ئەو زۆرینەیەی کە بەچاوی سەرسوڕمانو گاڵتەوە تەماشای دەکەن.

بەڕاستی جێی داخو خەفەتە کە دەبینی شیعە خۆی دابەزاندووەتە ئەم ئاستە نزمە لەبەر پابەندبوونی بە شتێکەوە کە خوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر دانەبەزاندووە، وە هیچ شتێك لەوە زیاتر جێی خەشمو قینی خوا نییە کە خەڵکی بەو دووفاقییە بپەرستن.

ئەگەر شیعە خۆیان بەڕاست دەزانن لەسوجدەبردن لە سەر خۆڵی کەربەلا بۆچی دەترسن لە ئاشکراکردنی لەبەردەم ئەو مسوڵمانانەی کە یەك خواو یەك پێغەمبەرو یەك ڕووگەو یەك نوێژ کۆیان دەکاتەوە؟ وە ئەگەر لەسەر ڕاستی نین بۆچی ئەم سووربوونە لەسەر شتێك کە دەترسنو شەرم لە ئاشکراکردنی دەکەن؟

وەکو وتمان ڕۆڵی گەورە لە سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ زاناو پێشەوایانی مەزهەب، ئەوانەی کە شیعەی لەسەری ڕاهێناو تاکو ئێستاش بەردەوامن لەسەری، وە ئەم بزووتنەوە ڕاستکارییەی بانگەشەی بۆ دەکەین نایەوێت هانی شیعە بدەن سوجدە لەسەر خۆڵ نەبەن، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "زەوی بۆ من کراوە بە مزگەوتو پاك کراوەتەوە"

وە پێغەمبەر (ﷺ) سوجدەی لەسەر خۆڵ دەبرد لەمزگەوتەکەیدا لەمەدینە، بەڵام ئێمە دەمانەوێت بڵێین پەسەند کردنی شوێنێك بەسەر

شوێنێکی تردا ئەگەر لەشەرعدا هاتبوو ئەوە ناگەیەنێت کە پابەندبن بە سوجدە بردن لەسەر خاکی ئەو شوێنە چونکە ئەگەر وا بوایە مسوڵمانان خاکی مەککەو مەدینەو قودسیان لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرت بۆ ئەوەی سوجدەی لەسەر ببەن.

پێویستە لەسەر شیعە کۆتی پاشکۆیەتی فکری بشکێنێت لە شتگەلێکدا کە فەرزکراوە لەسەریان‌و بەدڵنیاییەوە دەزانن ناڕەواو هەڵەیەو بچنە ناوڕیزی ئیسلامی پان‌و بەرینەوە بەسەربەرزی‌و بەبەڵگەی بەهێزەوە نەك بەزەلیلیی‌و بە تەقییەو دووفاقی لەکەسێتیداو چاو نوقاندن لە ئاستی کەرامەتدا لە پێناوی بیتعەتگەلێك کە خۆیان لەخەڵکی تر باشتر دەزانن بیدەعەن.

جارێکی تر دەگەڕێمەوەو دەڵێم: ئێمە داوا لە شیعە ناکەین لەوە زیاتر بکات کە مسوڵمانان لەسەری کۆکن بە زانایانی شیعەشەوە لەڕاستی سوجدەبردن لەسەر خاك‌و پێکهاتەکانی وەکو دارو بەردو خەیزەران، باسوجدە لەسەر ئەو شتانە ببەن کە سوجدە لەسەر بردنیان دروستەو پەیڕەوی لە پێغەمبەرو ئیمامی عەلی‌و ئیمامەکانی تر بکەن کە هەرگیز سوجدەیان لەسەر شتێك نەبردووە کە پێی دەڵێن خۆڵی کەربەلاو دەست بەرداری ئەم کارە بن کە بیدعەیەو مایەی دووبەرەکییە، وە من گومانم نییە لەوەی کە مسوڵمانانی تر ئەگەر بەم تیۆرییە فقهیە بزانن کە لە ئیجتیهادەوە سەرچاوەی گرتووەو مزگەوتەکانیان بەجۆرێك دروست دەکەن کە لەگەڵ ئەم تێڕوانینەی شیعەدا بگونجێت‌و لەوانەشە بەشتێك ڕایبخەن کە لەپێکهاتەی زەوی‌و دار بێت وەکو حەسیر بۆ ئەوەی ئاسانکاری بۆ برا دینییەکانیان بکەن.

# ئیرهاب (تۆقاندن)

شیعە تاقە تایەفەی ئیسلامییە کە بەبێ قەیدو شەرت خۆیانیان داوەتە دەستسەرکردە مەزهەبییەکانیان بۆ ئەوەی جارێك بیانهاونە گۆڕەپانی مەرگەوەو جارێکیش بۆ گۆڕەپانی ئیرهابو فێلو خیانەت.

ئیرهاب

سەرکردە مەزهەبییەکانی شیعە بەدرێژایی مێژوو شیعەیان بەکارهێناوەو تایەفەیەکیان لێ پێکهێناون کە ڕەشەبای بیدەعەت بەملاو بەولایاندا ببات بەسود وەرگرتن لە سادەیی و باوەڕی تەواویان بە مەرجیعە ئاینییەکانیان، وە تا ئەم ساتەوەختە شیعە تاقە تایەفەن لەناو مسولمانانندا کە بەبێ هیچ مەرج و سنورێك و سێو جیمێك خۆیان داوەتە دەستی سەرکردە مەزهەبییەکانیان ئەوانیش بە شەق جارێك دەیانهاوێژنە گۆڕەپانی مەرگەوەو جارێکی تریش بۆ گۆڕەپانی ئیرهابو فێلو خیانەت، لەبەرئەوەیە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەم ساڵانەی دواییدا وا دەڕواننە مەزهەبی شیعە کە مەزهەبێکە هانی شوێن کەوتوانی دەدات بۆ شەڕو تیرۆرو تۆقاندن وە زۆرجار ئەو هەواڵانەی دەربارەی شیعە بڵاو دەکرانەوە لە ڕۆژنامەو دەزگاکانی ڕاگەیاندندا زیانەکەی بە شیعەوە نەدەوەستا بەڵکو دەلکێنرا بە ئیسلامەوەو زیانێکی گەورەی لە ناوی ئیسلام دەدا لەبەرئەوەی کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی جیاوازی ناکەن لەنێوان شیعەو مسولمانانی تردا و لە ئەنجامدا ئەو ئیرهابەی شیعە پراکتزەی دەکرد لەسەر ئیسلامو هەموو مسولمانان ئەژمار دەکرا.

مێژووی تیرۆرو لە پشتەوە خەڵکی کوشتن دەگەڕێتەوە بۆ چەندین سەدە لەمەوبەرو شتێکی نوێ نییە لەمێژووی هاوچەرخماندا، بەڵام سەرهەڵدانی لە وڵاتانی شیعەو بەناوی شیعەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەد ساڵ لەمەوبەر یان

کەمێك کەمتر، بەڵام ئەوەی جێی داخ‌و خەفەتە ئەوەیە کە لە پشتەوە کوشتنی خەڵکی لەو ڕۆژەی پەیدا بووە لەناو شیعەداو ئەو ئیرهابەی کە لەم ساڵانەی دواییدا دەدرێتە پاڵ شیعە هەمووی بەناوی مەزهەبەوە دەکراو زاناو موجتەهیدی گەورەیان لەپشتەوە بوو، میرزا ڕەزا کرمانی ناسر شای قاجاری لە ساڵی ١٣١١ك، بەفەرمانی مامۆستاکەی سەید جەمالەددینی ئەفغانی کوشت، وە لەو مێژووەوە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ ئێران بەشێوەیەکی تایبەت چەندین حاڵەتی کوشتنی مەزهەبی‌و ئیرهابی بێ وێنەی بینیوەوە بەپێی بارودۆخی سیاسی و هەموو ئەوانە زاناو موجتەهیدیان لە پشتەوە بوو[١]

بەڵام شایەنی پەند وەرگرتنە کە دادپەروەری خوایی لەم دونیایەدا بەرجەستە بوو بۆ ئەوەی پەندێك دابدات بەوانەی کە تۆوی ئەم بیرۆکەیەیان چاند لە دڵەکاندا بناوی ئاینەوە، ئەوەتا تیرۆر هەڵگەڕایەوە بە شوم‌و بەڵا

---

نمونە زۆرن لەوانە کوشتنی کاك ئەحمەدی موفتی زادە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆو کوشتنی زانای پایەبەرز ناسری سوبحانی‌و پاشان تیرۆکردنی کاك فاروقی جێگری کاك ئەحمەد لە ئەردەبیل لەمانگی ڕەمەزانداو لەکاتێکدا کە چووبوو بەربانگ بێنێتەوە بۆ ماڵەوە لە خواری باڵەخانەکەدا بە پەت خنکاندبوویان، تیرۆرکردنی مامۆستا مەلامحەممەدی ڕەبیعی‌و تیرۆرکردنی عەبدوڕەحمان قاسملۆو سەعید شەرەفکەندی و زانایانی ناوچەی بەلوجستان وپێشتریش ئەحمەد کیسرەوی‌و کوشتنی شێخ صبحی الصالح‌و شێخ حسن خالد لە لوبنان‌و إحسان ئیلاهی زاهیر لە پاکستان‌و دەیان کەسایەتی تری سوننە کە هەموویان بەغەدرو خیانەت کوژران. هەر ئەوەشە وایکردووە کە خەڵکی نەوێرن بەئاشکرا لەسەر شیعە شت بنووسن؛ وە ئەو چالاکییە شیعییەی ئێستا لەناو کوردستاندا هەیەو بانگخوازانیان بە ئاشکرا وبە ڕۆژی نیوەڕۆ ئیش ئەکەن ئەگەر سوننی بوونایەو لەناوچەی ئەواندا ئەو شتەیان بکردایە ئێستا هەموویان یەك بە یەك دەستنیشان کرابوون و کوژرابوون. وەئەگەر ئێستا لە ناو هەندێك لە تاقمە سوننییەکاندا ئەو شتە بەدی دەکرێت ئەوە یا کاریگەری شیعەیان لەسەرە یا خەواریج.(وەرگێڕ)

بەسەریانداو دوژمنانی زانایان هەمان ڕێگەیان گرتەبەر لەڕوویەڕووبوونەوە لەگەڵیانداو لەماوەی شەش ساڵدا ١٤٠٠-١٤٠٦ك، ژمارەیەکی زۆر لەزانایانی مەزهەب کوژران، زۆر زیاتر لەوەی بەغدەدرو تا پیاوی بە فەتوای ئایینی کوژران لەماوی سەد ساڵی ڕابردوودا.

بەو شێوەیە تیرۆرو تۆقاندن بوو بە شوم و بەلاو هەڵگەڕایەوە بەسەر ئەوانەی لە پشتەوەی بوون و ژیانیانی کردە دۆزەخێك هەموار ئەکرێت، ئەم هەمووە دوای ئەوەی کە مەلایانی مەزهەب دەسەڵاتیان گرتە دەست لە ئێراندا، ئەوانەی کە دەستخۆشییان لە ئیرهاب دەکردو بووبوونە کۆڵەکە بۆی.

بۆ ئەوەی خاڵ لەسەر پیت دابنێم بەڕاشکاوی دەڵێم کاتێك پولەکانی پۆستەی تازەم بینی کە جمهوری ئیسلامی دەریکردوون و وێنەی تیرۆریستانی وەکو میرزای کرمانی و موجتەبا نەواب سەفەوی سەرۆکی کۆمەڵی فیدائیانی ئیسلامی لەسەربوو کە ژمارەیەك لەسەرەك وەزیران و خەڵکی تریان بە فەتوای یەکێك لە موجتەهیدەکان تیرۆرکرد شیوەنم بۆ بەختی شیعەی ئیمامی و ئەو دەوڵەتی خۆی وا پیشان دەدات شیعە مەزهەبەو خۆی بە پارێزەری دەزانێت کرد.

لێرەدا دەمەوێت بە ڕاشکاوی و بێ ترس ڕایگەیەنم کە ئەم کتێبە کتێبێکی سیاسی نییەو مەبەست لێی ڕووبەڕووبوونەوە نییە لەگەڵ هیچ دەوڵەتێك یان لایەنێکی سیاسیدا یان ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ جمهوری ئیسلامی یان ڕژێمی دەسەڵاتدار تێیدا.

بۆیە دەڵێم وخواش بەشایەت دەگرم کەمەبەستم لەو پەیامە جگە لە چاکسازی و ریفۆرم لە بیروباوەڕی شیعەی کۆن و نوێدا هیچی تر نییە هەرلەبەر ئەوەش خۆم بەدوور گرت لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ناوهێنانی کەسەکاندا

بەڵام ناچاری لەهەندێك كاتدا پاڵم پێوەدەنێت قسەی ڕاستی‌و ڕەواو ئامۆژگاری ئاراستەی تەنانەت دەوڵەت یان ڕژێمێ بكەم بەهیوای ئەوەی بەدەم بانگەوازی چاكسازییەوە بێن، وە لەوانەشە نەیەن، بەڵام قسەی ڕاست‌و ڕەوا ئاراستەی هەموان بكرێت وەكو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "ئەوەی لە ئاستی ڕاستی بێدەنگ بێت شەیتانێكی لاڵە"

ئاخۆ وڵاتێك چۆن دەتوانێت ڕێزی نێودەوڵەتی‌و متمانەی جیهانی بەدەست بێنێت‌و میللەتان ڕێزی لێبگرن‌و خۆی وانیشان دەدات كە دەوڵەتێكی ئایدۆلۆژییەو مەزهەبی شیعەی كردووەتە دروشمی خۆی كەچی شانازی بە تیرۆریستانەوە دەكات‌و وێنەكانیان دەكاتە هێما بۆ ڕژێمەكەی؟

لەوانەشە كاریگەری ئەم دروشمە زۆر سەخت بێت لەسەر ملیۆنەها شیعە لە جیهاندا كە پەیوەندییەكیان نییە بەو دەوڵەتەوەو باوەڕیان بەڕژێم‌و سیاسەتەكەی نییە، وە شیعە چۆن دەتوانن بەرگری لەبیروباوەڕكەیان بكەن‌و تۆمەتی تیرۆر لەخۆیان دووربخەنەوە كاتێك كە ئەو دەوڵەتەی بەناویانەوە قسە دەكات تیرۆری كردبێتە دروشمێك بۆ خۆی؟

ئومێدەواریشم فەرمانڕەوایانی ئێران گوێیان لە قسەكانم بێت‌و باش بزانن كە شیعەكانی ئێران تەنها یەك لەسەر سێی شیعەكانی جیهان پێك دێنن‌و ئەو دوو سێیەی تر لە شوێنەكانی تری دونیادا بڵاوبوونەتەوەو هەر كۆمەڵەو ئاسنامەو زمانی خۆی هەیەو دەوڵەتی شیعەی ئێران نەیتوانیوەو ناتوانێت بە زمانی هەموو شیعەكانەوە قسە بكات، بەڵكو تەنانەت ناتوانێت بەناوی شیعەكانی ئێرانیشەوە قسە بكات، بۆیە پێویستە لەسەری شتانێك نەكات ناوبانگی زۆرینەی پێ بزڕێنێت وەكو ئەوەی تاكو ئێستا كردوویەتی‌و بەوە زیاتر ناشیرینیان نەكات.

وه بانگەوازم بۆ فەرمانڕەوایانی ئێران ئەوەیە کە لەوەزیاتر شیعە ناشیرین نەکەن، ئیتر شیعە بەسیتی سوکێتیو کەساسی.

ئومێدم وایە شیعە بکەونە بەرگری کردن لەخۆیانو لەڕێزو ئابڕوی خۆیان لەبەردەم کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیداو بێبەریێتی خۆیان ڕاگەیەنن .لەو تیرۆرەی بەناویانەوە پیادە دەکرێت دژی بێتاوانان.

جاروبار قسە لەگەڵ خۆمدا دەکەمو دەڵێم ئایا ئەو بیرۆکە تیرۆریستییەی سەد ساڵ لەمەوبەر لە ئێراندا سەری هەڵداو هەندێك لەزاناکانمان پیرۆزییان لێدەکرد لە پاشماوەی قەڵای ئەلموت نییە کە حەسەن صەبباح لەسەدەی شەشەمی کۆچیدا کردبوویە بنکەیەك بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی ئیسماعیلی جارێك بەهێزو جارێك بەتلیاكو ماددە بێهۆشکەرەکانی تر؟ وە درێژەدان نییە بەو تیپە تیرۆریستانەی بەوڵاتانی ئیسلامیدا دەگەڕان بۆ تیرۆرکردنی دوژمنەکانی مەزهەبی ئیسماعیلییە؟ هەمووشمان دەزانین کە وەزیر نظام الملك بەدەستی یەکێك لەو تیرۆریستانە کوژراو بە فەرمانی ڕاستەوخۆی سەرۆکەکەیان حسن الصباح، وە لێکچوونێکی گەورە هەیە لەنێوان ئەو پێشەکیو دەرەنجامانەی تیپە تیرۆریستییە صەبباحییەکانو تیپە تیرۆریستە توندڕەوەکانی ناو هەندێك لە شیعەکان.

لێرەدا جارێکی تر ڕوو دەکەمەوە شیعەو پێیان دەڵێم:

ئەگەر ئەم شێتییە صەبباحییەو ئەو کردەوانەی کۆمەڵە تلیاکییەکەی پێی هەستان لەسەدەی شەشەمی کۆچی لە جیهانی ئیسلامیدا ئاشوبو گێرەشێوێنییەکی نابووەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سوودوەرگرتن لە ناشارەزایی خەڵکانی سادە لە ئیسلامو بنەماکانی، لەم سەردەمی بازدانە گەورانەی زانستو ئاشکرابوونی چەمکە ئیسلامییە بەرزەکان بۆ هەمووان بەڵگە

لەسەر شیعە دروست بووە کە ڕێگای ڕاستیو ژێری بگرنە بەرو پابەندی فەرمانگەلێك نەبن کە مایەی نارەزایی خواو پێغەمبەرە (ﷺ).

ئەگەر تیرۆر شتێکی باشە بۆچی ئەوانەی نەخشەی بۆ دەکێشن خۆیانو کەسوکاریان پێی هەڵناسن؟ وە کاتێکیش ئاشکرا دەبێت بێبەرێتی خۆیانی لێ دەردەبڕن.

ئیسلامیش بێبەرییە لە تیرۆرو ڕێنماییەکانی ئیسلام دژیەتی، جا ئەگەر تیرۆریستەکانو ئەوانەی لە پشتیانەوەن مەبەستی سیاسییان هەیە و دەیانەوێت بە ئەنجامی بگەیەنن پێویستە لەسەریان ناوی ئاینو مەزهەب بەکارنەهێننو ئەوەندەی ئازایەتیان هەبێت کە خۆیان درەنجامی کردەوەکانیان بگرنە ئەستۆ ونەیخەنە سەر ئاینو مەزهەب.

## ڕاستکردنەوە:

قورئانی پیرۆز دەستووری هەمیشەیی خۆی لەقەدەغەکردنی تیرۆر بەهەموو شێوەکانیەوە داناوە بەتایبەت کاتێك کە بێتاوان بە گوناهی تاوانبار دەگیرێتو فەرمویەتی: "هیچ گوناهبارێك گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێت" الزمر/٧.

ئەم ڕستە بەپێزە ڕووناکییەكو تیشکێك دەدات بەهەرکەسێك کە قورئان بکاتە پێشەواو ڕێ نیشاندەری خۆی، وە ئەگەر تەماشای ژیانی ئیمامەکانی شیعەو کردەوەکانیان بکەین دەبینین ئەوان دوورترین کەس بوون لە تیرۆرو لەهەموو کەس زیاتر قینیان لێی دەبووەوە، ئەوەتا ئیمامی حوسێن ڕوو دەکاتە ئەو کۆمەڵە چەکدارەی هێرشیان کردەسەر چادری خێزانەکانیان لەڕۆژی عاشووورداو قسەیەکیان پێ دەڵێت مێژوو لەبیری ناکات: "ئەی

شوێنکەوتوانی ئەبوسوفیان، ئەگەر ئێوە دینتان نییەو لەڕۆژی دوایی ناترسن لە ئازادەکانی دونیا بن، ئافرەتان هیچیان لەسەر نییە"

بەو شێوەیە ئیمام حوسەین کە سەروەری شەهیدەکانەو شیعە ناوبانگیان بەوە دەرکردووە کە لەڕادەبەردەر خۆشیان دەوێت هێڵی جیاکەرەوەی نێوان جوامێریو ترسنۆکیو ڕێزی مرۆڤایەتی کە ڕازی بوونی خوای تێدایەو کردەوەی خراپ کە مایەی تووڕەیی خوایە دەکێشێتو بەم دەستەواژە ڕەوانو کاریگەرانە فەرمان دەدات بە مسوڵمانان ئیتر چ هەوادارانی خۆی بن یان خەڵکانی تر کە ڕێگەی جوامێریو پیاوەتی بگرنەبەر تەنانەت لەمامەڵە کردن لەگەڵ دوژمنو دیلی شەڕداو دەستدرێژی نەکەنە سەر ژنو منداڵ ئەگەر چی لەحاڵەتی شەڕیشدا بن لەگەڵ پیاوەکانیاندا.

ئەوە موسلیمی کوڕی عەقیلی نوێنەری حوسەین بۆ خەڵکی کوفە ڕازی نابێت بە فێڵ عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد تیرۆر بکات دوای ئەوەی کە هانی کوڕی عوروە هەلەکەی بۆ ڕەخساند ئەوە بوو وتی: "ئێمە خانەوادەیەکین غەدر[1] ناکەین".

دوای ئەوەی خەڵکی کوفە پەیمان (بەیعەت)یان دا بە موسلیمی کوڕی عەقیل وەکو نوێنەری حوسەین، بەڵام پشتیان تێکردو چوونە پاڵ والی تازە(کە عوبەیدوڵڵا بوو)و موسلیم هیچ ڕێگەیەکی لەبەردەمدا نەما ئەوە نەبێت یان بجەنگێ لەگەڵ عوبەیدوڵڵا تا دەگوژرێت وە یان ئەوەیە بە پلان ئیبن زیاد بکوژێتو سەر لەنوێ دەسەڵات بگرێتەوە دەست، بەڵام قایل نەبوو بەوەی ڕەفتارێك بکات لەگەڵ جوامێریو پیاوەتیدا ناگونجێت ئەگەر لەسەر حیسابی کوژرانو سەرنەگرتنی ئەو کارە بێت کە پێی سپێردراوە.

---

[1] غدر: فێڵو خیانەت.

بەو شێوەیە دەبینین کە دەرەنجامەکان هەرچەند گرنگ‌و بایەخداربن نابن بە پاساو بۆ سەرەتاو پێشەکییە نزم‌و سووکەکان وەکو خیانەت‌و فێڵ‌و پاشقولدان لە دەستووری نەمری ئیسلامداو لە نەریتی ئەهلی بەیتی پێغەمبەر (ﷺ).

با جارێکی تر شایەتی بەکردەوەی ئیمامی عەلی بێنینەوە کە شیعە دەڵێن پەیڕەوی لێدەکەین‌و هەندێك لەزاناکانمان بەتایبەت ئەوانەی کە خۆیان بەلایەنگری تیرۆر دەزانن باوەڕیان وایە کە کردەوەی ئیمامی عەلی بەڵگەیە لەسەریان وە پێیان دەڵێن کە ئیمام قەدەغەی کرد لەسەر شوێنکەوتوانی هەڵسن بە کردەوەیەك کە لەگەڵ جوامێری‌و ڕێزی مرۆڤایەتیدا ناگونجێت‌و تەنانەت فەرمانیدا بەلابردنی ئەو بەربەستانەی لەشکرەکەی لەسەر ڕوباری فورات دایناوبوو لەشەڕی سەفیندا بۆ ڕێگرتن لە لەشکری معاویە لە بەدەستهێنانی ئاوو ڕێگری کرد لە لەشکرەکەی هەرکارێك بکەن کە ناکۆکە لەگەڵ ڕێوڕەسمی پەیڕەوکراو لەشەڕی نێوان پیاواندا، وە کاتێك شۆڕشگێڕان[1] خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفانیان کوشت‌و ئیمام بەوەی زانی کێشای بەڕوومەتی حەسەن‌و حوسەیندا لەبەرئەوەی ڕێیان لەو شۆڕشگێڕانە نەگرت لە نزیك بوونەوە لە خەلیفەی کوژراو، وە وەکو دەزانن حەسەن‌و حوسەین پلەوپایەیەکی مەزنیان هەبوو لای ئیمامی عەلی لەیەکێك لەشەڕەکاندا دەریبڕی کاتێك لەڕیزی پێشەوەی شەڕەکە بوون‌و فەرمووی: "ئەو دوو کوڕەم بۆ دوورخەنەوە (لەبەرەی جەنگ)، نەوەکو بکوژرێن‌و نەوەی پێغەمبەر بەمردنیان دوایی پێ بێت"

---

[1] نووسەر نووسیویەتی "الثائرون" واتە شۆڕشگێڕان ئەگینا لەڕاستیدا ئەوانە یاخی بووان و ئاژاوەگێڕانن نەك شۆڕشگێڕ. (وەرگێڕ)

وە کاتێك بەوردی دەڕوانینە سەردەمی پێغەمبەری بەڕێز (ﷺ) بەدڵنیاییەوە بۆمان دەردەکەوێت کە تیرۆر لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) شتێکی باو نەبوو لەناویانداو کاتێك ئەبو لوئلوئە هەڕەشەی لە خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب کرد بەم وتەیە: "ئاشێکت بۆ دروست دەکەم هەموو عەرەب باسی بکەن".

خەلیفە وتی: "ئەو ئاگر پەرستە هەڕەشەی لێکردم"

لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێکی بەرامبەر نەکردو هیچ فەرمانێکی نەدا بە گرتنی یا دوورخستنەوەی.

لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین بیرۆکەی تیرۆرکردن بەدڵی مسوڵمانان‌دا نەدەهات لەسەردەمی پێغەمبەرو خەلیفە ڕاشیدەکانداو شتێکی زانراو نەبوو لەناویاندا، بۆیە مسوڵمانان بە جددیو توندی نەیانگرتبوو، وە دوای تیرۆرکردنی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب بەدەست ئەبو لوئلوئەوە هەردوو خەلیفەی دوای ئەو عوسمانو عەلی هیچ خۆپارێزییەکیان نەکردو کوشتنی خەلیفە عوسمان جۆرێك بوو لە تیرۆرو کوشتنی عەلی لەسەردەستی خارجییەك بوو بەناوی عەبدوڕەحمانی کوڕی مولجەم لەکاتی نوێژی بەیانیدا، وە زیاد لەیەك جاریش پێی وترا کە ئاگای لەخۆی بێت بەڵام بەم قسەیە ڕەتی دەکردنەوە: "مردن خۆی پاسەوانی مرۆڤە"[1]

لەبەرئەوە دەتوانین دوای ئەم هەمووە بڵێین کە ژینگەی ئیسلامی ساغ ودروست شتێکی تێدانەبوو بەناوی تیرۆرو کوشتنی لەغەفڵەت بۆیە خۆپاراستنی دانەهێنا لێیو وەکو ڕەفتارێکی جینایەتکارانەی کاتی

---

[1] واتە مردن خۆی پاسەوانی مرۆڤەو گەر بێت بەکەس ناگەڕێتەوە. (وەرگێڕ)

تەماشایان دەکرد کە ئیسلام لێی بێبەرییەو مسوڵمانان قینیان لێیدەبێتەوەو ئەوانە کردەوەگەلێکن ئەوانەی لەوێنەی ئەبو لوئلوئەی مەجوسیو ئیبن مولجەمی خارجین پێی هەڵدەستنو وێنەیان کەمە.

جارێکی تر دەگەڕێمەوە بۆ تیرۆرو دەڵێم: کردەوە تیرۆرییەکان کەسانێکی لەپشتە نەخشەی بۆ دەکێشن کە شارەزان بە نائارامی دەروونی ئەو کەسانەی پێی هەڵدەستنو ئەو جۆرە کەسانە بەکاردەهێننو تەماداری حۆری جوانو شەرابی خۆشیان دەکەن لەگەڵ پێدانی وانە لەسەر ئازایەتیو پاڵەوانێتیو ناو تۆماربوون لەمێژوودا و تۆڵەسەندنەوەو..هتد، بەو شێوەیە نێچیرەکانیان بۆ ئەنجامدانی کاری تیرۆریستی پاڵ پێوەدەنێنو خۆیان لەدوورەوەی گۆڕەپانی ململانێوە دادەنیشن بۆ ئەوەی ئەو بەرهەمانەی دەیانەوێت بەدەست بێنن، خۆیان لە کۆشکە ئارامو پەرژینکراوەکاندا دادەنیشنو شوێنکەوتوانیان دەنێرن بۆ گۆڕەپانەکانی خۆکوژی بۆ وێرانکاری بەسەر بێتاوانەکانو سامانەکانیان بەناوی خواو پێغەمبەرو ئیمام عەلییەوە.

## چەند سەرنجێك

لەوانەیە خوێنەر بڵێت تیرۆر تایبەت نییە بە تایەفەی شیعەوە سوننەکانیش پێی هەڵدەستنو شوێنکەوتووی ئاینو ڕێبازەکانی تریش پێی هەڵدەستنو دەزگاکانی موخابەراتی وڵاتانیش ئەنجامی دەدەن.

لەوەڵامدا دەڵێین ئەم قسەیە ڕاستە، بەڵام هیچ تایەفەیەك وەکو شیعە پەنای نەبردووەتە بەر ئەم کارە بۆ خەفە کردنی نەیارەکان، نەك نەیاری سیاسی بەڵکو نەیاری فکریو مەزهەبیش، وە ئەو تاقمە سوننانەی کە ئێستا پەنادەبەنە بەر تیرۆرو خۆکوژی زۆربەیان دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی سەریانهەڵداوەو کاریگەری ئەوانو بیروباوەڕی خەواریجیان لەسەرە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لایەنە سوننیانە کەمتر هەوڵی کوشتنی نەیارە مەزهەبییەکانیان داوە، بۆ نمونە نابینی هیچ بیرمەندێك یا مژدەدەرێکی شیعە لەهیچ ولاّتێکی ئیسلامیدا لەبەر چالاکیو بیروبۆچوونەکانی کوژرابێت، بۆیە دەبینی هەموویان بەبێ ترس لە هەرکوێیەك بن دژی یارانو خێزانەکانو خەلیفەکانی پێغەمبەر (ﷺ) شت دەڵێنو دەنووسنو کتێب بلاودەکەنەوە بۆ برەودان بە مەزهەبەکەیانو کەس دەستیان بۆ نابات، لەبەرامبەریشدا زۆربەی سوننیەکان دەترسن لەو شوێنانەی دەستی ئیتلاعاتی ئێرانی پێدەگات شت لەسەر شیعە بنووسن یا بلاّویکەنەوە، ئەمما ئەگەر بێتو رەخنەیەك یان هەڵسەنگاندنێك بۆ هەڵوێستێك یان قسەیەکی یەکێك لە ئیمامەکان بکرێت ئەوا دونیا دەڕوخێنن بەسەر یەکداو ئەو کەسە لەبازنەی ئیسلام دەردەکەنو مۆری دوژمنایەتی کردنی ئەهلی بەیتی لێدەدەنو ئیرهابیێکی فکری وای بەسەردا مومارەسە دەکەن وێنەی نەبێت وەکو ئەوەی ئەو ئیمامانە خوابنو هیچ هەڵەیەك یان کەموکوڕییەکیان نەبێت لەکاتێکدا کە ئەوانە مرۆڤی ئاسایی بوون بەلاّم دوای مردنیانو پاش تێپەڕبوونی چەندین سەدە بەرگی پیرۆزییان بەبەردا کراوە.

وەهەر کەسێکیش لەدژی شیعەدا شتێك بنووسێت چ سوننی بێت یان شیعە دەیان تۆمەتی بۆ هەڵدەبەستن و دەیان شتی خراپی دەدەنە پاڵ لە بێڕەوشتی و خیانەت و جاسووسی وتەنانەت شێتی و هتد نموونەش ئەم نووسەرەی کتێبەکەی وەردەگێڕینە سەر کوردی و (احمد الکاتب) ـەکە هەندێ پیاچوونەوەی کردووە لە فکری شیعەدا.(وەرگێڕ)

# نوێژی هەینی

باوەڕی تەواوم هەیە بەوەی کە زاناکانمان لەبەرامبەر دەقی ڕوونو ڕاشکاودا لەبەر یەك هۆ ئیجتیهادیان کردووە ئەویش بۆ دووبەرەکی نانەوە لەناو ڕیزی ئیسلامی گەورەداو ڕێگرتن لە شیعە لەوەی لەگەڵ مسوڵماناتی تردا تێکەڵ بن لەنوێژی ڕۆژی هەینیدا.

نوێژی هەینی

"ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر بانگ درا بۆ نوێژی هەینی بەپەلە بچن بۆ یادی خواو مامەڵەی کڕینو فرۆشتن بەجێ بێڵن، ئەوە چاکترە بۆ ئێوە ئەگەر بیزانن" الحج/٩.

بەم دەقە ڕاشکاوە یەکلاکەرەوەیە ئیسلام نوێژی هەینی بڕیارداوەو فەرزی کردووە بەسەر هەموو ئەو کەسانەی باوەڕیان بەخواو پێغەمبەرەکەیو کتێبەکەی هەیە، بەڵام زۆرینەی زانایانی شیعە لەبەرامبەر ئەو دەقە ڕوونانەدا ئیجتیهادیان کردووەو وتویانە باوەڕدار سەرپشکە لە نێوان نوێژی نیوەڕۆو نوێژی هەینیدا، وە مەرجێکیشیان زیاد کردووە بۆ سەر دابەستنی نوێژی هەینی ئەویش ئامادەبوونی ئیمامە کە مەبەست لێی ئیمامی مەهدییەو لەسەردەمی دیارنەماندا نوێژی هەینی لەسەر مسوڵمانان دەکەوێتو دەبێتەوە کارێکی ئیختیاری بۆ مسوڵمانان کە ئەو نوێژە بکەن یان نوێژی نیوەڕۆ.

کۆمەڵێکی تر لە زاناکانمان وتویانە نوێژی هەینی لەسەردەمی دیارنەماندا حەرامەو نوێژی نیوەڕۆ جێی دەگرێتەوە، وە بەشێکی کەمیش لە زاناکانمان، لەسەرویانەوە شێخ حوڕڕی عاملی خاوەنی کتێبی (وسائل الشیعە) فەتوای واجب بوونی نوێژی هەینیان داوە لەسەردەمی دیارنەماندا.

نامەوێت بچمە ناو مشتومڕی فقهی بێ سوودەوە کە هەزاران ساڵە یەکلایی نەکراوەتەوە لای زانایانی ئیسلام وە ئەگەر بمانەوێت بەزمانی ئەو ریوایەتانە قسە بکەین کە زانایانی شیعە پشتیان پێدەبەستن کێشەکە چارەسەر ناکرێت.

هەرچییەك وتراوەو دەوترێت لەسەر گەواندنی نوێژی هەینی لەسەردەمی دیارنەماندا ڕووبەڕووی دەقێکی ڕاشکراو دەبێت کە ماوەی ئیجتیهادکردنی تێدا نییە ئەگەر بمانەوێت پابەندبین بە دەستووری ئیسلامەوە، ئێمە لەبەردەم دەستورێکی جێگرو ئاشکراو ڕووندایین کە هیچ قەیدو مەرجێکی تێدا نییە، وە نازانم زاناکانمان چۆن توانییان ئیجتیهاد بکەن لەدەقێکی قورئانی ڕوون‌و ڕەوان بەپشت بەستن بە ڕیوایەتگەلێك کە دراونەتە پاڵ ئیمامەکانی شیعە، وە هەڵوێستی من لەم ریوایەتانە هەمان هەڵوێستە لەهەموو ریوایەتە هەڵبەستراوەکان.

من هیچ کات گومانم نییە لەوەی کە زۆربەی ئەو ریوایەتانە لەسەردەمی یەکەمی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوعدا دانراوە بۆ ئەوەی ڕێگە لە شیعە بگرێت لەئامادەبوون لەنوێژی هەینیدا کە لە ڕاستییەکەیدا خۆپیشاندانێکی ئیسلامیی گەورەیەو تێکەڵی مسوڵمانانی تر نەکەن‌و بەشدارییان نەکەن لەدروشمە گەورەکەی ئیسلامدا.

بەڵگەیەکی ڕوون هەیە لەسەر ئەم بۆچوونەوەم شارابوویەوە لەهەمووئەوانەی لەسەر نوێژی هەینی‌و مێژووەکەی دواون ئەویش ئەوەیە کە پاشاکانی سەفەوی کە پارێزەری تەشەیوع بوون لە ئێرانداو زۆرێك لەو بیدعەتانەی لکێنراون بە تەشەیوعەوە بە سیاسەت‌و پیرۆزبایی لێکردنی ئەوان بوو گەورەترین لایەنگری نوێژی هەینی بوون، وە گەورەترین مزگەوتی

ئێرانی لەسەردەمی سەفەوییەکاندا دروستکراوە، وە مزگەوتی سەرەکی پێی دەوترا مزگەوتی هەینی وە هیچ شارێکی گەورەی ئێران نییە مزگەوتێکی لەو جۆرەی تێدا بێت، وە ئیمامی مزگەوت پێی دەوترا ئیمامی هەینی‌و بەنووسراوێکی تایبەت لەلایەن شاوە دادەمەزرێنرا‌و ئەم پلەیە پلەیەکی بەرێز بوو لەزۆربەی کاتدا دەدرا بەسەر گەورەی زاناکان، ئەم پلەیە هەروا مایەوە تا رژێمی پاشایەتی لەناوبرا لەم چەند ساڵەی پێشوودا، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بیرۆکەی قەدەغەکردنی نوێژی هەینی لەسەردەمی دیارنەماندا تەنها لەو وڵاتانەدا هێنراوەتەوە ئاراوە کە تێکەڵی لەنێوان شیعەو مسوڵمانانی تردا بەهێزبووە بۆ رێگرتن شیعە لە لکان بەکاروانە ئیسلامییە یەکگرتووەوە، بەڵام لە ئێراندا لەبەرئەوەی زۆربەیان شیعە بوون زاناکان بەهەرهەڵستی نوێژی هەینییان نەکردووەو بە پانتایی‌و درێژی وڵاتدا ئەنجام دراوە، لەگەڵ ئەوەی کە بیرۆکەی سەرپشك بوون لەنێوان نوێژی هەینی‌و نوێژی نیوەرۆدا لەرووی فیقهییەوە هەرهەبووە شار هەبووە لە ئێراندا لەهەندێك مزگەوتیدا نوێژی هەینی دەکرا‌و لەهەندێکی تردا نیوەرۆ وە تاکاتی نووسینی ئەم دێڕانە هەندێك لەزانایانی شیعە لەوانەی کە لە ژیاندا ماون فەتوا دەدەن بە قەرزی نوێژی هەینی‌و نەکەوتنی لەسەردەمی دیارنەماندا بەڵام ژمارەی ئەوانە لە پەنجەکانی دەست تێناپەڕێت‌و بەدرێژایی مێژووی فقهی کەمینە بوون.

دوای ئەوەی زاناکان دەسەڵاتیان گرتەدەست لە ئێراندا نوێژی هەینی بوو بەبەشێك لە سیاسەتی دەوڵەت‌و ویلایەتی فەقیه بۆ هەموو شارێك ئیمامێکی دانا پێی دەوترێت (ئیمامی هەینی) وەکو ئەوەی لەوەوبەر شا دەیکردو ناوێکی تازەیان لێنا ئەویش (نوێژی پەرستشی سیاسی)و وتار خوێنەکان لەنوێژی هەینیدا قسە لەرووداوەکانی کات‌و سیاسەت‌و کێشەکانی

ولآت دەکەن، بەلای منەوە گرنگ نییە چی دەوترێت لەوتاری هەینیدا چونکە گرنگ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە ئاینییە ئیتر وتارخوێنەکان چی دەڵێن ئەوە پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە بەڵام ئەوەی کەمەبەستی منە ئەوەیە کە نوێژی هەینی تاکو ئێستاش لە زۆرێك لەو شوێنانەی کە شیعەیان تێدایە لەدەرەوەی ئێران ناکرێت، لێرەوە دەمەوێت داوای ڕاستکردنەوەو لەناوبردنی ئەو دیاردەیە بکەم کە دژە لەگەڵ ڕۆحی ئیسلامو مەبەستەکانیو دەقی قورئانی پیرۆزدا.

## ڕاستکردنەوە:

ئەگەر ئەنجامدانی ئەم فەرزە بەجێبهێڵرێت بۆ ئیمامی مزگەوتەکان لەو شوێنانەی شیعەی تێدایە واتە ئەم ئەرکە ئاینییە بۆ چەند سەدەیەکی تریش هەیە وا بەجی دەهێڵرێت بەبێ ئەنجامدانی چونکە ئیمامی مزگەوتەکان لە زۆربەی کاتدا گوێڕایەڵی فەقیە یان یەکێك لەمەرجیعەکانی شیعەن، وە ناتوانن لە فەتوای مەرجیعەکان لادەن چونکە ئەوان دایاننناون بەتایبەت کە بژێویان بەستراوە بەکارەکەیانو گوێڕایەڵیان لەمەرجیعەکان، لەبەرئەوە پێویستە لەسەر خەڵکی داوا لە ئیمامی مزگەوتەکان بکەن نوێژی هەینییان بۆ بکەنو ئەگەر بە گوێشیان نەکردن پێویستە لەو مزگەوتانەدا نوێژ بکەن کە نوێژی هەینیان تێدا دەکرێت چونکە ئەم ئەرکە بەهیچ بارێك لەسەریان ناکەوێتو پێویستە هەرچۆنێك بووە ئەنجامی بدەن، وە من هەرگیز گومانم نییە کە چینی ڕۆشنبیرو وشیاری شیعە ئەگەردەست بەم دروشمە ئیسلامییە گەورەیەوە بگرن ئەوا زاڵ دەبن بەسەر دیاردەیەکی تر لەدیاردەکانی ئەو دووبەرەکییەی کە خواو پێغەمبەری خوا قەدەغەیان کردووەو بەم شێوەیە سەردەمی یەکبوونی ئیسلامی گەورە نوێ دەکەنەوەو دەبنە پارێزەرانی.

## چەند سەرنجێک:

١ـ حەرامکردنی نوێژی جومعە لەسەردەمی دیارنەمانی گەورەدا بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە شیعە بەئارەزووی خۆیان حوکمە شەرعییەکان دەگۆڕن چونکە ئەو مەرجانەی دایانناوە بۆ بەرپاکردنی نوێژی هەینی لەسەدەکانی پێشوودا نەزانرابوون بەڵکو دوای زیاتر لە سەد ساڵ لە غەیبەی گەورەدا ئینجا سەری هەڵدا، سەرەتا لەشێوەی دانانی مەرجی فەرمانڕەوایی دادپەروەر (إمام عادل) یان کەسێك ئەو دای بنێت، دواتر وتیان فەرمانڕەوای دادپەروەر تەنها ئیمامی مەهدییە کە خوا دایناوە، وە لەبەرئەوەی ئەو دیارنەماوەو لەماوەی ژیانیداو لەماوەی دیارنەمانی بچوکدا کەسی دەستنیشان نەکردووە کەواتە لەکاتی چاوەڕوانیدا (لەدیارنەمانی گەورەو تاکو دەرکەوتنی) نوێژی هەینی نابێت بکرێت.

٢ـ گێڕانەوەی نوێژی هەینیش لەعێراقو شوێنەکانی تردا لەگەڵ بەردەوامی دیارنەمانی مەهدیداو نەبوونی فەرمانڕەوایی دادپەروەر دیسانەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شیعە بەمەیلی خۆیان دەستکاری حوکمە شەرعییەکان دەکەن.

## گۆڕینی قورئان

باوەڕبوون بە ڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئاندا پێچەوانەی باوەڕ پێ بوونیە

نازانم چۆن کەسێك دەتوانێت بڵێت قورئان گۆڕاوە لەکاتێکدا کەڕووبەڕووی دەقێکی ڕوونو ئاشکرا دەبێتەوە کە هەموو قسەیەك هەڵدەوشێنێتەوە دەربارەی گۆڕینی قورئان، وە ناشزانم چۆن کەسێك دەتوانێت بڕواداربێت لەکاتێکدا کە ڕاو بۆچوونێك دەردەبڕێت پێچەوانەی ئەو ئایەتانەیە کە تێیدا هاتووەو ئەم ئایەتەی خوارەوە کە دەفەرموێت: "ئێمە قورئانمان دابەزاندووەو ئێمە خۆشمان دەیپارێزین" الحجر/٩.

بێ نیازمان دەکات لە هێنانەوەی بەڵگە لەسەر نەگۆڕانی قورئانی دابەزێنراو بەسەر موحەممەددا.

ئەم بەڵێنە خواییە ڕوونو ئاشکرایە بەوەی کەخوا ئەم قورئانە دەپارێزێت لەهەر دەستکاریو گۆڕانکاریو زیادەکارییەك وە ئەوانەی دەڵێن گۆڕانکاری تێداکراوە ژمارەیەکن لە زانایانی ئیسلام بەڵام زانایان و فەرموودە ناسانی شیعە زۆرینەی ڕەها پێك دێنن لەناو ئەو زانایانەدا[1]

---

[1] ئەمە ڕاست نییە، جگە لە زانایانی شیعە کەسی تر ناڵێت قورئان دەستکاری کراوە، بەڵام زانایانی شیعە بۆ بەرگری لەخۆیان دێن ئەو قسانەی زانایانی مەزهەبە ئیسلامییەکانی تر کردوویانە دەربارەی ناسخو مەنسوخ (واتە ئەو ئایەتانەی لەلایەن خواوە لابراوەو شتی تر لەجێیدا دانراوە کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا زۆر کەمە) یان مشتومڕی زانایان کە ئایا بسم الله الرحمن الرحيم ئایەتێکە لەهەموو سورەتەکان یان تەنها لەسورەی نەمل، ئەمانەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەو زانایانە باوەڕیان وایە قورئان دەستکاری کرابێت، جیاوازییەکی زۆریش هەیە لەنێوان ئەوەی کە شیعە دەیڵێن کە گوایە قورئان لەلایەن یارانی پێغەمبەرەوە لێی قرتێنراوە بەمەبەستی

وە کۆمەڵێك لە زانایانی شیعە لەگەڵ ئەوەدان کە قورئان دەستکاری نەکراوەو بەڵگە بەو ئایەتەی لەسەرەوە هێناومانەوە دەهێننەوە بەڵام کۆمەڵێکی تر سورن وپێدادەگرن لەسەر ئەوەی کە قورئان گۆڕانکاری تێداکراوە لەوانە نوری تەبرەسی خاوەنی کتێبی (فصل الخطاب في تحريف كتاب رب الارباب) لەم کتێبەدا نووسەر هەندێك دەستەواژەی هێناوەتەوە کە گوایە ئەوانە ئایەتی دەستکاری کراون، هەرکەسێکیش بە ئینسافەوە بەدوویدا بچێت هەرگیز گومانی نابێت لەوەی کە ئەو هۆیەی پاڵی ناوە بە زانایانی فەرمودەی شیعەوە بڵێن قورئان دەستکاری کراوە پشت بەستن بووە بەو سورەتو ئایەتە هەڵبەستراوانەی لەسەر ئیمامەتی عەلی هاتووە.

هەندێك لەزانایانی شیعە بەرگری لەنەبوونی دەقێکی خوایی دەکەن لە قورئاندا لەسەر ئیمامەت لەو ڕوانگەیەی کە ئەو ئایەتانە هەڵبەستراون یان گۆڕاون.

ڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئاندا ڕووبەڕووی بەربەستێکی گەورە دەبێتەوە لای زانایانی شیعە ئەویش داننانی ئیمام عەلییە بەم قورئانەی لەبەردەستی مسوڵماناندایە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا، وە ئەگەر هەر سورەتێك یان ئایەتێکی گۆڕاو یان هەڵبەستراو لە قورئاندا هەبوایە ئیمامی عەلی باسی دەکردو دەستنیشانی دەکرد.

بیرۆکەی گۆڕینی قورئان لەو بیرۆکانە نییە کە لە گۆڕەپانی شیعیدا وەکو بیرۆکەیەکی گشتی مەترسیدار دەرکەوێت چونکە زۆربەی هەرە زۆری شیعە

---

شاردنەوەی خراپەکانی خۆیانو چاکەکانی عەلی وە ئەوەی کە زانایانی ئەهلی سوننە دەیڵێن لە نەسخ واتە گۆڕین لەلایەن خواوە بۆ مەبەستی تەشریعی بووە.(وەرگێڕ)

لەم مەسەلەیە نزیك نەبوونەتەوەو باوەڕیان پێی نییە بەبۆنەی هەڵوێستی زۆرێك لەزانایانمان باوەڕیان بە نەبوونی گۆڕانکارییە، بەڵام بیرۆکەکە سروشتێکی غەماوی وەردەگرێت کاتێك چاپخانەکان کتێبگەلێك بڵاودەکەنەوە کە هەندێك لە زاناکانمان نووسیویانە دەربارەی گۆڕینی قورئانو بڵاو دەکرێنەوە بەسەر خەڵکیدا یان هەندێك بڕگەیان لێ وەردەگیرێت بۆ ئەوەی لە کتێبی تردا باس بکرێتو هەموو مسوڵمانان بیخوێننەوە.

لێرەوە بانگەوازی ڕاستکردنەوە ئاڕاستەی هەموو پەخش کەرەوەکان دەکەین لەولاتە شیعەکاندا کە دەست لە پەخشکردنی ئەم جۆرە کتێبانە هەڵگرن چونکە پێچەوانەی کتێبی خواو دەقەکانیەتیو زیان بە ناوبانگی ئیسلامو کتێبە پیرۆزەکەی دەگەیەنێت کە دەستووری هەمیشەیی مسوڵمانانە، ئەگەر لاوازییەك ڕووی تێبکات ڕوو لەمسوڵمانان دەکات وە هەر هێزێکیش ڕووی تێبکات ڕوو لە مسوڵمانان دەکات.

وەکو وتمان ڕاوبۆچوونی باو لەناو زۆرینەی زانایانی شیعە نەبوونی گۆڕانکارییە، بەڵام ئەم بۆچوونە بۆچوونێکی تری بەدوادا دێت کە زۆر سەیرەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە تەنها ئەو ڕیوایەتانە نەبێت کە ڕاوییەکانی شیعە ریوایەتی دەکەن، وە ئێمە لەم بزاڤە ڕاستکارییەدا ناتوانین ئەو جۆرە بۆچوونە نامۆیانە پشتگوێ بخەین بەڵکو لەسەرمانە ئاماژەیان پێ بدەین بۆ ئەوەی ڕاستکردنەوەکە گشتگیرو هەمەلایەنە بێت.

وە لێرەدا ڕای گەورە زانای شیعە باس دەکەین کە ئیمامی خوئییە کە لە تەفسیرەکەی (البیان)دا لەلاپەڕە ٢٥٩دا دوای ئەوەی ڕاوبۆچوونی زانایانو فەرمودەناسەکانی ئیسلام باس دەکاتو لەوانە شیعە دەربارەی ڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئاندا دەڵێت: "لەوەی سەرەوە بۆ خوێنەر دەردەکەوێت کە

باسی ڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئاندا ئەفسانەیەو کەسێك دەیکات کە عەقڵی لاواز بێت یان کەسێك بە باش ورد نەبووبێتەوە لێی یان کەسێك پەنای بۆ ببات حەز بە وتنی بکات، حەزیش پیاو کوێرو کەڕ دەکات، بەڵام مرۆڤی ژیر خاوەن ئینساف گومانی نییە لە ناڕاستییەکەی‌و ئەفسانییەکەی"[1]

بەڵام ڕای دووەم کە ئاماژەمان پێدا لەلاپەڕە ٢٢٢دایە لە هەمان کتێب کە تێیدا هاتووە: "بوونی قورئانێکی تایبەت بە أمیر المؤمنین عەلی سەلامی خوای لەسەر بێت جیاواز لەو قورئانەی لەبەردەستدایە لەتەرتیبی سورەتەکان نابێت جێی گومان بێت، وە کۆدەنگی زانایانمان لەسەر بوونی ئەو قورئانە بێ نیازی کردووین لە کۆشش کردن بۆ سەلماندنی، هەروەها لەخۆگرتنی ئەو قورئانە بۆ زیادەگەلێك کەلەم قورئانەدا نییە هەرچەند ڕاستیشە بەڵام بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە ئەم زیادانە بەشێك بووە لەم قورئانەو لێی لابراوە بەنیازی گۆڕانکاری بەڵکو ڕاست ئەوەیە کە ئەو زیادانە

---

[1] دەستەواژەیەکی زۆر تەمومژاوی‌و ناڕۆشنە وە بۆ ئەوەی خوێنەر وا نەزانێت ئێمە بە نارەوانی گۆڕیومانەتە سەر کوردی دەقی نووسینە عەرەبییەکە دێنینەوە بۆ ئەوەی خوێنەر خۆی بیبینێت کە ئەم ناڕوونییە بەڵگەیە لەسەر باوەڕی خونی بەڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئاندا بۆیە ناتوانێت بەڕاشکاوی ڕای خۆی دەربڕێت یان حوکم بەسەر ئەو کەسەدا بدات کە دەڵێت قورئان گۆڕانکاری بەسەردا کراوە، وە دەقی ئەوەش کە نووسەر هێناویتییەوە لەسەر موصحەفی عەلی بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەم قسەیە.

ئەمە دەقی قسەکەی خونییە بە عەرەبی "و مما ذكرناه قد تبين للقارىء أن حديث تحريف القرآن، حديث خرافة لا يقول به الا من ضعف عقله أو من لم يتأمل في أطرافه حق التأمل أو من لجأ إليه، يحب القول به والحب يعمي ويصم، وأما العاقل المنصف المتدبر فلا يشك في بطلانه وخرافته".

ڕاڤەیەك بوون بەناونیشانی ڕوونکردنەوە یان دەرەنجامی قسەن یان بەناونیشانی دابەزاندن لەلایەن خوا بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست"[1]

بەم دەستەواژانە زاناکانمان دەیانەوێت بوونی قورئانێکی تایبەت بە ئیمامی عەلییەوە جیاواز لەم قورئانە بسەلمێنن‌و لەهەمان کاتیشدا ڕستەیەکی سەرسوڕهێنەر زیاد دەکات:

---

ئەم پەرەگرافەش وەکو ئەوەی پێشوو ناڕوون‌و تەمومژاویە، قورئانیشەو قورئانیش نییە! تەفسیرێکە بەناونیشانی تەئویل یان "تنزیل من الله لشرح المراد" ئەمە هەڵوێستی لە قوڕا چەقیوی شیعە دەردەخات کە ناتوانن لێی دەرچن‌و ناتوانن قسەیەکی ڕوون‌و فەتوایەکی ڕوون لەو ڕووەوە دەربکەن، بەڵکو بەم شێوەیە شتەکە بە تەمومژاوی دەهێڵنەوە وە هەرگیز ناتوانن بڵێن ئەوەی باوەڕی بەوە هەبێت کە قورئان گۆڕانکاری تێدا کراوە کافرە چونکە بەوە هەرچی زانای گەورەیان هەیە کە بناغەی مەزهەبیان لەسەرە وەکو کولەینی‌و قومی‌و عەبباشی‌و مەجلیسی‌و موفید و نعمە الله جەزائیری‌و ...هتد، هەموو ئەو حوکمە دەیانگرێتەوە: لێرەشدا دەقە عەرەبییەکە دەهێنمەوە:

"أن وجود مصحف لامير الاموٴمنين عليه السلام يغاير القرآن الموجود في ترتيب السور مما لاينبغي الشك فيه، و تسالم العلماء والاعلام على وجوده أغنانا عن التكلف لإثباته، كما أن اشتمال قرآنه عليه السلام على زيادات ليست في القرآن الموجود وأن كان صحيحا الا أنه لادلالة في ذلك على أن هذه الزيادات كانت من القرآن وقد أسقطت منه بالتحريف بل الصحيح ان تلك الزيادات كانت تفسيراً بعنوان التأويل وما يؤول إليه الكلام أو بعنوان التنزيل من الله شرحا للمراد".

"قورئانێك جیاواز لەم قورئانە لەریزبەندی سورەتەکانیدا وە زیادەگەلێکی تێدایە کەلەم قورئانەدا نییە" ئەمە بیرو باوەڕی خوئیە، ئیتر دوای ئەمە قسە دەمێنێتەوە لەسەر ئەوەی کە بڵێی شیعە باوەڕیان بەڕوودانی گۆڕانکاری تێدا نەکراوە ئەی دەبی قسەی ئەوانەی کە دەڵێن قورئان گۆڕانکاری تێدا کراوە دەبی چۆن بێت؟! ئەمە إن شاء الله لە کتێبێکی سەربەخۆدا بەدرێژی باسی دەکەین.

لەهەمووش سەیرتر ئەوەیە کە کەسیان ئەو قورئان (مصحف)ەیان نەبینیوە وە لەو باوەڕەدان کە مەهدی لەگەڵ خۆیدا بردوویەتی‌و کاتی دەرکەوتنی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێتەوە.(وەرگێڕ)

"أو بعنوان التنزيل من الله شرحا للمراد"

"یان بەناونیشانی دابەزاندن لەلایەن خواوە بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست"

ناشزانم ئەم سووربوونە لەسەر ناونانی ڕاڤەی قورئان یان ڕوونکردنەوەی قورئان بە (مصحف) چییە، پاشان ئەم کۆدەنگییەی باسی دەکات چییە:

"کۆدەنگی زاناکان‌و پێشەوایان لەسەر بوونی ئەو موصحەفە ئەوەی لەکۆڵ کردوینەتەوە هەوڵی سەلماندنی بدەین"

چ کاتێك زاناکان هاودەنگییان ڕاگەیاند لەسەر ئەو شتە؟

ئەوە نەبێت کە چەند کەسێکی کەم بە پشت بەستن بە قسەیەك دراوەتە پاڵ ئیمامی عەلی کە تەبرەسی لە کتێبی (الاحتجاج)دا باسی کردووە[1]

ئەوەی شارەزا بێت لە قسەکانی ئیمام‌و ژیاننامەی گومانی هەیە لەوەی کە ئاوەها قسەیەك لەزاری ئیمامەوە دەربچێت لەبەرنامۆیی ناوەڕۆکەکەی، پاشان ئەو ڕستە سەرسوڕهێنەرە چی دەگەیەنێت؟ ئایا قورئان ڕاڤەیەکی خواییشی هەیە کەلەلایەن خوا هاتبێت‌و بەشێك نەبێت لە قورئان‌و بەو شێوەیە قورئانی دابەزێنراو لەلایەن خواوە لەدوو بەش پێك بێت: ناوەڕۆك‌و ڕاڤە، ناوەڕۆکەکە لەبەردەستی هەمووان بێت‌و ڕاڤەکەی تەنها لای عەلی؟

ئەگەر لەبیرم نەچوو بێت کاتی خۆی گفتوگۆم لەسەر ئەم بابەتە کرد لەگەڵ زانای گەورە خوئیداو هیچ بەڵگەیەکی نەهێنایەوە جگە لەو ڕیوایەتەی تەبرسەی هێناویەتەوەو گفتوگۆکە گەیشتە ڕادەی مشتومڕێکی توندوتیژ داوام وایە لەخوا لێم خۆش بێت ئەگەر سنوورم بەزاندبێت لەبەردەم

---

[1] قسەکەی خوئیی کە دەڵێت: کۆدەنگی زاناو ناودارەکانمان لەسەر بوونی ئەو موصحەفە، ڕاستترە لە قسەکەی موسەوی کە دەڵێت کەمینەیەك لە زانایان ئەو بۆچوونەیان هەیە. (وەرگێڕ)

مامۆستایەکدا کە فیقهو ئوصولی فیقهم تا ماوەیەك لەبەردەستی خوێندووە کاتێك کەلە نەجەف بووم.

زاناکانمان بەڵگە بۆ بوونی موصحەفێکی تایبەت بە ئیمامی عەلی بەڕیوایەتێك دێننەوە کە تەبرەسی لە کتێبی (الاحتجاج)دا هێناویەتیەوە ئەویش ئەم قسەیەی ئیمامە: "ئەی تەڵحە هەر ئایەتێك خوا دایبەزاندووە بەسەر پێغەمبەردا لای من بە خوێندنەوەی پێغەمبەرو دەستخەتی من، وە ڕوونکردنەوەی هەر ئایەتێك خوا دایبەزاندووە بەسەر موحەممەدا (ص) وە هەموو حەڵاڵو حەرامێكو حوکمێك کە ئوممەتی ئیسلام پێویستی پێیەتی تا ڕۆژی قیامەت لای من نووسراوەتەوە بە خوێندنەوەی پێغەمبەری خواو دەستخەتی من تەنانەت بژاردنی ڕوشاندن(کەسێك جێیەکی کەسێك بڕوشێنێت)[1]

هەرەکو وتمان ئەو ڕیوایەتە لاوازییەکی ڕوونو نامۆییەکی بێوێنەی تێدایەو پرسیارگەلێکی بێ سنوورو بێ شوماری لێدەبێتەوە، پێش هەمووشتێك بۆچی پێغەمبەر (د.خ) عەلی تایبەت کرد بە زانینی ئەحکامگەلێك کە ئوممەتەکەی تا ڕۆژی قیامەت پێویستی پێیەتی بەڵام بە ئوممەتەکەی ڕانەگەیاندو لێی شاردەوە لەکاتێکدا کە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: "ئێمە تۆمان بۆ هەموو خەڵکی ناردووە بە موژدەدەرو ترسێنەر، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن" سبأ/٢٨

وە لەشوێنێکی تردا دەفەرموێت: "ئەمڕۆ ئاینەکەم بۆ تەواوکردن..." المائدە/٣.

---

[1] تفسير البيان: الامام الخوئي ص٢٢٢.

بۆچی ئیمامی عەلی باسی ئەو ئەحکامانەی نەدەکرد لە سەردەمی خیلافەتی خەلیفەکانی پێش خۆی یان لەسەردەمی خیلافەتی خۆیدا، وە بۆچی ئەحکامگەلێکی شاردەوە کە ئوممەتی ئیسلامی تاکو ڕۆژی دوایی پێویستیان پێی هەیەو هەمو حوکمێکی تێدایە لەحەلاڵو حەرام تەنانەت بژاردنی ڕوشاندنی پێست؟ بەڕاستی شپرزییەکی تێکدەرە بۆ ژیری لە مێشکی ئەوکەسانەدا دەیخوێنینەوە کە ڕیوایەتگەلێکی لەو شێوەیان داناوەو داویانەتە پاڵ ئیمامی عەلی‌و لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە زاناکانمان پشتیان پی بەستووەو وەکو شتانێکی حاشا هەڵنەگر تەماشایان کردووە.

## ڕاستکردنەوە:

هەرچی وتراوەو باسکراوە لە کتێبە شیعییەکاندا دەربارەی موصحەف (قورئان)ی ئیمامی عەلی جگە لە دابڕینی جۆرێك لە پیرۆزی بەسەر ئیمامی عەلیدا هیچی تر نییە لەلایەن ئەو کەسانەی ئەو ڕیوایەتانەیان داهێنا بۆ سەلماندنی شیاوێتی‌و لەبەرێتی ئیمامی عەلی بۆ جێنشینی پێغەمبەر ڕاستەوخۆ دوای خۆی بۆیە قورئانێکی تایبەتی هەبوو بەخۆیەوە کە کەسی تر نەیبووە، ئەمە لەڕواڵەتدا وایە بەڵام لەڕاستیدا خراپەیەکی گەورەیان کردووە بەرامبەر ئیمامی عەلی کەوایان دەرخستووە کە ئەو ئەحکامانەی خوای شاردووەتەوە کە حەلاڵو حەرامو هەرچی ئوممەتی ئیسلامی پێویستی پێیەتی تا ڕۆژی قیامەت بۆ کوڕەکانی خۆی نەبێت کەدوای خۆی پێشەوان بۆ کەسی تری باس نەکردووە، وە ئیمامەکانیش لەلای خۆیانەوە لە مسوڵمانانو تەنانەت لە هەوادارو شوێنکەوتوانی خۆشیانیان شاردووەتەوە تا ئەو زانستانە بەدیارنەمانی ئیمامی دوانزەهەم دیارنەمان.

بەو شێوەیە دەبینین کە خۆشەویستی زۆر کاتێك لە سنوور دەردەچێت بە خراپەیەکی ڕەها کۆتایی پێدێت وە هەرشوێنێك لەسنووری خۆی دەرچێت هەڵدەگەڕێتەوە بۆ دژەکەی، لێرەوە جارێکی تر دەڕۆین بەرەو بیرۆکەی ڕاستکردنەوەو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو وەهمانەی دەربارەی ئیمامی عەلی‌و ئیمامەکانی تر چنراون.

بەڕاستی لەدەوری خۆر ئەستێرەگەلێکی کزیان داناوەو وایانزانیوە کە گڕو ڕۆشنایی خۆر زیاد دەکەن، بەوەش وەکو ئەوانەیان لێهاتووە کە خوا دەربارەیان دەفەرموێت: "بڵێ ئایا هەواڵتان بدەینێ کێ خەسارۆمەندترین کەسە، ئەوانەی کە هەوڵو کۆششیان لەم دونیایەدا بەفیڕۆ چووەو وا دەزانن چاکەکارن" الکهف/ ١٠٣-١٠٤

وە لەگەڵ ئەوەی کە باوەڕمان وایە زۆربەی ریوایەتە هەڵبەستراوەکان لەسەر ئیمامەکان دوای دیارنەمانی گەورە دانراون، ئەو سەردەمەی کە پێی دەڵێن سەردەمی ململانێی یەکەم لەنێوان شیعەو تەشەیوعدا، بەڵام ئەگەر کەسێك بە ئینسافەوە بەدوایدا بچێت ناچارە بڵێت لەسەردەمی ئیمامەکانیشدا ڕیوایەتگەلێکیان لەسەر دانراوە هەر وەکو چۆن فەرمودەگەلێك لەسەر پێغەمبەری بەڕێز (د.خ) دانراوە دوای خۆی مێشکی مسوڵمانانی قاڵ کردبوو، ئەوەندە هەیە کە ئەو ریوایەتە هەڵبەستراوانەی دەدرانە پاڵ ئیمامەکانی شیعە لەژیانی خۆیاندا ڕەهەندگەلێکی مەترسیداریان نەبووە بەهۆی بوونی خۆیان لەناو خەڵکیداو توانای خەڵکی بەگەیشتن پێیان‌و پرسیارکردن لێیان دەربارەی ئەو ریوایەتانە، ئەوە ئیمامی صادقە لە پێغەمبەروە دەگێڕێتەوە (د.خ) کە فەرمویەتی: "هەرشتێکی ڕەوا ڕاستییەکی هەیەو هەر شتێکی ڕاستیش ڕووناکییەکی هەیە، هەرکەسێك

لەگەڵ کتێبی خوادا (قورئان) گونجا وەریگرن وە هەر شتێکیش پێچەوانەی بوو دەستی لێهەڵگرن".

ئیبن ئەبی یەعفووریش دەڵێت لە ئیمامی صادقم پرسی دەربارەی دوو فەرموودە، یەکێکیان کەسێکی باوەڕپێکراودەیگێڕێتەوەو ئەوی تر کەسێك دەیگێڕێتەوە کە متمانەمان پێی نییە، وتی: "ئەگەر فەرمودەیەکتان بۆ هات بەڵگەی لەسەر بوو لە قورئان یان لە فەرمودەی پێغەمبەر (د.خ) وەریبگرن"[1]

وە ئیبن ئەبی عومەیر لە ئیمامی صادقەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: "هەرکەسێك پێچەوانەی کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەر بکات بەوە کافر دەبێت"[2]

وە لە شوێنێکی تردا ئیمام دەڵێت: "هەمووشتێك دەبێ بگەڕێنرێتەوە بۆ کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەر وە هەر فەرمودەیەك لەگەڵ کتێبی خوادا نەگونجێت ئەوا قسەی هەڵبەستراوە"

بەو شێوەیە ئیمامی صادق ڕێگایەکی ڕوونی دانا بۆ جیاوازی خستنە نێوان فەرمودە ڕاستەکانو هەڵبەستراوەکانو ریوایەتە ڕاستو درۆکان بۆ ئەوەی دەرگا لەسەر ئەو بیدعەتانە داخات لەپێناوی ئاین وبەناوی ئاینەوە سەر هەڵدەدەن.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم بەشە بێنم حەز دەکەم ئاماژە بەوە بدەم کە هەندێك لە زانایانی شیعە لە کتێبەکانیاندا لە پاڵ موصحەفی عەلیدا

---

[1] الكافي ج١ ص٦٩.

[2] الكافي ج١ص٧٠.

قسەیان لەسەر موصحەف (قورئان)ی فاتیمە کردووە، هەڵوێستیشمان لەم بۆچوونە هەمان هەڵوێستە لە موصحەفی عەلیو ئەوەی لەمەوبەر باسمان کرد بەسە.

## چەند سەرنجێك:

١ـ ئەم بابەتە قسە زۆر هەڵدەگرێتو مشتومڕی زۆری لەسەرەو نووسەر زۆر بەکورتیو بەنیوەچڵی ئاماژەی پێداوەو هەموو ئەو ریوایەتانەی دراونەتە پاڵ ئیمامەکان دەربارەی ڕوودانی گۆڕانکاری ودەستکاری کردنی قورئان نەیهێناونەتەوە، دیارە مەبەستی ئەوەبووە کە بەشداری نەکات لەخستنەڕووی ئەو ریوایەتانەی باسی ئەو شتە دەکەن وەکو هەوڵێك لەنووسەرەوە بۆ نەوروژاندنی ئەو مەسەلەیەو بۆ ئەوەی خەڵکانی غەرەزدار سوودی لێوەرنەگرن یان بۆ پاراستنی ناوبانگی شیعە. بەبۆچوونی ئێمە باسکردن لەم بابەتە بەبێ هێنانەوەی ئەو ریوایەتانەی کەلە بڕواپێکراوترین سەرچاوەیاندا هاتووەو قسەی زاناکانیان لە سەر ڕوودانی گۆڕانکاری بابەتەکە بە کرچو کاڵیو لە قاڵبی تۆمەتی بی بنەمەدا دەهێڵێتەوە هەرچەند داننانی نووسەر بەم ڕاستییەدا خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی شیعە باوەڕیان بەڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئاندا هەیە.

٢ـ شیعە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی تۆمەتباریان دەکەن بەم شتە لەجیاتی ئەوەی فەتوایەکی ڕوونو ئاشکرا دەربکەنو هەڵوێستی خۆیانو حوکمی شەرع دەربخەن بەرامبەر هەرکەسێك کەوتوویەتی قورئان گۆڕانکاری تێدا کراوە دەچن قوڕەکە شلتردەکەنەوەو سوننەش تۆمەتبار دەکەن بەوەی کە ئەوانیش باوەڕیان بە ڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئاندا هەیەو پشت بەو قسانە

دەبەستن کە زانایانی سوننە لەسەر ناسخو مەنسوخو بسم الله وتویانە، بەوەش بەڵگەیەکی گەورەتر دەدەنە دەستەوە بۆ دوژمنانی ئیسلام.

٣ـ بەڵگەی بەرجەستە لەسەر ئەوەی کە شیعە باوەڕی تەواویان بەم قورئانە نییە نەبوونی هیچ لێکۆڵینەوەیەکی قورئانییە لەلایەن شیعەوە جگە لە تەفسیر کە ملی ئایاتەکانیان لە ڕێگەیەوە باداوە بۆ سەلماندنی بیرو باوەڕەکانیان.

بایەخنەدانی شیعە بەزانستە قورئانییەکان بەتایبەت ئیعجازی قورئان بەڵگەیەکی زۆر بەرجەستەو ئاشکرایە لەسەر باوەڕی شیعە بە ڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئاندا چونکە ئیعجازی قورئان سەرچاوە خواییەکەی قورئانو نەگۆڕییەکەی دەسەلمێنێت.

٤ـ بەدرێژایی مێژووی شیعە گوێیان بەخوێندنو لەبەرکردنی قورئان نەداوەو تەنانەت زاناکانیشیان نەك هەر قورئانیان لەبەر نەبووە بەڵکو نەشیاندەزانی بیخوێننەوە لەم دواییەدا نەبێت ئەویش بۆ فریودانی سوننەو وەکو پرۆپاگەندەیەك بۆ مەزهەبەکەیان.

٥ـ هەرچی زانستی قورئان هەیە هەر لە تەجویدەوە تاکۆتایی هەمووی لەداهێنانی سوننەیەو یەك زانای شیعە نابینی پشکێکی هەبێت لەپێشخستنی هیچ زانستێکی قورئانیدا.

٦ـ کورتەی ڕای شیعە دەربارەی قورئان بەم شێوەیەیە:

أ ـ باوەڕیان بە گۆڕینی قورئانو دەستکاری کردنی هەیە.

ب ـ بانگەشەی ئەوە دەکەن کە جگە لە قورئان کتێبی تریش لەلایەن خواوە دابەزیوە وەکو جەفرو جامیعەو موصحەفی فاتیمە.

ج ـ لادان لە تەفسیری قورئانداو ڕاڤەکردنی قورئان بەمەیلو ئارەزووی خۆیانو پراکتیزەکردنی ئایەتەکانی بەسەر ئیمامی عەلیو نەوەکانیدا بەبێ هیچ بەڵگەیەکی زانستی و ڕاست.

# کۆکردنەوەی نوێژەکان

ئەنجامدانی نوێژەکان لەکاتی خۆیاندا پەیڕەوی کردنە لە پێغەمبەر (د.خ) وە قورئانی پیرۆزیش دەفەرموێت: "ئێوە لە پێغەمبەری خوادا پێشەنگی باشتان هەیە بۆ کەسێك تەماداری پاداشتی خواو بەختەوەری ئەو دونیا بێتو یادی خوا زۆر بکات" الاحزاب/٢١

کۆکردنەوەی نوێژەکان

لەناو هەموو مسوڵمانانداندا تەنها شیعەی ئیمامی نوێژەکان کۆدەکەنەوە لە نیشتەجێ بووندا (لەشارداو بەبێ سەفەر)، نیوەڕۆو عەسر بەیەکەوەو مەغریبو عیشاش بەیەکەوە.

هەڵوێستی من لەم جیاوازییە فیقهییە بەتەواوی جیاوازە لەمەسەلە فیقهییەکانی تر بەڵام ئەم دیاردەیە کە تەنها لەناو شیعەدا هەیە زیان بەیەکبوونی ئیسلامیی دەگەیەنێت بەتایبەت کە زۆربەی زانا شیعەکان فەتوای ئەوە دەدەن کە باشترە نوێژەکان لەکاتی خۆیاندا ئەنجام بدرێن بەڵام لەڕووی کردەییەوە لەگەڵ کۆکردنەوەدانو نەریت وایە لە مزگەوتەکانی شیعەدا نوێژەکان کۆبکرێتەوە[1]

پێنج نوێژەکە بۆ کاتی تایبەت فەرزکراونو بەناوی ئەو کاتانەوە ناونراون، کاتی عەسر جیاوازە لەنیوەڕۆ وە عیشا لەلایەنی زەمانییەوە جیاوازە لە مەغریب وە گومانی تێدا نییە کە داناییەکی خوایی گرنگ هەیە لە فەرزکردنی نوێژەکان لەم پێنج کاتەداو گێڕانی نوێژ بە کۆڵەکەی ئاینو یەکێك لە گرنگترین دروشمەکانی ئیسلام.

---

[1]. لەماڵەکانیشدا هەمان شتە.(وەرگێڕ)

پێغەمبەر (د.خ) لەمزگەوتەکەیدا لەمەدینە لە پێنج کاتەکەدا نوێژی دەکرد هەروەها خەلیفەکانی دوای خۆی بە ئیمامی عەلیشەوەو ئیمامەکانی تریش بەهەمان شێوە، وەئەگەر پێغەمبەر (د.خ) جارێك یان دووجار بەبێ سەفەرکردن دوو نوێژی کۆکردووەتەوە ئەوەیان لەبەر زەرووورەت بووە یان وەکو ڕوخسەتێك بۆ مسولمانان بەلام کردەوەی پێغەمبەر خۆی (د.خ) پابەند بوون بوو بە پێنج کاتەکەوە.

خۆزگە دەمزانی ئایا هۆیەکی بەکەڵك هەیە بۆ دەرخستنی ئەم جیاوازییە لەگەڵ زۆرینەی مسولمانانندا یان ئەمە کردەوەیەکە کەسانێك دایانهێنا بەمەبەستی دوورخستنەوەی شیعە لەهەموو ڕواڵەتەکانی یەکبوونو پاشان زانایانو ئیمامی مزگەوتەکان لەسەری ڕۆیشتوون بەنەزانی یان بەزانیارییەوە، وە ئێمەش لەم پرۆسە ڕاستکارییەدا مەبەستمان یەکخستنی مسولمانانە لەڕووی تیۆریو کردەییەوە لەهەمانکاتدا وە پەیامەکەمان زاڵبوونی ئێجگارییە بەسەر هەموو ڕواڵەتێکی ناکۆکی هزریو کردەییو ئەمەش سەرناگرێت بەگەڕانەوە نەبێت بۆ سەردەمی پێغەمبەرو دەستگرتن بە سوننەتی پێغەمبەوە (د.خ) بەو شێوەیەی کە ئەنجامی دەدا، وە لەو باوەڕەدا نیم کەکەسێك هەبێت لەناو مسولمانانندا کردەوەو بۆچوونی خەڵکانی تر بخاتە پێش سوننەتو کردەوەی پێغەمبەرەوە (د.خ) وە لێرەوە داوا لە ئیمامەکانی مزگەوتەکانی شیعەو لە شیعە دەکەم پابەند بن بە نوێژەکانەوە لەکاتی خۆیانداو ئەوە بێننە بەرچاویان کە پێغەمبەرو یارانی لە کۆچکردوانو پشتیوانان لەمەدینەدا پێنج نوێژیان دەکردو دوورنەکەونەوە لەڕێگەیەك پێغەمبەری ئیسلام کێشاویەتی بۆ مسولمانان چونکە پەیڕەوی کردن لە پێغەمبەرو پابەندبوون بە سوننەتەکەیەوە مایەی سەربەرزیو هێزو ڕێزی

مسولّمانانە، ئەوەتا ئیمامی عەلی بۆ یەکێك لە والییەکانی دەربارەی نوێژو کاتەکانی دەنووسێتو دەڵێت: "نوێژی نیوەڕۆ بەخەڵکی بکەن تاوەکو سێبەری هەموو شتێك ئەوەندەی خۆی لێدێت، وە نوێژی عەسریان بۆ بکەن لەدوای کۆتایی هاتنی نوێژی نیوەڕۆوە تاوەکو ڕۆژ زەردهەڵدەگەڕێت وە نوێژی ئێوارەیان بۆ بکەن لە کاتێکدا کە ڕۆژووان ڕۆژووەکەی دەشکێنێتو حاجی لە شاخی عەرەفەوە دەکەوێتە ڕێ بەرەو مینا وە نوێژی خەوتنانیان بۆ بکەن کاتێك کە سوورایی ئاسمان ون دەبێت تا سێیەکی شەو وە نوێژی بەیانییان بۆ بکەن لەکاتێکدا کە خەڵکی یەکتر دەناسنەوە و بەپێی توانای لاوازترینیان نوێژیان بۆ بکەنو مەبنە مایەی گوناهباربوونی خەڵکی (واتە نوێژەکانتان درێژ بێتو خەڵکی بێزاری دەرببڕن بەوە گوناهباربن)[1]

## چەند سەرنجێك:

١ـ ئاشکرایە کە شیعە لە کۆکردنەوەی نوێژەکاندا نە پەیڕەوی لە سوننەتی پێغەمبەر دەکەن وە نە لە ئیمامی عەلی بەڵکو بەویستی خۆیانو بەپێی بەرژەوەندی خۆیان چی بە گونجاو بزانن ئەوە دەکەن بێ ڕەچاوکردنی ئایەتو فەرمودە وەکو ئەوەی لێرەو لەنوێژی هەینیدا بینیمان.

٢ـ بەتەواوی نازانرێت مەبەستی زانایانی شیعە چییە لەم کارە، پێدەچێت دوومەبەستیان لێی هەبێت:یەکەم جیاکردنەوەی شیعە لە سوننە بە پەیڕەوی لەو ڕیوایەتەی دوایانەتە پاڵ جەعفەری صادق کە گوایە وتویەتی (ڕاستی و ڕەوایی لەپێچەوانەکردنی ئەهلی سوننەدایە) یان ئەو ئامۆژگارییەی کە بۆ

---

[1] نهج البلاغة/ ج٣ ص٨٢، خطبة رقم ٢٩٠ ص٥٧٠ شرح محمد عبده.

پیاوێکی دەکات کە لێی دەپرسێت ئەگەر حوکمی شتێکم نەزانی چی بکەم ئەویش پێی وت بزانە ئەهلی سوننە چی دەکەن تۆ پێچەوانەی ئەوە بکە. دووەم بۆ ئاسانکردنەوەی مەزهەبەکە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی زیاتر دوایان بکەون هەروەکو چۆن هاوسەرگیری کاتیان هێشتووەتەوە بۆ ڕاکێشانی گەنجانو خەڵکانی دەروون نزم.

٣ـ شیعە لەزۆر شوێندا ڕوخسەتیان کردووە بە بنەماو عەزیمەتیان کردووە بەلاوەکی وەکو ئەوەی لێرەو لەمەسەلەی تەقیەدا کردوویانە، ئاشکرایە کە کۆکردنەوەی نوێژ ڕوخسەتێکە پێغەمبەر (د.خ) یەك دوو جار کردوویەتی بۆ ئەوەی مسوڵمانێك ئەگەر ڕۆژێك ماندوو بوو یان کارێکی گرنگی هەبوو (بۆ نموونە کۆبوونەوە یان وانە..هتد) وە یا ڕۆژێکی بارانی زۆر وە یا سەرمای زۆر بتوانێت نوێژی نیوەڕۆو عەسر پێکەوە یان ئێوارەو خەوتنان پێکەوە بکات.

بەڵام لەکاتی ئاساییدا دەبێ هەرنوێژەو لەکاتی خۆیدا بکرێتو ئەمەش بنەمایەو عەزیمەیە، بەڵام شیعە پێچەوانەیان کردۆتەوە.

هەروەها لەمەسەلەی تەقیەدا، بنەما یان عەزیمە ئەوەیە کە مسوڵمان ئەگەر هەڕەشەی کوشتنی لێ بکرێت وشەی کفر بەدەمیدا نەیەت، بەڵام روخسەتیش هەیە بۆ کەسێك کە نەتوانێت بەهەڵستی فشاری زۆر بکات، واتە تەقییە بکات بەزمان شتێك بڵێت بەگوێرەی ویستی بەرامبەربێت با پێچەوانەی شەرع بێت بەو مەرجەی لەدڵەوە وانەبێت بەڵام شیعە مەسەلەکەیان پێچەوانە کردۆتەوە، تەقییە بووەتە بنەماو عەزیمەش بووەتە لاوەکی (استثناء) بەوەشەوە نەوەستاون، بەڵکو دەیان ڕیوایەتیان داوەتە پاڵ ئیمامەکانیان لەگەورەیی‌و پاداشتو گرنگی تەقییە، کە ئەمەش پێچەوانەی شەرعی خوایە.

هەروەها لە مەسەلەی هاوسەرگیری کاتیی‌و هەمیشەیی، لەکاتێکدا کە هەموو دەزانین قورئان‌و فەرمودە گرنگیان بەهاوسەرگیری هەمیشەیی داوەو هەموو ئەحکامەکانیان ڕوون کردووەتەوە و هیچ شتێك لە حومکی هاوسەرگیری کاتی لە قورئان‌و فەرمودەدا نییە کەچی شیعە دەیان فەرمودەیان هەڵبەستووە لەسەر گەورەیی موتعەو داویانەتە پاڵ ئیمامەکانیان یان پێغەمبەری خوا (د.خ) وە مەسەلەکەیان وا نیشانداوە کە هاوسەرگیری کاتی زۆر لە هاوسەرگیری هەمیشەیی گەورەترو پیرۆزتربێت.

ئەمانە هەموو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شیعە بە ئارەزووی خۆیان ئەحکامە شەرعییەکانیان گۆڕیوەو فەرمودەیان هەڵبەستووە بەدەمی پێغەمبەرو ئیمامەکانیانەوە.

## گەڕانەوە بۆ دونیا

کاتێك ئەفسانە تێکەڵی بیروباوەڕو وەهمەکان تێکەڵی ڕاستییەکان دەبن ئەوکاتە بیدعەتگەلێك سەرهەڵدەدەن کە مرۆڤ دێننە پێکەنینو گریان لەهەمانکاتدا.

گەڕانەوە بۆ دنیا

دووبابەت هەیە پێگەیەکی بچوك داگیردەکەن لەبیروباوەڕی شیعەی ئیمامیداو کاریگەری نییە لە ژیانی کۆمەڵایەتیو هزری شیعەدا مەگەر ئەوەندە کە دەبنە مایەی وروژاندنی مشتومڕو توێژینەوە دەربارەی مەزهەب کاتێك خەڵکانێك کەلێنی گەورەو بچووك بژمێرن، ئەو دووەش ڕەجعەتو بەدائە کە دەمانویست پشتگوێیان بخەین لە کتێبی ڕاستکردنەوەدا بەڵام دواتر بینیم باشتر وایە هەریەکەیان بەشێکی بۆ تەرخان بکەمو بەکورتی باسیان بکەم، بەتایبەت دوای ئەوەی کە نووسینەکان زۆربوونو وتاری زۆر بڵاوکرایەوە لەسەر مەزهەبی شیعە لەم دواییەداو میدیاو ڕۆژنامەکان تیشکیان خستووەتە سەر شیعەو مەزهەبەکەیان.

وەکو وتم ئەم دووبابەتە ئەگەرچی پێگەیەکی گرنگو بنەڕەتی داگیرناکەن لە بیروباوەڕی شیعەدا بەڕادەیەك کە هەندێك لەزانایانی شیعە ئەو دوو بیرۆکەیان ڕەتکردەوەو زۆرینەی شیعە هیچ شتێکیان لەسەر نازاننو لە نهێنییەکانیان تێناگەن بە تایبەت بیرۆکەی بەداءو ئەو مشتومڕەی لەسەری کراوە کەلەلایەن هەندێك لەزانایانی شیعەوە لەکتێبەکانیاندا وروژاندویانە بەڵام هەندێك کتێب نووسراون لەسەر ئەو دوو بابەتەو هەندێك زانای گەورە باوەڕیان پێی هەیەو لەوەش خراپتر کە ئەم دوو بیرۆکەیە لەو زیارەتنامەدا هەیە کە شیعە لەبەردەم گۆڕو مەزاری ئیمامەکاندا هەموو بەیانیو

ئیوارەیەك دەیانخوێننەوە و هەرگیز ڕووی‌نەداوە كە سەركردە مەزهەبییە گەورەكان ڕێگرییان لەم ڕستەو دەستەواژانە كردبێت یان داوای لابردنی ناوەڕۆكەكانیان كردبێت لەو زیارەتنامانە یان بەهەڵەیان زانیبێت لەكاتێكدا كە هەندێك لەو سەركردانە بێزاری‌و ناڕەزایی دەردەبڕی لە دانیشتنە تایبەتەكانیاندا بەڵام بۆچوونی خۆی بە ئاشكرا دەرنەدەبڕی دەربارەی، بۆیە بە پێویستم زانی كە ئەم كتێبە بەو دوو بەشە كۆتایی پێ بێنم‌و لە ڕەجعەت (گەڕانەوە) وە دەست پێبكەم.

گەڕانەوە لەمەزهەبی شیعەدا بەو مانایە دێت كە ئیمامەكانی شیعە هەر لە ئیمامی عەلییەوە تاوەكو حەسەنی عەسكەری كە ئیمامی یازدەهەمە لای شیعەی ئیمامی دەگەڕێنەوە بۆ ئەم دونیایە بۆ ئەوەی فەرمانڕەوایی ئەو كۆمەڵگەیە بكەن كە ئیمامی مەهدی لەسەر بناغەی دادپەروەری دایدەمەزرێنێ كە پێش گەڕانەوەی ئەو ئیمامانە دەردەكەوێتەوەو زەوی پڕ دەكات لەدادپەروەری‌و ڕێگە خۆش دەكات بۆ گەڕانەوەی باپیران‌و فەرمانڕەواییان دەداتە دەستەو هەریەك لەو ئیمامانە بەگوێرەی ئەو ڕیزبەندییەی هەیە لە ئیمامەتیدا ماوەیەك فەرمانڕەوایی دەكەن‌و پاشان جارێكی تر دەمرنەوە بەو شێوەیە تا حەسەنی عەسكەری كۆتایی دێت‌و دوای ئەوە ڕۆژی قیامەت ڕوودەدات، هەموو ئەمانە بۆ قەرەبووكردنەوەیان لەمافی شەرعی خۆیان لەو حوكمڕانییەی كەنەیانتوانی مومارەسەی بكەن.

ئەو زانایانەی شیعە كەلەسەر گەڕانەوە نووسیویانە ئەم ئایەتەی خوارەوەیان بەم شێوەیە ڕاڤە كردووە (وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ) (الأنبياء: ١٠٥).

واتە: لەزەبووردا دوای تەورات نووسیومانە كە زەوی دەكەوێتە دەست بەندە چاكەكانمان.

دەڵێن: مەبەست لەبەندە چاکەکان ئیمامەکانی شیعەیە.

ئەمە کورتەی بیرۆکەی گەڕانەوەیە بەکورتی ئاماژەمان پێدا، دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەوانەی لەسەر گەڕانەوە نووسیویانەو بەڵگەیان بۆ ڕوودانی بەو ڕیوایەتانە هێناوەتەوە کە دراونەتە پاڵ ئیمامەکانی شیعە بەوەوە نەوەستاون بڵێن تەنها ئیمامەکانی شیعە دەگەڕێنەوە بەڵکو چەندین بیرۆکەی تریان خستۆتە سەر کە هەموویان لەو ڕیوایەتە هەڵبەستراونەوە هەڵهێنجراون کە ئاماژەمان پێدانو دەڵێن گەڕانەوە بۆ دونیا تەنها ئیمامەکانی شیعە ناگرێتەوە بەڵکو خەڵکی تریش دەگرێتەوە لەوانە زۆرێك لەیاراتی پێغەمبەر (د.خ) کە بەدوژمنی ئەهلی بەیتیان دەزانتو ڕێیان لێگرتن لەگەیشتن بە مافی خۆیان لەفەرمانڕەواییدا، ئەم گەڕانەوەش بۆ ئەوەیە کە ئیمامەکان بتوانن لەم دونیایەدا تۆڵەیان لێ بکەنەوە.

وای بۆ دەچم کە ئەوانەی لە پشتی بیرۆکەی گەڕانەوەنو ئەو ڕیوایەتانەیان داناوە بۆ سەلماندنی گەڕانەوە ئەوەندەی مەبەستیان گەڕانەوەی دوژمنان بوو گەڕانەوەی ئیمامەکان نەبوو ئەویش بەمەبەستی تۆڵەکردنەوە چونکە ئەم بیرۆکەیە (تۆڵەکردنەوە) کۆڵەکەی ناکۆکی نێوان شیعەو مسوڵمانانی تر پتەوتر دەکات بەڕادەیەك کە ئیتر بەیەك گەیشتنی بەدوادا نەبێت وە ئەگەر ئەوانەی لە پشتی داهێنانی بیرۆکەی ڕەجعەن دڵسۆز بوونایە بۆ ئیمامەکانی شیعە بەم شێوەیە ئیشانیان نەدەدان کەیەو ڕادەیە خوازیاری فەرمانڕەوایی بنو سووربن لەسەری بەڕادەیەك کە خوا جارێکی تر بیانگێڕێتەوە بۆ ئەم دونیا بڕاوەیە بۆ ئەوەی بۆ ماوەیەك فەرمانڕەوایی بکەن لەکاتێکدا کە ئەوان ئیمامنو لەبەهەشتێکدان کە پانتاییەکەی ئەوەندەی پانتایی زەویو ئاسمانەکانە ڕازێنراوەتەوە بۆ پارێزکاران، وەکو ئیمامی عەلی دەفەرموێت:

"سوێند بەخوا ئەم دونیایەی ئێوە لەو گەڵادارەی کەبەدەم کوللیەکەوەیەو دەیکرۆژێ بێنرخترە"

هەرچۆنێك بێت ئێمە بەداخەوە لەبەردەم بۆچوونگەلێکی لەم جۆرەداین کە هەندێك لەزاناکانمان کتێبیان لەسەر نووسیوەو ڕووبەڕێکیان لەعەقیدە داگیرکردووە با وەکو بەشێکیش نەبێت لێی، وە ئەم بیرۆکەیە لەگەڵ جیاوازییەکی زۆردا دەشوبهێتە بیرۆکەی لەبەرگرتنەوە کە ڤیساگۆرس دایهێناو فیساگۆرییەکان پەیڕەو وییان لێی کرد ولایەنگرانیشی تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ هەیەو لە ڕواڵەتی جیاوازو دەربڕینی جۆراوجۆردا دەرکەوتووەو چووەتە ناو هەنێك بیروباوەڕە سەرەتاییەکانەوە بەڵام ئەوانەی لەسەرگەڕانەوەی ئیمامەکان نوسیویانە هەمان پێکهاتەیان بەکارنەهێناوە کە ڤیساگۆرییەکان بەکاریان هێناوە لەڕاستی لەبەرگرتنەوەدا (التنساخ) یان باشتر بڵێین گوێزانەوەی ڕۆح لەلاشەیەکەوە بۆ لاشەیەکی تر چونکە ئەوانەی باوەڕیان لەبەرگرتنەوە هەیە باوەڕیان بە یەك بابەتی(هەمان کەس) لەگەڕانەوەی کەسێك بۆ دونیا لە دوای مردن نییە، بەڵکو باوەڕیان بەفرەژیانیو فرە مردن هەیە[1] بەشێوەی جۆراوجۆر بەڵام بیرۆکەی گەڕانەوە باوەڕی بە یەکێتی بابەت هەیە کە تەنها یەکجارەو دووبارەبوونەوەی بۆ نییەو دوای ئەوە مردنی دووەم دێتو پاشان زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی، لێرەوە دەمەوێت بڵێم ئەوانەی لەدوای بیرۆکەی گەڕانەوە بوون لەوانەیە کاریگەری فەلسەفەی ڤیساگۆرییان لەسەر بێتو ئەو بیرۆکەیانە دوای دەستکاری کردنی بە پاشخانێکی ئیسلامی هێنایە ناو ئیسلامەوە وەکو هەموو داهێنەران لەبواری بیروباوەڕ

[1] واتە ڕۆحێك چەند جار لەجەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی تر بگوێزرێتەوە.(وەرگێڕ)

مەزهەبەکاندا، وە بەتەواوی نازانم بیرۆکەی گەڕانەوە کەی داهێنراو کتێبی لەسەر نووسراوە، بەڵام ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە سەرهەڵدانی ئەم بیرۆکە دوورانەی لەژیری‌و لۆژیکەوە لەسەردەمی یەکەمی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوعدا سەری هەڵدا کە سەردەمی ساویلکەیی‌و مەیل بۆ بیرۆکەی زیادەڕەوییە دوور لە لۆژیکەکان بازاڕی گەرم بوو.

وە ئەم بیدعەتە جیاوازە لەو بیدعەتانەی تر کە دراونەتە پاڵ هزری شیعی لەوەی کە هیچ ڕێکخراوێکی سیاسی کردەیی یان کۆمەڵایەتی یان ئابووری لەسەر کەڵەکەنەبوو، تەنها شتێك نەبێت کەلەوانەیە لە پشتی داهێنانی بیرۆکەی گەڕانەوەوە بێت ئەوەش وەکو وتمان پتەوکردنی دوژمنایەتی‌و لێکپچڕاندنی ڕیزی مسوڵمانان بەم شتە بێ بنەمایانەی نووسراوەو وتراوە لە تۆڵە سەندنەوەی ئیمامەکان لە یارانی پێغەمبەر (د.خ)، ئەوانەی کە سەرپێچییان لەدەقی خوایی کرد لەمەسەلەی ئیمامەت‌و خیلافەتداو هەر قسەیەك لەم بابەتە پێشترو ئێستاش ئاگری دووبەرەکی زیاتر خۆش دەکات‌و زیان بە یەکڕیزی مسوڵمانان دەگەیەنێت‌و هەموو هەوڵێکی خۆشەویستی‌و لەیەکتر نزیکبوونەوە لەناو دەبات.

لێرەدا پێم خۆشە ڕووداوێك بگێڕمەوە کە چەند ساڵ لەمەوبەر لەگەڵمدا ڕوویدا کاتێك کەلەنەجەف بووم، زانایەکی شیعە هات بۆلام داوای لێکردم کتێبێکی لێ بکڕم کە تازە لە نووسینەوەو چاپکردنی بووەتەوە بەناوی "شیعەو گەڕانەوە" پرسیارم لێکرد دەربارەی ناوەڕۆکەکە.

وتی: دەربارەی سەلماندنی گەڕانەوەی ئیمامەکانە بۆ ئەم دونیایە.

لێم پرسییەوە: کەی ئەوە ڕوودەدات؟

وتی: دەرکەوتنی مەهدی کە زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری.

لێم پرسییەوە: کەواتە سود لەگەڕانەوەیان چییە مادەم دادپەروەری چەسپیوەو ڕووی زەوی گرتووەتەوە، ئیمامەکانیش لەوە بەرزترو بەڕێزترن کە داوای فەرمانڕەوایی بۆ خودی فەرمانڕەوایی بکەنو ئیمامی عەلیش دەڵێت: "ئەم دونیایەی ئێوە بەلای منەوە لە پشقلی بزنێك بێنرخترە وە ئەم دەسەڵاتەم بۆ سەپاندنی ڕاستیو پوچەڵ کردنەوەی ناڕاستی گرتووەتە دەست"

زاناکە بە سەرسوڕمانەوە وتی: بەڵام لە پەڕاوەکانماندا ڕیواتگەلێك هاتووە گەڕانەوەی ئیمامەکان دەسەلمێنی.

هاوارمکرد بەڕوویدا: باشتر نەبوو کە ئەم مەسەلەیە بۆ مەهدی خۆی بەجێبهێڵرایە بۆ ئەوەی قسەی خۆی تێدا بکات؟

بەخێرایی بەجێی هێشتمو دەیوت: وای بۆ ئاینەکەمان[1]

## ڕاستکردنەوە:

کەمێك لەمەوبەر وتم بیرۆکەی گەڕانەوە ڕووبەرێکی گرنگ داگیرناکات لەبیروباوەڕی شیعەی ئیمامیدا بەڵام زۆرێکیان زیارەتنامەی (الجامعة الكبيرة) دەخوێننەوە کە یەکێکە لە گرنگترین زیارەتنامەکانو جێی متمانەیە لای شیعەو دەستەواژەگەلێکی ئاشکرای تێدایە لەسەر گەڕانەوەو هیچ کاتێك نەبووە زانایەك لە زاناکانمان یان سەرکردەیەك لە سەرکردە ئاینییەکانمان بە ڕاشکاویو بە جورئەتەوە ئەم ڕستانەی ڕەتکردبێتەوە یان فەرمانی بەلابردنیان دابێت یان لێکدانەوەیەکی کردبێت لەگەڵ عەقڵدا بگونجێت ئەگەر ماوەی ئەو جۆرە لێکدانەوانەی هەبێت.

---

[1] پێدەچێت مەبەستی ئەوەبێت کە بۆچوونەکانی موسەوی بە مەترسی زانیبێت لەسەر مەزهەبەکەیان.(وەرگێڕ)

زیارەتنامەی (الجامعة) کە ئاماژەمان بەهەندێك لە بڕگەکانیدا لەبەشی زیارەتی گۆڕی ئیمامەکاندا شیعە لەبەردەم گۆڕو مەزاری ئیمامەکانیاندا دەیخوێننەوە کاتێك دەچن بۆ سڵاولێکردنیان لەیەکێك لە بڕگەکانیدا ئەم دەستەواژەیە هاتووە: "باوەڕم بە هاتنەوەتان هەیەو گەڕانەوەتان بەڕاست دەزانمو چاوەڕوانی فەرمانی ئێوەمو چاوەڕوانی دەوڵەتکەتانم"[1]

گومانیشی تێدا نییە کەمەبەست لە دەستەواژەی "گەڕانەوەتان" زیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت نییە چونکە ئەمە شتێك نییە تایبەت بێت بە شیعەوە بەڵکو هەموو مسوڵمانان تێیدا بەشدارن بەپێی بیرو باوەڕی ئیسلامیمان کە بنەمای سێهەم لە بنەماکانی ئاین دوای یەکتاپەرستی و پێغەمبەرایەتی. کەواتە مەبەست لە گەڕانەوە گەڕانەوەی دووەمە بۆ ئەم دونیایە و زۆرێك لەزانایانی مەزهەبی شیعە پشتیان بەم دەستەواژەیە بەستووە بۆ سەلماندنی گەڕانەوەی ئیمامەکان، لێرەدا لە کەسێك دەچن لەسەر ڕیوایەتێکی هەڵبەستراو یان ڕستەیەکی هەڵبەستراو کۆشکێکی گەورە لەوەهمو خەیاڵات دروست بکات، وە لێرەدا ڕستەیەکی ئەرستۆ باس دەکەین کە دەربارەی ئەفلاتونی مامۆستای وتویەتی لەگاڵتەکردن بەو تیۆرییە نمونەییەی کە بانگەشەی بۆ دەکرد: "ئەفلاتوون لە فەلسەفە نمونەییەکەیدا وەکو کەسێك وایە نەتوانێت کۆمەڵێك شت بژمێرێت، چوو چەند بەرامبەری کردەوە بۆ ئەوەی ژماردنی ئاسان بێت بۆی"

بەو شێوەیە هەندێك لە زاناکانمان کاتێك تێگەیشتنی ڕستەیەك قورس بێت بەلایانەوە لەبەر لێکنەچوونی لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامو عەقڵدا،

[1] مفاتیح الجنان: ص١٠٠٥.

لەجیاتی ئەوەی بیدەن بە ئەرزداو فرێی بدەنو خەڵکی سادەی لێ دووربخەنەوە دەچن لێکۆڵینەوەی زیاتری لەسەر دەکەنو ڕاڤەی زۆرتری دەکەن، بەوەش بیدعەیەکی تر زیاد دەکەن بۆ سەر بیدعەتەکەیانو گومڕاییەکی تر دەخەنە سەر گومڕاییەکەیانو قوڕەکە شلتر دەکەنەوەو خراپییەکەو بەڵاکە هەمووان دەگرێتەوە.

بێژانی کتێبەکانی زیارەتنامە لەم هەموو دەستەواژەو ناوەڕۆکانەی دژ بە عەقڵی دروستو ڕۆحی ئیسلامین بەتایبەت ئەو دەستەواژانەو ئەو ڕستانەی بریندارکردنو کەمکردنەوەو زەمکردنی تێدایە بۆ خەلیفە ڕاشیدەکانو یارانی پێغەمبەر، دەکەوێتە بازنەی ڕاستکردنەوەی کردەیی، پێویستە لەسەر شیعە بەباشی تێبگات لەوەی کە دەیخوێنێتەوەو هەموو شتێك نەڵێتەوە کە بەردەستی دەکەوێت لەکتێبو نووسراو بە بیانووی ئەوەی کە لەیەکێك لە ئیمامەکانەوە هاتووە، وە من گومانم نییە لەوەی کە زۆرێك لەم زیارەتنامانەی کە دراونەتە پاڵ ئیمامەکانمان ئەگەر بگەیشتایە پێیان داری حەدیان لەو کەسانە دەدا بەتاوانی درۆ هەڵبەستن بە دەمیانەوە، سەختترین سزاش ڕۆژی قیامەت بۆ ئەوانەی کە درۆ بەزمانی خەڵکیەوە هەڵدەبەستن.

"هاوار بۆ ئێوە درۆ بەدەم خواوە هەڵمەبەستن ئەگینا بە سزایەك لەناوتان دەبات، بەڕاستی هەرکەسێك درۆ بەدەم خواوە هەڵبەستێ ڕەنجەڕۆ دەبێت" طه/٦٠

## چەند سەرنجێك:

١ـ ئەم دوو مەسەلەیە، گەڕانەوەو بەداء ئەگەرچی ئێستا وا دەرکەوێت کەشتی لاوەکین بەلاّم لەسەردەمی سەرهەڵدانیاندا لاوەکی نەبوون بەڵکو کێشەگەلێکی زۆریان بۆ شیعە چارەسەرکردووەو وەلاّمی زۆرێك لە پرسیارەکانیان پێداونەتەوە، من لێرەدا سەرنجەکانم تەنها لەسەر گەڕانەوە باس دەکەمو ئەوی تریان دەهێڵمەوە بۆ دوای باسی بەداء.

بیرۆکەی گەڕانەوەی ئیمامەکان بۆ ئەم دونیایە لەبەرچەند هۆیەك سەری هەڵداوە: یەکەم: بۆ وەلاّمی ئەو پرسیارەی کە دەڵێت: ئەگەر ئەم ئیمامەنە لەلایەن خواوە دیاری کراونو فەرمودەکان باسیان دەکەن چۆن فەرمانڕەواییان نەگرتە دەست؟ کەواتە یان دەبێت ئەو دوازدە خەلیفەیەی فەرمودەکان باسیان دەکات کە فەرمانڕەوایی دەگرنە دەستو مسوڵمانان لەسەردەمیاندا بەهێزو پایەدار دەبن مەبەست لێیان ئەمانە نەبێتو خەڵکانی تر بێت وە یا دەبێ هەر ڕۆژێك بێنەوەو فەرمانڕەوایی بکەن، ئاشکرایە کە بۆچوونی یەکەم لۆژیکیترو ژیرانەترە بەلاّم هەموو بیرو باوەڕەکانی شیعە دەربارەی ئیمامەتو ئیمامەکان دەخاتە ژێر پرسیارەوەوە بەدرۆیان دەخاتەوە، شیعەش لەجیاتی ئەوەی ئەم ڕاستییە ڕووداوییە (واقیعیە) بکەنە بەڵگەیەك لەسەر ناڕاستی ئەو بیروبۆچوونانەی لەسەر ڕیوایەتی هەڵبەستراوو هەندێك پێشەکی عەقڵی نادروست بنیات نرابوون، هاتن ئەم بیرۆکە نالۆژیکیو نا ژیرانەیان داهێنا کە تەنانەت لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیشدا دژە تەنها بۆ ئەوەی دەستەبەرداری ئەو بیروبۆچوونانە نەبن کە لەسەر ئەو بنەما لاوازو نالۆژیکیانە بنیاتیان نابوون.

دووەم: کاتێك بینیان کە ئیمامەکانیان لاواز بوونو ژێر دەستەو هەندێك جاریش ستەم لێکراوو نەیارەکانیشیان دەسەلاّتدارو بەشکۆ ئەو بیرۆکەیەیان داهێنا بۆ ئارامکردنەوەی شوێنکەوتوانیان.

٢ـ ئەگەر ئەدەبیاتی شیعە بخوێنیتەوە دەربارەی مەهدیو گەڕانەوەی مەهدی دەبینی کە هەمووی قووڵ کردنەوەی ڕقو کینەی شیعەیە بەرامبەر بە ئەهلی سوننەو یارانو خەلیفەکانی پێغەمبەر (د.خ) وە مەهدی لەکاتی دەرکەوتنیدا جگە لە دوژمنانی ئەهلی بەیت کەمەبەستیان ئەهلی سوننەیە کەسی تر ناکوژێت، لێرەوە دەتوانین بڵێین کە لەشکری مەهدی کە موقتەدا سەدر دایناوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی داگیرکەران نییە بەڵکو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەهلی سوننەیە، ڕووداوەکانیش هەموو ئەم ڕاستییەیان سەلماند، بەڵام سوننەکان لەبەر بێئاگاییان لەم ئەدەبیاتانە بە تەوژمی سەدری هەڵخەڵەتانو وایانزانی هەر بەڕاستی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەمریکا لەشکری مەهدییان پێکهێنا کەلە ڕاستیشدا وا نەبوو بەڵکو بۆ دوو مەبەست بوو:

یەکەم: بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوننەو دووەم: بەدەستهێنانی بەشی خۆیان لەم پارچە کێکەی کەناوی عێراقەو کەس نەتوانێت پشتگوێیان بخات چونکە تەوژمێکی گەورەن بەلام پشکیان نەبوو لە ڕوخاندنی ڕژێمداو لایەنەکانی تر دەیانویست بێبەشیان بکەن لەو حکومەتە.

٣ـ ئەم مەسەلەیەو مەسەلەی بەدائیش نەك تەنها لە زیارەتنامەکاندا هاتووە وەکو ئەوەی کە نووسەر دەیەوێت لە گرنگییەکەی کەمکاتەوە بەڵکو لە کتێبە بڕواپێکراوەکانی فەرمودەی شیعەدا دەیان فەرمودەیان لە سەر هاتووە (ئەڵبەتە هەموو دانراوەو هەڵبەستراوە بەسەر زمانی ئیمامەکانەوە)و کۆدەنگی زاناکانیان لەسەرەو یەك زانایان لەم کۆدەنگییە بەدەر نییە ئەمەش چەند نموونەیەك:

١ـ الشیخ المفیدکە بە شێخی تایەفە ناسراوە دەڵێت "شیعەی ئیمامی کۆدەنگن لەسەر پێویستی گەڕانەوەی زۆرێك لەمردووان " المفید/وائل المقالات ص٥٠.

وە دەربارەی ئەوانەی دەگەڕێنەوە دونیا دەڵێت "دوو چینن، یەکێکیان ئەوانەی پلەیان لەباوەڕداریدا بەرزەو ئەوی تریان ئەوەی لە خراپەکاریدا ڕۆچووە" المفيد أوائل المقالات ص٩٥.

٢- الحر العاملی کە یەکێکە لەزانا هەرە گەورەکانی شیعەو خاوەنی چەندین کتێبە کە هەموو سەرچاوەن بۆ شیعە دەربارەی گەڕانەوە دەڵێت "کۆدەنگی هەموو شیعەی ئیمامی لەسەرە" الایقاظ من الهجعة ص٢٣.

هەروەها دەڵێت "گەڕانەوە یەکێکە لەمەسەلە گرنگەکانی مەزهەبو دەبێ هەموو کەسێك باوەڕی پێی هەبێت" (إنها من ضروریات المذهب) ل٦٠.

هەروەها دەڵێت "ئێمە فەرمانمان پێدراوە کە دان بەگەڕانەوەدا بنێینو باوەڕی پێ بێنینو لەنزاکانو زیارەتنامەکانو ڕۆژی هەینیو هەموو کاتێك فەرمانمان پێدراوە دانی پێدا بنێین هەروەکو چۆن دان بەیەکتاپەرستیو پێغەمبەرابەتیو ئیمامەتو قیامەت دەنێین" هەمان سەرچاوە ل٦٤.

٣- عبدالله شبر لە کتێبی (حق الیقین) بەرگی ٢ل٢دا دەڵێت "ژمارەی فەرموودەکانی گەڕانەوە زیاد لە دووسەد فەرموودەن ولە زیاتر لە پەنجا کتێبی متمانە پێکراودا هاتووە"

ئەمیش یەکێك لەریوایەتەکانیان کە شێخی موفید لە کتێبی (الارشاد)دا لەجەعفەری صادقەوە دەیگێڕێتەوە:

"ئەگەر مەهدی هات (پێی دەڵێن القائم من آل محمد) پێنج سەد کەس لە قوڕەیش هەڵدەسێنێتەوە (زیندوودەکاتەوە)و لەگەردنیان دەدا پاشان پێنج سەدی ترو لەگەردنیان دەداتو پاشان پێنج سەدی ترو بەو شێوەیە تا شەش جار، وتم (واتە ڕاویەکە): ژمارەیان دەگاتە ئەوەندە؟ وتی: بەڵێ لەخۆیانو لەشوێنکەوتوانیانو هەوادارانیان" الارشاد ل٤١١.

٤ـ بۆ سەلماندنی ئەم مەسەلەیە دەیان ئایەتی قورئان بەمانای گەڕانەوە بۆ دونیا لێك دەدەنەوە ئێستا بواری باسکردنیان نییە.

## بەداء (دەرکەوتن)[1]

بیرۆکەی بەداء پێچەوانە لەگەڵ ئەم وتەیەی خوای گەورەدا:

(وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ وَلاَ تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلاَّ كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُوداً إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاء وَلاَ أَصْغَرَ مِن ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ) (یونس: ٦١ ).

"ئەی موحەممەد تۆ لەهەر کارو مەبەستێکدا بیتو هەرچی لە قورئان بخوێنی وە ئێوە هەر کردەوەیەك بکەن ئێمە بەسەرتانەوە شایەتینو ئاگادارین کاتێك خەریکی ئەو کارانەن وە ون نابێت لە پەروەردگارت بە ئەندازەی گەردیلەیەك نە لە زەویو نە لە ئاسماندا وە نە بچوکتر لەو گەردیلەیەو نە گەورەتر لێی ئەوەتا لەناو پەڕاوێکی ئاشکرادا".

بەداء

لێکدانەوەی هەڵە بەهەڵە واتە بەردەوام بوون لەسەر هەڵەو دەرنەچوون لێی تا ڕۆژی قیامەت لێرەوە دەمەوێت ئەو قسەیە بڵێم ئەگەر هەندێك لەزاناکانمان جورئەتی زانستیو پاکی مەبەستو ڕۆشتی زەینو بێخەوشی هزریان هەبوایە بە ڕێگەیەکی دڕکاویدا نەدەڕۆیشتن بۆ لێکدانەوەی قسەیکی

---

[1] بەداء: دوو مانای هەیە:

یەکەم: ئاشکرابوونو دەرکەوتن، لە (بدا بدواو بدوا وبداءة اي ظهر.

دووەم: دەرکەوتنی بڕیارێکی نوێ لە: بدا له في الامر بدوا و بداء وبداة" نشأ له فيه رأي.

هەردوو ماناکەش لە قورئاندا هاتوون: یەکەم (وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ).

دووەم: (ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّن بَعْدِ مَا رَأَوُاْ الآيَاتِ لَيَسْجُنُنَّهُ حَتَّى حِينٍ) (یوسف ٣٥ ) القاموس المحيط مادة بدو: ٣٠٣/٤.(وەرگێڕ)

هەڵبەستراو یان ڕستەیەکی هەڵبەستراو یان بیرۆکەیەك کە لەگەڵ بنەماکانی بیروباوەڕ و بەڵگەنەویستە عەقڵییەکاندا نەگونجێت.

بیرۆکەی بەداءو سووربوون لەسەری‌و هێشتنەوەی لە کتێبەکانی زیارتنامەو فەرمودەکاندا باشترین نمونەیە بۆ سووربوون لەسەر دەستگرتن بە هەڵەوە (سووربوون لەسەر گوناه: العزة بالاثم) وەتا ڕەوشی شیعە وابێت ڕێگای ڕزگاربوون لەوەهمەکان سەخت‌و دژوارەو چاودێری خوایی هۆزێك ناگرێتەوە کە دەربارەیان وتویەتی: "هەندێك کەس مشتومڕ ئەکەن لەبارەی خواوە بەبێ هیچ زانستێك یان ڕێنموییەك یان کتێبێکی ڕوون" لقمان/ ٢٠

وەکو لەمەوبەر لەبەشی گەڕانەوەدا وتمان چەمکی بەداء بەلای زۆربەی زۆری شیعەکانەوە شتێکی نادیارو تەمومژاوییە بەڵکو بگرە هیچ شتێك، دەربارەی ناوەرۆکەکەی نازانن وە تەنانەت ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت لەمانای وشەکە وەڵامێکیان پێ نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، کە ئەمەش جێی داخ‌و خەفەتی زۆرە کە دۆزی شیعە بەبۆنەی سەرکردە مەزهەبییەکانەوە بەم ئاستە گەیشتووە، دەیان هەزار بەڵکو بڵێ سەدان هەزار شیعە هەن ئەم ڕستەیە دووپات دەکەنەوە "سلاوتان لێبێت ئەی ئەو دووکەسەی لەبارەی ئێوەوە خوا بەدائی بۆ پێش هات"[1]

ئەویش لەوکاتەی کە دەچنە سەر گۆڕی هەردوو ئیمامی عەسکەری (دەهەم‌و یانزەهەم) لە سامەڕا بۆ سلاو لێکردنیان.

شیعە هەرکاتێك بچنە سەرقەبری دوو ئیمامی دەهەم‌و یازدەهەم کە عەلی هادی‌و حەسەنی عەسکەرین چ بەتاك وە یان بەکۆمەڵ ئەم دەستەواژانە دووپات دەکەنەوە بێئەوەی مانای بەداء یان ئەم ڕستەیە بزانن کە دەڵێت:

---

[1] مفاتیح الجنان ص٩٢٩.

"يا من بدا لله في شأنكما"

"ئەی ئەو دووکەسەی کە خوا شتی نوێی بۆ دەرکەوت لەبارەیانەوە"

وەنە ئەو هۆیانەی لە پشتی دانانی ئەم ڕستەوەیەن وە نە ئەو مەترسییەی تێیدایە کە کەمکردنەوە دەسەڵاتو زانستو ویستو دانایی خوایە، بەڵام ئەوەی لەمە خراپترە ئەوەیە کە تاکو ئەمڕۆ هیچ زانایەك لە زاناکانمان هەڵنەساوە بەلابردنی ئەم ڕستەیە لە زیارەتنامەکان یان ڕێگری بکات لە خوێندنەوەی، وەکو سەدان ڕستەو دەستەواژەی تر کە کتێبەکانی زیارەتنامەو فەرمودەیان پڕکردووەو هەموویان پێچەوانەیە لەگەڵ بناغەی بیروباوەڕو گیانی ئیسلامدا.

بەنیسبەت مانای بەداءو ئەو بیرۆکەیەی کە تێیدایەو ئەو مەبەستەی تێیدایە لە زیارەتی هەردوو ئیمامی عەسکەری ئەوەیە کە ئیمامەت بە گوێرەی ئەو ڕیزبەندییەی هەیە لەبیروباوەڕی شیعەی ئیمامیدا لەباوکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کوڕی گەورە جگە لەحەسەنو حوسەین کە لە براوە گوێزرایەوە بۆ برا نەك بۆ کوڕی گەورەی حەسەن ئەویش بە پشت بەستن بە دەقێك کە لە پێغەمبەرەوە (د.خ) ڕیوایەت کراوە کە فەرمویەتی: "حەسەنو حوسەین دوو پێشەوان هەڵسن یان دانیشن"[1]

بەڵام ئەوەی ڕوویدا ئەوەبوو کە ئیسماعیل کە کوڕی گەورەی ئیمام جەعفەری صادق بوو کە ئیمامی شەشەمە لای شیعە لەسەردەمی باوکیدا کۆچی دوایی کردو ئیمامەت گوێزرایەوە بۆ موسای کوڕی جەعفەر کە کوڕی بچوکی ئیمامی صادق بوو، وە ئەم گۆڕانکارییە لە ڕێڕەوی ئیمامەتدا کە

---

[1] دیارە مەبەست لە فەرمودە هەڵبەستراوە ئەوەیە کە چ هەڵسن بۆ داوای ئیمامەت یان دانیشنو هەوڵی بۆ نەدەن وداوای نەکەن هەر ئیمامن.

پلەو پایەیەکی خواییە (خوا دیاری دەکاتو دایدەنێت. وەرگێڕ) پێی دەوترێت بەداء کە بۆ خوا ڕوویداو بەو پێیە ئیمامەتی خوایی لە ئیسماعیلەوە گوێزرایەوە بۆ موسای کوڕی جەعفەرو پاشان بۆ نەوەکانیو بەرێڕەوە سروشتییەکەی خۆیدا نەڕۆیشت کە گوێزانەوەی ئیمامەتە لە باوکەوە بۆ کوڕی گەورە.

بەڵام پرسیاری سەرسوڕهێنەر لێرەدا ئەوەیە کەبۆچی گۆڕینی ڕێڕەوی ئیمامەت ناونرا بەداءو ئاوها شتێکیان دایە پاڵ خوا لەمەسەلەیەکدا پێویستی نەدەکرد بۆ سەلماندنی پەنا ببرێتە بەر کەمکردنەوە لەدەسەڵاتی خوا، وەڵامەکەی لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارودۆخەی ڕوویدا لەسەردەمی یەکەمی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوعدا، چونکە کاتێك ئیمامەت لەخواوە بێت ملکەچ نابێت بۆ هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ وە ڕێڕەوی ناگۆڕێت بە مردنی ئیمامی شەرعی بەڵکو بەپێی ئەو دەستوورە خواییە کە ناگۆڕێت لەباوکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کوڕ، هەرلەبەرئەمەش بە ئیمامەت دەوترێت دروستکاری (تکوینی)[1] یە وملکەچ نابێت بۆ گۆڕانکارییە کاتیو شوێنییەکان هەروەکو هۆو ئەنجام کە لەیەکتر جیا نابنەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە باوك دەسەڵاتێکی نییە بە دیاریکردنی ئەو ئیمامەی کەلەدوای خۆی دێت چونکە بەویستی خوا دیاری کراوەو دانراوە.

ئەم ململانێیە هزرییە ڕاستەوخۆ پێش سەردەمی دیارنەمانی گەورە لەنێوان شیعە خۆیاندا ڕوویدا پێش ئەوەی بڵاوبێتەوە بە ئاسۆیەکی فراوانتردا

---

[1] خوا دوو ویستی هەیە، ویستی شەرعی (إرادە شرعیە) ئەویش ئەو شتانەیە کە داوای دەکات لەبەندەکانی لاباوەڕ و پەرستش کە بەندەکان تێیدا سەرپشکن ،وە ویستێکی دروستکاری (تکوینی) کە ویستی خوا جێبەجێ دەبێتو کەس ناتوانێت ڕێگری لێبکات وەکو خوا دەفەرموێت (إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ) (یس : ٨٢ ).

ئەویش کاتێك مەزهەبی ئیسماعیلی دەستی کرد بەسەرهەڵدان لەسەر گۆڕەپانی هزری ئیسلامی‌و یەکێتی شیعەی خستە مەترسییەوە، مەزهەبی ئیسماعیلی باوەڕیان وابوو کە ئیمامەت بەو شێوەیەی کە خوا ویستویەتی لە ئەزەلەوە بەردەوام دەبێت لە نەوەی عەلی بەپێی ئەو ڕیزبەندییە تەمەنییە، ئەمەش واتە باوك هیچ دەسەڵاتێکی نییە لە دیاریکردنی ئەو ئیمامەی لە دوای خۆی دێت چونکە بە ویستی خوا دانراوە، جا ئەگەر جێگری شەرعی مرد کە ئەویش ئیسماعیل بوو باوکی بۆی نییە موسای کوڕە گچکەی خۆی بکا بە ئیمام بەڵکو ئیمامەت دەگوێزرێتەوە بۆ کوڕی گەورەی ئیسماعیل، وەلەبەرئەوەی شیعەی ئیمامی بیرۆکەی ئیمامەی خواییان بەهەمان شێوە وەرگرتبوو بۆ ئەوەی دەربازبن لەم تەنگژەیە بیرۆکەی بەدائیان داهێنا بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی گوێزانەوەی ئیمامەت لە ئیسماعیلی کوڕی جەعفەرەوە بۆ موسای کوڕی جەعفەر بخەنە ئەستۆی خوا نەك ئەستۆی جەعفەری صادق‌و بۆ ڕوخاندنی عەقیدەی ئیسماعیلییەکان، وە هەورەکو دەزانین ئیمامەت لەنەوەی ئیسماعیلیەکاندا بەردەوامە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش‌و ئیمام لەنەوەی ئیسماعیلەو لە ژیاندایەو ئامادەیەو بەقەد تاڵە موویەك لەم بیرکردنەوەی کە مەزهەبەکەیان فەرزی کردووە بەسەریاندا لایان نەداوە.

دەگەڕێینەوە بۆ بیرۆکەی بەداءو دەڵێین: ئەم بیرۆکەیە لەکاتی سەرهەڵدانی تاقمی ئیسماعیلییەکان سەری هەڵداو یەکڕیزی شیعەکانی لەت کرد بۆیە تا سەرەتای سەدەی سێهەمی کۆچی هیچ شوێنەوارێك بۆ ئەم بیرۆکەیە نابینین لە هزری شیعەدا وە یەکەم ئیمام ئاخاوتنی لەگەڵدا دەکرێت بەوەی کە بەداء دەیگرێتەوە ئیمامی دەهەم‌و یازدەهەمە لەکاتێکدا کە ئیمام موسای کازم لەبەرترو گونجاوتربوو بەو شێوەیە ئاخاوتنی لەگەڵدا بکرێت چونکە بەداء لە حەقی ئەوداڕوویدا کەچی نەخۆی وە نە عەلی ڕەزای کوڕی

وە نە موحەممەدی جەوادی کوڕەزای بەشێوەیەك ئاخاوتنیان لەگەڵدا ناکرێت کە ئاماژە بێت بە ڕوودانی بەداء لە ئاستیاندا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پەنا بردنەبەر ئەم بیرۆکەیە لەوکاتەدا ڕوویدا کە تەوژمی ئیسماعیلی ڕێی خۆی دەبڕی بەرەو سەرهەڵدانو دروستبوون لەسەرەتای سەدەی سێهەمی کۆچیدا کە سەردەمی ئیمامی دەهەمو یازدەهەم بوو.

هەندێك لەزانا گەورەکانی شیعە پەنایان بردە بەر بەداء بۆ ئەوەی گۆڕانی ڕێڕەوی ئیمامەت لە ئیسماعیلەوە بۆ موسای کوڕی جەعفەر بسەلمێنن لەکاتێکدا کە ئیمامەتو گوێزانەوەی لە باوکەوە بۆ کوڕ بەو شێوەیەی کە شیعە دەیوت پێش سەردەمی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوع پێویستی بە داهێنانی بیرۆکەی بەداء و گۆڕینی ویستی خوایی نەبوو چونکە بەمردنی پاڵێوراوی ئیمامەت، ئیمامەت دەگوێزرایەوە بۆ پاڵێوراوی دووەم بەو شێوەیەی کە ئیمامی صادق کە مردنی کوڕە پاڵێوراوەکەی بۆ ئیمامەت بینی وەسیەتی کرد(بۆ کوڕی دووەم)و گومانیشی تێدا نییە کە قسەی خۆی کردووە دەربارەی ئەو ئیمامەی کە کاروباری فەتواو زانست دەگرێتە ئەستۆ دوای خۆی، وە قسەی ئیمامو دیاریکردنی جێگری شەرعی یەکلاکەرەوەیە[1]

---

نازانم نووسەر ئاگادار نییە یا لە بیری نەماوە چونکە دوای مردنی جەعفەری صادق شیعەکان ماوەیەکی زۆر سەرگەردان بوونو نەیاندەزانی کام کوڕی جێگرێتی، سەرەتا وتیان (عبداللە)ی کوڕی کە بە (عبداللە الافطح) ناسرابوو ئیمامە دوای باوکی بەڵام =ئەوەندەی پێ نەچوو عەبداللە مردو هیچ نەوەیەکی لێبەجێ نەما هەندێکیان وتیان نابێت ئیمام نەوەی نەبێت کەواتە ئەو ئیمام نەبوو، دەبێ یەکێکی تر بێت لە کوڕەکانیئیمام بێت دواجار بڕیاریاندا کە موسای کازم ئیمامە دوای باوکی، هەندێکیشیان لەسەر ئەوە مانەوە کە هەر عەبداللە ئیمامەو نەمردووە بەڵکو دیارنەماوە (غەیب بووە)و دەگەڕێتەوەو ناونران ئەفتەحییە.

بابەتی بەداء بەشێك لە كتێبەكانی شیعەی داگیركردووەو هەندێك لە گەورە زانایان بەشی تایبەت یان نامیلكەی تایبەتیان لەسەر نووسیوەو بەرگرییان لەماناو ناوەڕۆكەكەی كردووەو ئەو مشتومڕە سەری لەو لێكۆڵینەوە فەلسەفیو گوفتارییانەوە (كەلامی) دەرهێناوە كە بەشێكی زۆری لە كتێبە كەلامییەكان داگیركردووە لەژێر بابەتی ویستی خوایی‌و ئەجەلی حەتمی‌و تەقدیركراوو ئەو (قەدەر)ەی كە بەخۆپاراستنی مرۆڤ خۆی لێ لادەداتو ئەو بەڵایەی كەبە بەخشین دەگەڕێنرێتەوە.. هتد، لەو قسانەی كە زانایانو ئەوانەی كە ئاگایان لە ململانێی هزری نێوان ئەشعەرییەكانو موعتەزیلەو بیرمەندانی شیعە چارەسەرەكەیان بۆ دەرچوون لەو تەنگژەی بەداء لە جیاوازی خستنە نێوان نەسخی تەشریعی‌و نەسخی تەكوینییان دۆزییەوەو دەڵێن بەداء گۆڕینە لە تەكویندا، جا نازانم ئایا ئەوانەی دەربارەی بەداء قسەیان كردووە لەم ئایەتە پیرۆزەدا:

(يَمْحُو اللّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ) (الرعد: ٣٩ )..

خوا هەرچییەكی بوێت دەیسڕێتەوە یان دەیچەسپێنێ "

چارەسەریان دۆزییەوە بۆ ئەو كێشەیە ئەگەر كێشە بێت یان نا؟ وە هەرچییەك بێت ئەوانەی دەربارەی بەداء قسەیان كردووەو نووسیویانە جگە لەزیادكردنی هەڵە بۆ سەر هەڵەو سەفسەتە بۆ سەر سەفسەتە هیچی تریان زیاد نەكردووە، وە ئەگەر چارەسەری كێشەكەیان لەو ئایەتە پیرۆزەی

---

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە مەسەلەی ئیمامەت بەو مانایەی كە شیعە دەیلێن هەر لەئارادا نەبووە لەسەردەمی جعفر الصادق دا چونكە ئەگەر ئەو خۆی كێشەكەی چارەسەربكردایە تاقمی ئیسماعیلییە سەریان هەڵنەدەدا، ئەم مەرجارنەش كەدانراون بۆ ئیمامەت هەموو دواتر زانایانو قسەكەرانی شیعە (متكلمین) دایانهێناوە.(وەرگێڕ)

سەرەوەدا ببینایەتەوە ئەوا چاکترین ڕێگا بوو بۆیان بۆ دەرچوون لەو تەنگژەیەی خۆیان تێخستووەو سەریان لە کەمکردنەوەی دەسەڵاتو توانای خواوە دەرنەهێنا کە گوایە سەرەتا شتێکی دەویستو دوایی بۆی دەرکەوت کەشتێکی تر بکات.

## ڕاستکردنەوە:

لەمەوبەر وتمان ودووپاتی دەکەینەوە کە خەڵکی خوارەوەی شیعە ڕووبەڕووی کێشەیەکی هزری نابێتەوە کەناوی (بەداء)بێت، تەنانەت لەگەڵ خوێندنی ئەو ڕستانەش کە باسی کردن چونکە بەپەلە بەسەریاندا دەڕۆنو زۆر بایەخیان نادەنێ لەبەر ئەو ناڕوونیو تەمومژەی تێیدایە بەڵام ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە ئەم بیرۆکەیە لەزیاتر لەیەك شوێندا هاتووەو شیعە ئەو دەستەواژەیە بەیانیو ئێوارە دەخوێننەوە کاتێك دەچن بۆ سڵاوکردن لە دوو ئیمامەکەی سامەڕا وە گومانیشی تێدا نییە کە تا ئەمڕۆ نەمانبینیوە هیچ ڕۆژێك مەرجعێك لە مەرجیعەکانی شیعە یان زانایەك لە زاناکانیان فەرمانی بە لابردنی ئەم ڕستەیە بدات لەکتێبی زیارەتنامەکاندا کە زیاد لە دەیان بەرگەو هەروەها تاکو ئێستا هیچ کۆمەڵێك لەگەورە زانایانمان ناڕەزایی خۆیان لەم ڕستانە دەرنەبڕیبێت نە بەشێوەیەکی گشتی وە نە بە تایبەتی و بە ئاشکراو لەبەرچاوی خەڵکیدا وە هەروەها گومانی تێدا نییە کە بیرۆکەی بەداء لەو بیرۆکە دانراوانەو دەستەواژەکانیش هەروەها دانراوو هەڵبەستراون دراونەتە پاڵ ئیمامەکانو تێهەڵکێش کراوە لەناو ئەو قسانەی لەبەردەم گۆڕی ئیمامی دەهەمو یازدەهەمدا دەوترێتو کاتی هەڵبەستنیان دەگەڕێتەو بۆ سەردەمی یەکەمی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوع وەکو

لەمەوبەر سەلماندمان، لێرەوە جارێکی تر پێ دادەگرینەوە لەسەر بژارکردنی هەموو ئەو کەلەپوورانەی لەرابردووەوە بۆمان ماوەتەوەو تێکەڵی بیروباوەڕی شیعە کراوە چ ئەوانەی کەموکوڕی دەدەنە پاڵ خوا یان پێغەمبەری خواو خەلیفەکانی‌و ئیمامەکانی شیعە کە پێشەوای هەموو مسوڵماناتانن، وە لێرەدا دەگەینە دەرەنجامێکی زۆر گرنگ ئەویش ئەوەیە کە ئەوانەی لە پشتی ململانێی نێوان شیعەو تەشەیوع بوون لەپێناوی گەیشتن بەمەبەستو ئامانجەکانی خۆیان، خۆیان تەیاراستووە تەنانەت لە دەست درێژی‌و زمان درێژی بۆ سەر دەسەلاتی خواو سیقەتەکانی بۆ ئەوەی بگەنە ئامانجگەلێك کە پێچەوانەن لەگەڵ بنەماکانی بیروباوەڕو ژیری‌و لۆژیکدا، وە ئومێد بەخوا زۆرەو لەدڵەوە داوای لێدەکەم ئەم شەوە تاریکە بڕەوێنێتەوەو ڕۆژی ڕاستی بدرەوشێنێتەوە بەسەر دڵە بێگەردە ئامادەکان بۆ وەرگرتنی ڕاستی‌و بێ وچان هەوڵدەدەن بۆ سەقامگیرکردنی ئامانجەکانی ڕاستکردنەوە هەریەکەو بەپێی هەوڵو توانای خۆی‌و بەو شێوەیە شیعە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پەیامی یەکەم‌و ژیانێکی نوێ دەست پێدەکەتەوە.

## چەند سەرنجێك:

١ـ وەکو لەبەشی گەڕانەوەدا وتم بەداء شتێکی لاوەکی نییە لەبیروباوەڕی شیعەدا بەڵکو دەیان فەرمودەی لەسەر هاتووە لەزمانی ئیمامەکانیانەوەو لەباوەڕ پێکراوترین سەرچاوەیانەوە، ئەوەتا تەنها کولەینی کە گەورەترین‌و باوەڕپێکراوترین فەرمودەناسیانەو کتێبەکەی (الکافی) کەسێ بەشە: (اصول الکافی، فروع الکافی، **الروضة**) یەکێکە لە باوەڕپێکراوترین‌و گرنگترین سەرچاوەی فەرمودە لایان بەشێکی تەرخانکردووە بۆ بەداء لەناو بەشی

تەوحیددا کە ١٦ فەمودە لەخۆی دەگرێت (الکافی: کتاب التوحید، باب البداء: ١/١٤٦- ١٤٩.

وە مەلاباقری مەجلیسیش لە کتێبی بحار الانوار بەشی ٤ ل٩٢-١٩٩ لەژێر ناونیشانی (البداء والنسخ) حەفتا فەرمودەی هێناوەتەوە.

هەروەها ابن بابەویە القمی لە کتێبی (الاعتقادات) بەشێکی تەرخانکردووە بۆ بەداء ل٨٩ هەروەها لەکتێبی التوحید ل٣٣١دا.

هەروەها ئەم بابەتە لە کتێبەکانی عەقیدەو بیروباوەڕی زاناوهاوچەرخەکانیشدا ئاماژەیان پێداوەو ئاغا بزورگی تەهرانی لە کتێبی (الذریعة الی تصایف الشیعة)دا ئاماژەی بە ٢٥ کتێبی سەربەخۆ کردووە کە لەسەر بەداء نووسراون:

ئەمانەش هەندێك لەو دەقانە:

أـ "ما عبد الله بشیء مثل البداء"

واتە خوا بەهیچ شتێك وەکو بەداء دانە پاڵی نەپەرستراوە.

أصول الکافی: کتاب التوحید باب البداء ١/١٤٦، ابن بابویە القمی کتاب التوحید باب البداء ص٣٣٢، بحار الانوار الکتاب التوحید باب البداء ٤/١٠٧

بـ "ما عظم الله بمثل البداء" واتە: بەهیچ شێتێك ئەوەندەی بەداء خوا بەگەورە نەزانراوە، هەمان سەرچاوەی پێشووو هەمان لاپەڕە.

جـ "ولو علم الناس مافي القول بالبداء من الاجر مافتروا من الکلام فیە" واتە: ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە باوەڕبوون بەبەداء و قسەکردن لێی چەند پاداشتی هەیە ماندوو نەدەبوون لە قسەکردن دەربارەی.

هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

د- "ومابعث الله نبيا قط الا بتحريم الخمر وأن يقر لله بالبداء" واته: خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە ئیللا حەرام کردنی عەرەق‌و چەسپاندنی بەدائی بۆ خوا پێدا ناردوون.

٢- لەمانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کەبەداء شتێکی لاوەکی نییە لای شیعە بەڵکو شتێکی زۆر گرنگە بەتایبەت لەو سەردەمەی کە هێشتا بیروباوەڕی شیعەی ئیمامی بەم شێوەیەی ئێستا تەواووجێگیر نەبوو بوو، ئەو کاتە بیرو باوەڕی بەداء پشتی زۆری پێدەبەسترا بۆ دەربازبوون لەو تەنگژانەی تێی دەکەوتن، یەکێك لەوانە مەسەلەی مردنی ئیسماعیل بوو لە ژیانی باوکیدا کە پێشتر باوکی ڕایگەیاندبوو کە دوای خۆی پێشەوایەتی بۆ ئەوە، یەکێکی تر لەوانە دەرباز بوون بوو لەو ئیحراجییەی تێی دەکەوتن کاتێك یەکێك لە ئیمامەکان هەواڵی داهاتوویان دەدا بە شوێنکەوتووانیان‌و دواتر وا دەرنەدەچوو، بەم بیرۆکەی بەدائە خۆیان دەپەڕاندەوە وەکو یەکێك لەزاناکانی زەیدی کە سولەیمانی کوڕی جەریرە کەسەر بە تاقمی سولەیمانییەیە لە زەیدییەکان دەڵێت:

"ئیمامەکانی شیعە دوو شتیان داهێناوە بۆ شوێنکەوتوانیان کە بەهۆیانەوە هیچ درۆیەکیان لەسەر تۆمارنەکرێت ئەو دووەش بەداء و تەقییەیە" المقالات والفرق ص٧٨و فرق الشيعه للنوبختي ص٦٤

پاشان بەو شێوەیە ڕوونی دەکاتەوە: "سەبارەت بە بەداء، ئیمامەکانی شیعە کاتێك خۆیان خستە جێی پێغەمبەران لەشوێنکەوتوانیان لە زانیاریدان لەڕابردوو وداهاتوو پێیان دەوتن سبەینێ فلانە شت ڕوودەدات، ئەگەر ئەو شتە بەو شێوەیە ڕووی بدایە کە هەواڵیان دابوو پێیان دەوتن: پێمان نەوتن ئەم شتە ڕوودەدات و ئێمە لەلایەن خواوە ئەو شتانە دەزانین کە پێغەمبەران

دەیزانن‌و ئەوەی لە نێوان خواو پێغەمبەراندا هەبووە لەنێوان ئێمەو خواشدا هەیە.

وە ئەگەر ئەو شتە وا نەبوایە کە بەخەڵکیان وتبوو پێیان دەوتن: ئەوە بۆ خوا دەرکەوت کەئەو شتە وا نییە"

٣ـ لەهەمان کاتدا کە ئیمامەکان‌و زانایانی شیعە لەڕێگەی ئەو بیروباوەڕەوە خۆیان لەتەنگژەو هەڵوێستی ناهەموار دەربازدەکرد بەداء بووە مایەی تانەو توانج گرتنێکی زۆرِ لە شیعەی ئیمامی‌و تۆمەت بارکردنیان بەنەزانی‌و بێدەسەڵاتی دانە پاڵ خوا کە ئەمەش ڕوو بەڕووی ڕەخنەو ئیحراجییەکی زۆری کردبوون بۆیە دوای تەاوبوونی سەردەمی ئیمامەکان‌و بەرقەراربوونی دۆزی شیعە لەسەر سێ تاقمی سەرەکی، زەیدی‌و ئیسماعیلی‌و ئیمامی‌و کۆتایی هاتنی ئیمامەکانی شیعەی ئیمامی لە مەهدی چاوەڕوانکراوو دیارنەمانی لەبەرچاو شیعەکان بەهەموو شێوەیەك هەوڵ دەدەن یان ئەم مەسەلەیە لەبەرچاوی نەیارەکان بشارنەوە وە یا لێکدانەوەیەکی وای بۆ بکەن کە پەسەندکراوبێت ئەویش بەشوبهاندنی بەنەسخ‌و گۆڕین لەبواری شەریعەت و سڕینەوەی گوناە و گۆڕینی حاڵێك بۆ حاڵێکی تر لە ئەنجامی نزاو پاڕانەوە لە خوا.

ئاشکراشە گۆڕین لە شەریعەتدا جیاوازە لە بەداء چونکە یەکەمیان نەزانی تێدا نییە بەڵکو خوای گەورە هەر حوکمەی بۆ کاتێك داناوەو لەوەبەر دەیزانی کە هەریەك لەو حوکمە شەرعییانە بۆ چ کات‌و بۆ چەند دەشێن‌و کەی دەگۆڕدرێن بەڵام بەداء وا نییە بەڵکو بەو مانایە دێت کە خوا وایزانیوە فڵانە شت بەو شێوەیە دەبێت بەڵام دوایی بۆی دەرکەوتووە کەوا نییە یان وانەبێت چاکترەو بیگۆڕێت بەشتێکی تر.

واتە بەداء بەو دوو مانایەی لەسەرەتاوە ئاماژەمان پێدا مەحاڵە بۆ خوا.

٤ـ بیرۆکەی بەداء یەکێکە لەلایەنە لاوازو لەقەکانی مەزهەبی شیعە هەرلەبەرئەوەشە ئێستا هەوڵی شاردنەوەی یان نکوڵی لێکردنی دەکەن بەو مانایەی کە بەکاریان هێناوە بۆی، جا بۆیە دەبێت ئەوانەی دەیانەوێت ڕاستیو ناڕاستی مەزهەبی شیعە لەڕووی ئیمامەتەوە بزانن یا بیخەنەڕوو دەبێ زۆر بایەخ بەم بوارە بدەنو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن چونکە کەفیلە بە لەبنهێنانی عەقیدەی ئیمامەت لە بناغەوە، لەبەرگرنگی ئەم خاڵە هەڵیدەگرین بۆ کتێبێکی سەربەخۆ کەلەبەردەستماندایە دەربارەی بیروباوەڕەکانی شیعە إن شاء الله لەوێدا بەتێرو تەسەلی گفتوگۆی لەسەر دەکەینو دەیسلەمێنین چۆن بەبەداء دەتوانێ بیرۆکەی ئیمامەتی ئیلاهی لە بناغەوە بڕوخێنێ.

## ڕاستکردنەوە لەنێوان پەسەندکردن و ڕەتکردنەوەدا

ڕاستکردنەوەی بیرۆکە نامۆکانو بۆچوونە فەوتێنەرەکانو نادروستەکان قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خوا (د.خ)و ژیریو پێکهاتەی دروست پێویستی دەکەن، گومانیشی تێدا نییە کە ئەو ئامۆژگارییە کاریگەرانەی لەم سەرچاوانەوە هەڵدەقوڵێن دڵە سافو دەروونە ئامادەکان ڕادەکێشن بەلای خۆیانداو پۆل پۆل بەرەو ڕاستی دەیانبەن.

ڕاستکردنەوە لەنێوان پەسەند کردنو ڕەتکردنەوەدا:

ئەو بیرۆکە ڕاستکارییە کە یەکەمجارە لە مێژووی شیعەو تەشەیوعدا بانگەوازیمان بۆ کردووە گومانی تێدا نییە کە ڕووبەڕووی کاردانەوەی جۆراو جۆر دەبێت لە ئاستی جیهانی شیعیدا، ئەویش بەپێی ئەو ژینگەیەی کە بانگی چاکسازییەکەی دەگاتێ، وە شتێکی سروشتییە کە کۆمەڵانێك لە پیاوانی ئایینیو بازرگانانی تایەفەگەرێتیو لەسەروویانەوە سەرکردە ئایینییەکان بەهەموو هێزو توانایەك بەرهەڵستی ئەم بیرۆکە ڕاستکارییە بکەن:

لەوانەیە لۆمەی ئەوانە نەکەین لەبەر ئەو کاردانەوانەی نیشانی دەدەن کە هەندێکیان توندوتیژن چونکە مەترسی ڕاستکردنەوە هەڕەشە لە دەسەڵاتو پلەو پایەیان دەکات کە ئاواتێکی پانو بەرینیان لەسەر بنیات ناوە، بەڵام ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە زۆرینەی گەورە لە چینی ڕۆشنبیری هۆشیار لەرۆڵەکانی شیعە دێن بەدەم بانگەوازی ڕاستکردنەوەو وەکو بینایەکی پتەو لە پشتییەوە دەوەستن چونکە سەرفرازی دونیاو دواڕۆژی تێدایە.

لێرەدا دەمەوێت ئامۆژگارییەك ئاراستەی ئەو چینە هۆشیارە بکەم کە ئومێدی ڕاستکردنەوەمان لەسەر بنیات ناوەو پێیان بڵێم کە قسەی ڕاستی

خۆی پشتیوانی لەخۆی دەکاتو پێویستی بە توندوتیژی نییە لەبانگەشە بۆ کردنداو لە پێغەمبەری خوادا (د.خ) نمونەو پێشەنگێکی باشمان هەیە کە خوای گەورە پێی دەفەرموێت: "وە ئەگەر توندو دڵڕەق بوویتایە دەوریان چۆڵ دەکردی" آل عمران ١٥٩

وە لەشوێنێکی تردا دەفەرموێت: "بانگەواز بکە بۆ ڕێگای پەروەردگارت بەدانایی‌و ئامۆژگاری چاكو بە باشترین شێوە گفتوگۆیان لەگەڵ بکە" نحل/١٢٥.

بۆیە پێویستە لەسەر هەموو تاکێك ئەرکی بانگەواز بۆ ڕاستکردنەوە بگرێتە ئەستۆو ڕێگەی باش‌و دوور لەتوندوتیژی بگرێتەبەر لە ئاخاوتن لەگەڵ بەرامبەردا بەتایبەت پیرو بەتەمەنەکان چونکە ئەستەمە لەسەر خەڵکانێك گەیشتبنە تەمەنێکی زۆر گەورە بتوانن دەست هەڵگرن لەو نەریتانەی لە منداڵییەوە ڕاهاتوون لەسەری‌و خوویان پێوەگرتووەو مەشقیان پێکراوە لەسەری، بۆ نموونە کەسێك کە لە منداڵییەوە ڕاهاتبێت لەسەر پەنا بردنە بەر غەیری خواو بە وشەی (یا) بانگی بکات چ ئەو کەسە پێغەمبەر بێت یان ئیمامی عەلی بێت ناتوانێت لەنێوان شەوو ڕۆژێکدا دەستی لێ هەڵبگرێت.

زۆرێك لە شیعە داوای یارمەتی لە غەیری خوا دەکەن، ناشزانم بۆچی ئێمەی شیعە واز لەخوای بەتواناو دەسەڵاتدار دێنین‌و پەنا دەبەینە بەر کەسانی تر لەکاتێکدا کە خوا فەرمانی پێداوین تەنها پشت بەو ببەستین:"تەنها تۆ دەپەرستین‌و تەنها داوای یارمەتی لەتۆ دەکەین" الفاتحە ٥.

ئەو خوایەی کە بەم شێوەیە لەگەڵ بەندەکانیدا دەدوێت: "لێم بپاڕێنەوە من وەڵامتان دەدەمەوە" غافر/٦١

وە لەشوێنێکی تردا دەفەرموێت: "وە ئێمە بۆ مرۆڤ نزیکترین لەشادەماری دڵی" ق/١٦.

نمونەیەکی تر: ئایا بە ئاسانی دەتوانی وا لە شیعە بکەیت دەست هەڵگرن لە سوجدە بردن لەسەر خۆڵی حوسەینی کەلەشێوەی جۆراوجۆردا دروستکراوەو دەبینن سەرکردە ئاینییەکانیان لەنوێژەکانیاندا سوجدەی لەسەردەبەنو مزگەوتەکانیان پڕن لێی؟

ئایا بە ئاسانی دەتوانی وا لە شیعە بکەیت دەستهەڵگرن لەناونانی منداڵەکانیان بەبەندایەتی بۆ غەیری خوا وەکو (عبدالحسین، عبدعلی، عبدالعباسو عبدالزهره...)؟

ئەم دیاردەیەش لەلای غەیری شیعە نابینین تەنانەت لەناو ئاینەکانی تریشدا، وە شیعە تاقە تایەفەن کە ڕێگەی بەندایەتی بۆ غەیری خوا تەنانەت لەناونانیشدا دەگرێتەبەر، وە ئەگەر لاپەڕەکانی مێژووی ئیمامەکانی شیعە هەڵدەینەوە هەر لە ئیمامی عەلییەوە تا دوا ئیمام کەسێکیان نابینیت منداڵەکانیان بەبەندە بۆ غەیری خوا ناو نابێت، وە نازانم لەکەیەوە شیعە دەستی کردبە ناونانی منداڵەکانیان بەم ناوانەی پێچەوانەی ڕۆحی ئیسلامن، چونکە بەندایەتی تەنها بۆ خوایە نەك بۆ کەسی تر، وە مرۆڤ نابێت بەبەندەی مرۆڤێکی تر هەرچەند ئەو مرۆڤە پلەوپایەی بەرزبێت لای خوا.

جارێکی تر دەگەڕێمەوە بۆ ئەوەی جەخت لەسەر چینی بانگهێشتکەر بۆ ڕاستکردنەوە بکەمو بڵێم: گۆڕینی ئەم لارییە فکرییە لای شیعە ناکرێت لەنێوان شەوو ڕۆژێکدا ئەنجام بدرێت بەڵکو پێویستی بەکاتو کۆششو دان بەخۆداگرتنو ڕۆشنبیرکردنەوە هەیە بۆ ئەوەی بچێتە دڵەکانەوە و لەبەرئەوە بەرپرسیارێتییەکە گەورەیە پێویست دەکات هەنگاو بەهەنگاو لەسەری بڕۆین

بەتایبەت گەر ئەوە بزانین کە ڕاستکردنەوە ڕووبەڕووی بەرهەڵستییەکی توند دەبێتەوە لەلایەن ئەوانەی ئاماژەمان پێدان لەسەرەتای ئەم بەشەدا، هەروەها نابێت ئەو هێزە داگیرکەرانە لەبیر بکەین کە تاکو ئێستا لەپلان گێڕاندان دژی مسوڵمانانو هەوڵدەدەن دووبەرەکی لەنێوانیاندا بنێنەوەو لەڕێگای پێنوسگەلێکی بەکرێ گیراوە کەلەسەر دووبەرەکی نانەوەو وروژاندنی ڕقو کینە دەژین لە ڕووی بزاڤی ڕاستکردنەوەدا بوەستێتو لەو پێناوەدا هیچ کۆششێك بەفیڕۆ نادات، لەولاشەوە کۆمەڵانێکی ساویلکە کە ئیمامی عەلی بەم شێوەیە باسیان دەکات: "خەڵکانێکی ناکەسی هەرچیو پەرچی کەلەگەڵ هەموو بایەکدا لاردەبنەوەو دوای هەموو بانگکەرێك دەکەونو بەنوری خوا دڵیان ڕۆشن نەبۆتەوە"

کەلەسەر ڕێچکەی سەرکردە مەزهەبییەکانیان دەڕۆنو بەفەرمانی ئەوان هەڵدەسوڕێنو جێبەجێکەری هەموو ئەو بیدعەتانەن کە بەدرێژایی چەندین سەدە لکێنراوە بە مەزهەبی شیعەوە، ئەم هەموو هێزانە لەپلانێکدا کۆدەبنەوە بۆ لێدانی بزاڤی ڕاستکردنەوە بەڵام من پێش وەخت دەڵێم ڕاستکردنەوە زۆر لەوان گەورەترەو سەرەنجام سەردەکەوێت بەسەریاندا، لەبەرئەوە چوون بەگژی ڕاستکردنەوەو وەستان لەدژیدا بەر دیوارێکی گەورەی ڕەق دەکەوێتو هیچ هێزێك ناتوانێت بیبڕێت چونکە ئێمە بنەماکانمان لەسەر کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرو قسەو کردەوەی ئیمامی عەلی کە زانایانی مەزهەبی شیعە بەبەڵگەی دەزانن لەسەر خۆیانو کۆڵەکەی ژێری کەزانایانی شیعە بە کۆڵەکەی چوارەمی هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکانی دەزانن داناوە، وە ئەم چوار کۆڵەکەیە بەڵگەن لەسەر زانایانی شیعەو ناتوانن لێی لابدەن یان دژی بوەستن.

لێرەدا پێویستە بگەڕێمەوە بۆ سەرەتاو بە ڕاشکاوی ئاماژە بدەین بەوەی کە کتێبەکانی فەرمودەی شیعە بەتایبەت ئەوانەیان کە بەڕاستو متمانە پێکراو دادەنرێن بە گوێرەی بۆچوونی زاناکانمانو خاڵی نین -وەکو وتمان- لە ڕیوایەتگەلێك کە دراونەتە پاڵ ئیمامەکانمانو پێچەوانەن لەگەڵ بنەماو شتە بەڵگەنەویستەکانی ئیسلامداو پێچەوانەن لەگەڵ ئەو چوار بەڵگەیەی کە زانایانی شیعە بە بناغەی دەزانن بۆ هەڵهێنجانی حوکمە شەعرییەکان، ئەم جۆرە ڕیوایەتە (فەرمودە) هەڵبەستراوانەی لەم کتێبانەدا هەنو دراونەتە پاڵ ئەو ئیمامانەی شیعە کە فەرمانیانداوە بە بەلاوەنانی ئەو ریوایەتانەی پێچەوانەی کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرن لەوانەیە بکرێنە بەهانە بۆ وەستان لەڕووی ڕاستکردنەوەو ئامانجەکانیدا.

لەبەرئەوە داوا لە چینی ڕۆشنبیری هۆشیار گە بەپشتیوانی یەکەمو کۆتایی بزاڤی ڕاستکردنەوەی دەزانین دەکەین کە کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرو ژێری بکەن لە دادوەر لەهەموو فەرمودەیەکدا کە هەندێك لەزاناکانمان پشتی پێ دەبەستن بۆ چەسپاندنی ئەو بیدعەتانەی لکێنراون بە مەزهەبی شیعەوەو هەرتاکێك خۆی بێتە داوەرو قازی لەهەرشتێکدا کە دەدرێت بە گوێیدا لە شتی پوچو بەکەڵكو ڕاستو هەڵە کەبە ناوی ڕیوایەتی ئەهلی بیتەوە هاتووە، وە ئەمە تاقە ڕێگەی ڕزگاربوونە لەو کۆتو بەندانەی دڵو عەقڵی شیعەکانی بەدرێژایی مێژوو بەستۆتەوە.

جیهان پێش زیاتر لە ساڵێك گوێی لەیەکێك لەسەرکردەکانی مەزهەبی شیعە بوو کە بەرامبەر جەماوەرێکی شیعەدا لەتاران وتاری دەخوێندو قسەکانی پەخش دەکرا دەیگوت: "جبرائیل دادەبەزی بۆ سەر فاتیمەی زەهرا دوای مردنی باوکیو دەربارەی زۆرشت لەگەڵیا دەدوا"

مسولْمانیش بیرو باوەڕیان وایە کە ئەم قسەیە دژو ناکۆکە لەگەڵ سەرەتاکانی ئیسلامو بیروباوەڕە بناغەییەکانی کە کۆتایی هاتنی نیگا (وەحی)یە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ).

ئەم قسەیەی لەسەر زمانی ئەم زانایە هاتەدەر بەپشت بەستن بوو بەو ریوایەتە هەڵبەستراوانەی کە چەندین جار داوای بێژانی کتێبە شیعەییەکانمان کردووە لێیان.

بەڵام لەوە خراپتر ئەوەیە کە ئەم جۆرە قسەیە ڕووبەڕووی نارەزایی‌و نەبوویەوە لەلایەن هاوشێوەکانی ئەو زانایەو هاورێکانییەوە، بەڵکو گەردن کەچ بوون بۆ ڕاستی ئەم ڕیوایەتە بەبێدەنگ بوون لە ئاستیدا کەنیشانەی ڕازی بوونە پێی، لەبەرئەوە ئێمە بەهەمیشەیی بەرپرسیارێتی گەورەی ئەو بیدعەتانەی لکێنراون بە مەزهەبی شیعەوە خستۆتە ئەستۆی سەرکردەو زانایانی مەزهەبەوە کە هەڵوێستیان یان پشتگیری بووە یان بێدەنگی، ئەوە ئیمامی عەلییە لەکاتی شۆردنی پێغەمبەرو کفن کردنیدا ڕووی تێدەکات‌و دەڵێت: "دایك‌و باوکم بە فیدات بن بەمردنی تۆ شتانێك بڕان کە بەمردنی غەیری تۆ (لە پێغەمبەران) نەبڕان لە پێغەمبەرایەتی‌و هەواڵی ئاسمان"[1]

دوای ئەم هەمووە ئاخۆ ئەوانەی ڕاستکردنەوە ڕەت دەکەنەوە چ ڕێگەیەك دەگرنە بەر کاتێك بەڵگەو ڕاستییەکان لەگەڵیاندا نابن؟

تەنها ڕێگایەك هەیە خاوەنی دەروونە نەخۆشەکان‌و نەزانەکان‌و بەکرێ گیراوەکان بیگرنە بەر ئەویش ناشیرنکردن‌و بریندارکردنی خاوەنی ئەم بانگەوازو بۆچوونەن وەکو هەموو ئەوانەی کە خوا لە قورئانی پیرۆزدا باسی کردوون بەم ئایەتە: (وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِن بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَاثاً

---

[1] نهج البلاغه ج۳ ل۲۲۸.

تَتَّخِذُونَ أَيْمَانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَى مِنْ أُمَّةٍ إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ اللّهُ بِهِ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ) (النحل: ٩٢ )

"وەکو ئەو ئافرەتە مەبن کە ڕیسەکەی کردەوە خوری لە پاش بادانو ڕستنو شەتەکدانی، سوێندو پەیمانەکانتان دەکەن بەهۆی ناپاکیو فرِوفێڵ لە نێوانتاندا لەبەرئەوەی دەستەو کۆمەڵێك زۆرترو بەهێزترە لە دەستەو کۆمەڵێکی تر، خوا بەوە تاقیتان دەکاتەوەو سوێند بەخوا لەڕۆژی دواییدا بۆتان ڕوون دەکاتەوە ئەو شتانەی ئێوە تێیدا جیاوازبوون"

(وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلا هُدًى وَلا كِتَابٍ مُّنِيرٍ* ثَانِيَ عِطْفِهِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ اللهِ لَهُ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَنُذِيقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَذَابَ الْحَرِيقِ) (الحج: ٨-٩ ).

لەناو خەڵکیدا کەسی وا هەیە مشتومڕ دەکەن دەربارەی خوا بەبێ هیچ زانیاریو شارەزاییەك (بەڵگەیەك) وە بەبێ کتێبێکی ڕوونکەرەوە (لەلایەن خواوە) ڕوو لەڕاستی وەردەگێڕێ بۆ ئەوەی خەڵك لەڕێگەی خوا لابدات (گومڕایان بکات)، ئەو کەسە لە دونیادا سەرشۆڕ دەبێو لەڕۆژی دواییشدا سزای ئاگری پێدەچێژین"

## پاشکۆ:

**خوێندنەوەیەك بۆ ئەو كتێبەی لە وەڵامی كتێبی شیعەو ڕاستكردنەوەدا دەرچووە:**

شتێکی چاوەڕوان کراوە کە نووسەر کە شتکی وا گرنگ و هەستیاری نووسیوە شیعە لێی بێدەنگ نەبن و وەڵامی بدەنەوە، وەبۆ ئەوەی ئیشەکەی ئێەش تۆکمەتر بێت بە پێویستم زانی خوێنەر ئاشنا بکەم بە یەکێ لەو کتێبانەی لە وەڵامی د. موسەویدا دراوەتەوە، ئەویش کتێبی: **مع الدكتور موسى الموسوي في كتابة الشيعة والتصحيح** لە نووسینی د.علاء الدين **بن السيد امير محمد القزويني** کە لەلایەن لایەن (سەنتەری غەدیر بۆ لێکۆڵینەوە ئیسلامییەکان)ـەوە چاپ کراوەو پێشەکییەکی بۆ نووسراوە. ئێمە چاپی دووەمی ئەو کتێبەمان لە بەردەستە کە سالی١٤١٤ك-١٩٩٤ز کە ٣٥٤لاپەرەیە لە قەوارەی مام ناوەند.

تا ئێستا نەمزانیوە کتێبی تر لە وەڵامی ئەو کتێبەدا نووسرابێتەوە ئەگینا پەیدام دەکردو خوێندنەوەم بۆ ئەویش دەکرد.لەو باوەڕەشدام کە هەر کتێبێکی تریش بنووسرێ هەر هەمان بیرۆکە دووبارە دەکاتەوە چونکە هەموو شیعە هەمان شت دەڵێنەوەو لەوە زیاتریان پێ نییە کە ئەم نووسەرە نووسیویەتی مەگەر زیادکردنی هەندێك ئایەت و فەرمووده لەسەر هەمان ئەو باباتانەی کە نووسەر هێناونەتیەوە:

خوێندنەوەکەشم لەم خاڵانەدا کورت دەکەمەوە:

١ سەنتەری غەدیرو نووسەریش لە پێشەکییەکەیدا هەوڵیان داوە کەسایەتی د. بڕوشێنن بە هەڵبەستنی تۆمەتی جۆراوجۆرو، هەر لە مەسەلەی ئەخلاقییەوە تا خیانەتی سیاسی ومالّی و تۆمەتبارکردنی بە

سیخوڕی وخۆفرۆشی و ئیشکردن بۆ دەستەودایەرەی بیانی و دژ بە ئیسلام و گاڵتە کردن بە بڕواتامەکانی و هتد.

ئەمەش ڕێك ئەو ڕووداوەم بە بیردێنێتەوە کە لە سیرەدا هاتووە، ئەویش ئەوەیە کە یەکێك لەزانا گەورەکانی جوولەکە بەناوی عبدالله بن سلاّم چوو بۆلای پێغەمبەرو موسوڵمانێتی خۆی ڕاگەیان و بە پێغەمبەری وت بنێرە بە دوای جوولەکەکاندا با بێن و پرسیاری منیان لێ بکە و دوایی هەواڵی موسوڵمان بوونی منیان پێ ڕاگەیەنە. پێغەمبەر (د.خ) ناردی بە دوای جوولەکەکاندا و کاتێك هاتن عبد الله لە پشتی پەردەیەکەوە خۆی حەشاردا بۆ ئەوەی نەیبینن. پێغەمبەر (د.خ) لێی پرسین: چی دەڵێن دەربارەی عبدالله ی کوڕی سەلاّم ؟ وتیان: ئەوە سەروەری ئێمەیەو کوڕی سەروەرمانە. پێغەمبەر فەرمووی: ئەی دەڵێن چی ئەگەر ئەو موسوڵمان بێت و باوەڕ بە من بێنێ ؟ وتیان هەرگیز شتی وا ڕوونادات. لەو کاتەدا عبدالله هاتەوە دەرەوەو وتی أشهد ان لا اله الاّ الله وأشهد أن محمدا رسول الله. یەکسەر جوولەکەکان هەڵوێستیان گۆڕی و وتیان ئەوە نەفامترین کەسی ناو ئێمەیەو هیچ ڕێزێکی نییە لامان.

لێرەدا سەنتەری غەدیرو نووسەریش کەوتوونەتە هەمان حاڵەتەوە: جگە لە هەڵبەستنی تۆمەتی ئەخلاقی بۆ نووسەر -کە حەتمەن درۆن — ئەگەر ڕاست بن گەندەڵی ئەو ناوەندە دەردەخات کە زانایانی شیعەو مەرجیعەکانیانی تێدایە ئەگینا چۆن بڕواتامەی ئیجتهاد دەدەن بە کەسێك ئەوە ڕەوشت و ئاکاری بێت؟ بۆ تا ئەو ڕەخنانەی نەگرت پیاوی باشبوو؟..

ئەگەر شیاو نەبوو بۆ ئەو پلەیە لە ڕووی زانستییەوە بۆ پێیان بەخشی؟ بە خاترانە لەبەر باپیری؟

ئەگەر وابێت ئەمیش هەر گەندەڵی ئەو دەزگا زانستییە دەردەخات کە زانایان دەردەچێنێت ئەوە دەگەیەنێت کە بڕوانامە لەسەر بنەمای زانستی نادرێت بەڵکو لەسەر بنەمای تر !.

نووسەر تۆمەتبار دەکەن بەوەی کە بەدوای ناوبانگ و شوهرەت و سەروەت و سامانێدا گەڕاوە و لە بەر بۆ هەموو لایەنێك ئیشی کردووە کە پارەی دابێتێ!

ئەمەش پێچەوانەی واقیع و ژیانی نووسەرە: ئەگەر نووسەر کوڕەزای مەرجیعی گەورەی ئەو سەردەمەی شیعە بێت چۆن لە بەر پارەو سامان پەکی دەکەوێت؟ هەمووشمان دەزانین کە پارە چۆن بە لێشاو لەبەردەست مەرجیعەکانیدایە!

کەسێك لە ساڵی ١٩٥٥زدا هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا بێت کەلەو کاتەدا نەك بڕوانامەی دکتۆرا بەڵکو بەکالۆریۆسیش وەکو دەرمان وابوو چۆن بۆ ژیان پەکی دەکەوێت؟ نەك هەر ئەوەش بەڵکو بڕوانامەی دکتۆرا لە زانکۆی سۆربۆن لە ساڵی ١٩٥٩ز کە یەکێکە لە زانکۆ جیهانییەکان. یەکێك لەو ساڵەدا هەڵگری ئەو بڕوانامەیە بێت لە بواری فەلسەفەدا پەکی لەبەر بێ پارەیی دەکەوێت؟

کەسێك لە زانکۆکانی ئەمریکادا وانە بڵێتەوە پەکی لەسەر پارەو شوهرەت دەکەوێت؟

٢. سەنتەری غەدیرو نووسەریش هەوڵ دەدەن لە نرخی زانستی نووسینەکە کەم بکەنەوە بەوەی کە گوایە هەڵەی زمانەوانی و فەلسەفی تێدایە و نووسەر شیاوێتی نووسینی نییە لەو بوارەداو سەنتەری غەدیر مەرجێکی بێبنەما دادەنێت بۆ نووسین لەو بابەتانەدا ئەویش ئەوەیە کە

هەرکەسێك بیەوێت لە سەر بیروباوەڕێك بنووسێت دەبێت خۆی سەر بەو لایەنە بێت و وەکو چۆن نابێت مەسیحییەك لە سەر ئیسلام بنووسێت یا مارکسییەك لە سەر دین و ئەخلاق بنووسێت بە هەما شێوە موسەوی بیروباوەڕی لەق بووە بە بنەماکانی شیعە لەبەر ئەوە بۆی نییە لەسەر شیعە بنووسێت.

لەوەڵامدا دەڵێین:

یەکەم: ئەگەر هەڵگری بڕوانامەی ئیجتهاد لە حەوزەی نەجەف و دکتۆرای شەریعە لە زانکۆی تاران و فەلسەفە لە زانکۆی سۆربۆن بۆی نەبێت لە مەسەلەیەکی ئاوهادا بنووسێت کە پەیوەندی بە فکرو عەقیدەوە هەیە ئیتر کێ بۆی هەیە ؟

دووەم. ئەگەر بەو لۆژیکەی نووسەر بێت موسوڵمانیش بۆی نییە لە سەر مارکسییەت و مەسیحییەت و یەهودییەت بنووسێت. ڕاستی ئەم مەسەلەیەش بەم شێوەیەیە: هەموو کەسێك بۆی هەیە لە هەموو مەسەلەیەك بنووسێت بەو مەرجەی یەکەم: زانیاری هەبێت لەو بوارەدا و لێی تێگەیشتبێت، دووەم: شتەکانی لە سەر بەڵگە بن نەك لە خۆیەوە قسە بکات، سێیەم: دەست پاك بێت لە نەقڵی بەڵگەکاندا و تەنها ئەو شتانە نەقڵ نەکات کە لە گەڵ بۆچوونەکەی خۆیدا دەگونجێت و ئەوانە بشارێتەوە یا پشت گوێ بخات کە لە گەڵ بۆچوونەکانیدا ناگونجێن.

پاشان سەنتەری غەدیر حەوت شت دێنێتەوە کە گوایە بەڵگەنامەی ساواکی زەمانی شان و تێیدا موسەوی تۆمەتبار دەکات بە بەدڕەوشتی و بێ ئیشی وهەڵپەکردن بە دوای شوهرەت و پارەوپولداو ........هتد.

ئێمەش لەم نووسەرانە دەپرسین ( لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەم شتانە ڕاست بن و لەلایەن ساواکەوە دەرچووبن!): ئایا ئێوە تا چەند متمانە بە

هەڵسەنگاندنەکانی ساواك و ڕاپۆرت و بەڵگەنامەکانی دەکەن دەربارەی نەیارەکانی ڕژێمی شا؟ ئەگەر کەسێك ڕاپۆرتەکانی ساواك بکاتە بەڵگە بە سەر کەسێکی وەکو ئیمامی خومەینی یا هەرکەسێکی ترەوە ئێوە چی پێ دەڵێن؟.

نووسەر لە باسی بەڵگەنامەی ئیجتهادەکەی موسەویدا کۆمەڵێك هەڵەی زمانەوانی و ڕێنووسی ڕیز کردووە کە من لەم چاپەی کە وەرمگێڕاوەتە سەر کوردی نەمبینین و ئەوە بەدوور دەگرێت کە هەڵەی چاپ بن و بینای ئەوەیان لە سەر دەکات کە موسەوی ئەهلی ئیجتهاد نییە. لە وەڵامدا دەڵێین: ئەگەر چی زمان گرنگە بۆ دەربڕین بەڵام هەڵەی زمانەوانی لە نرخی زانستی و هزری نووسینێکی واکەم ناکاتەوە کە لە سەر مەسەلەیەکی فکری و عەقیدەیی نووسراوەو هەوڵ دەدات لە فەلسەفەی ئەو بۆچوونانە بکۆڵێتەوە و بەرەگو ڕیشەیاندا بچێتە خوارەوەو لەڕووی ژیری و لۆژیکەوە لێکیان بداتەوە . نووسینەکە لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی نییە تاوەکو هەڵەی زمانەوانی یا ڕێنووسی نرخە زانستییەکەی نەهێڵێت. هەروەها مەسەلەکە هەڵێنجانی حوکمی شەرعی نییە لە ئایەت و فەرموودە تاوەکو زمان ڕۆڵێکی سەرەکی تیا ببینێت بەڵکو شیکردنەوەی هەندێك بیروبۆچوونە لەسەر بنەمای هەندێك ڕووداووهەڵوێست و قسەی ئیمامانی ئەهلی بەیت بەتایبەت ئیمامی عەلی. لەم حاڵەتانەدا زانینی وردەکارییە زمانەوانییەکان بایەخێکیان نییە.نموونە لەسەر ئەم مەسەلەیە جیاوازی نێوان ئیعجازی زمانەوانی و ئیعجازی زانستی و عەقیدەیی و ئەخلاقی و تەشریعی قورئانە، ئیعجازی زمانەوانی بۆ ئەوانە زۆر گرنگەو بەباشی لێی تێدەگەن کە زمانی عەرەبی باش دەزانن بەڵام بۆ ئەو کەس و میللەتانەی عەرەبی نازانن ئیعجازی بەلاغی قورئان ئەو بایەخەی

نییەو ئەو تامەی نییە بەڵکو دەبێ بایەخ بە لایەنەکانی تری ئیعجازی قورئان بدرێت کە پەیوەندی بەزمانەوە نییە. هەوڵی بێ نرخ کردنەکەی موسەویش لەبەر ئەوەی کە گوایە هەڵەی زمانەوانی و رێنووسی تێدایە وەکو هەوڵی ئەو مەلا نەخوێندەوارە وایە کە کاتێك ویستی مەلایەکی شارەزا لەبەرچاوی خەڵکی نەخوێندەواری دێیەك بخات خەڵکەکەی کۆکردەوەو داوای لەو مەلایە کرد کە بنووسێ مار، مەلاکە نووسی مار (میم و ئەلف و رێ)، ئەمیش هەڵسا وێنەی مارێکی کێشاو لە خەڵکەکەی پرسی کامیان مارە ؟ خەڵکەکەش وتیان ئەمەی تۆ مارە. بەو شێوەیە ئەو مەلایەی لەو لادێیە دەریەڕان. ئەمانیش دەیانەوێت بەم شێوازانە نووسینەکەی مووسەوی لەبەرچاوی خەڵکی بخەن نەك لە ڕووی گفتوگۆی بیرۆکەکانیەوە.

دەربارەی ناوەڕۆکی کتێبەکەش ڕاستی ئەو قسانەمانە دەردەخات کە لە لێکۆڵینەوە شیکارییەکەماندا نووسیومانە، ئەویش ئەوەیە لە جیاتی ئەوەی دەست لە بۆچوونە هەڵەکانیان هەڵگرن و ئەو ڕاوییانە تۆمەتبار بکەن کە ئەو جۆرە ریوایەتانەیان هێناوەتەوە هاتوون هەوڵی ئەوەیان داوە ڕەگ و ریشە بۆ ئەو شتانە بدۆزنەوە لە قورئاندا و گشتگیری بکەن بەسەر هەموو موسوڵماناندا و ڕافەی سەیرو سەمەریان بۆ بکەن. بۆ نموونە لە باسی تۆمەتبار کردنی شیعە بەوەی کە باوەڕیان بە دەسکاری کردنی قورئان هەیە لە جیاتی ئەوەی نووسەر بێت ئەو ڕاوی و زانایانە مەحکوم بکات کە ئەو ریوایەتانەیان هێناوەتەوەو ئەو قسانەیان داوەتە پاڵ ئیمامەکانیان هاتووە کۆمەڵێك فەرموودەی لە بوخاری و موسلیم و سەرچاوەسوننییەکانی ترەوە هێناوەتەوە کە لەسەر ناسخ و مەنسەخەو پەیوەندییان بە خوێندنەوەکانی قورئانەوە هەیە ویە خوێندنە شازەکانەوە هەیە و کردوونیەتی بەبەڵگە لەسەر

ئەوەی کە زاناکانی سوننە باوەڕیان بە ڕوودانی گۆڕانکاری هەیە لە قورئاندا. بێئەوەی ئینصاف بە خەرج بدات و بڵێت زانایانی سوننە ئەو فەرموودانەیان لە بابی ناسخ و مەنسوخ وقیرائاتدا هێناوەتەوە بەڵام زانایانی شیعە لە ژێر ناونیشانی دەسکاری کردن و گۆڕینی بە ئەنقەستی سەحابە بۆ قورئان ئەو ریوایەتانەیان هێناوەتەوە.

لە بەشی ئیمامەتیشدا نووسەر کۆمەڵێك ئایەت و فەرموودەی ڕیز کردووە وەکو بەڵگە لەسەر ئیمامەت کە هیچ کام لە ئیمامەکان بە ئیمامی عەلیشەوە ئاماژەیان پێیان نەداوەو ئەو تێگەیشتنەیان بۆیان نەبووە و لەهیچ بۆنەیەکدا بەبەڵگە نەیانهێناوەتەوە. ئەمە خۆی لەخۆیدا گەورەترین بەڵگەیە لە سەر ئەوەی ئەو ئایەتانە هیچ پەیوەندییەکیان بە مەسەلەی ئیمامەتەوە نییە.

خاڵێکی تر ئەوەیە ئەگەر سەرنجی سەرجەم ئەو ئایەتانە بدەین کە شیعە بەبەڵگە دەیانهێننەوە لەسەر ئیمامەت دەبینین هەموویان لەو سیاق وچوارچێوەیە هێنراونەتە دەرەوەو بەجیا لەو دوورەوە لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوەو بەڵگەی ئیمامەتی عەلییان لێ دەرهێنراوە ئەگینا ئەگەر لە گەڵ ئایەتەکانی پێش و پاشی خۆیان و لەچوارچێوەی ئەو سیاقەی کە تێیدا دابەزیون لێك بدرێنەوە هەرگیز ئەو مەبەستە نادەنە دەستەوە کە شیعە دەیەوێت. بۆ نموونە ئایەتی (انما يريد الله ليذهب عنكم الرجس اهل البيت ويطهركم تطهيرا.) لەچوار چێوەیەکدا هاتووە هەمووی باسی خێزانەکانی پێغەمبەرە، ئایەتەکە خۆی و ئەوەی پێشەوەو ئەوەی دوواوەی هەمووی باسی خێزانەکانی پێغەمبەرەو هەر فەرموودەیەکیش هاتووە لەسەر خەڵکانی تر ئەوانە بۆ ئەوەیە ئەوانیش بچنە ناو ئەو بازنەیەوەو حوکمی ئەو ئایەتە

بیانگرێتەوە بێ ئەوەی خێزانەکانی پێغەمبەر بێننە دەرەوە  لە حوکمی ئەو ئایەتانە.

هەروەها ئایەتی( انما ولیکم الله ورسوله والذین آمنوا، الذین یقیمون الصلاة ویؤتون الزکاة وهم راکعون ). ئەم ئایەتە شیعە دەیکەنە بەڵگە لەسەر ئیمامەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەر ئەوەی لەکاتی روکعە بردندا بووە سواڵکەرێك هاتووەتە مزگەوت و داوای یارمەتی کردووە ئەو ئەنگوستیلە ئاسنەکەی بۆ داکەندووە.  بەڵام گەر تەماشای ئایەتەکان بکەین دەبینین لە چوارچێوەی  پەیوەندی موسوڵمانان لە گەڵ ئەهلی کیتابدا دابەزیوە و باسی خۆشەویستی ودۆستایەتی و دوژمنایەتی (ولاء وبراء) دەکات و کۆمەڵێك ئایەتن لەو چوارچێوەیە ناچنە دەرەوە و لە ئایەتی ٥١تا ٦٢ و لە هۆی هاتنە خوارەوەشیدا کۆمەڵێك ریوایەت هاتووە لە هەمووی ڕاسترو لۆژیکیترو گونجاوتر لە گەڵ ڕۆحی دەقەکاندا ئەوەی عبادە بن الصامت ـە کە یەکێك بوو لە دۆستانی جوولەکەو لەبەر هەڵوێستی دوژمنانەی ئەوان بەرامبەر بە ئیسلام ئەو دۆستایەتی و لایەنگرییەی ڕەت کردەوە.

هەروەها ئایەتی (یا أیها الذین آ منوا اتقوا الله وکونوا مع الصادقین )  کە شیعە دەڵێن خوا مەبەستی لە صادقین  ئیمامی عەلییە لە دوای ئەو ئایەتە دابەزیوە کە باسی ئەو سێ کەسە دەکات کە لە غەزوەی تەبووك دوا کەوتن و چوونە خزمەتی پێغەمبەر و دانیان بەڕاستی مەسەلەکەدا نا کە هیچ بیانوویەکیان نەبووە، ئەوە بوو قورئان پەنجا ڕۆژ وەڵامی نەدانەوەو موسوڵمانان لەو ماوەیەدا بە فەرمانی پێغەمبەر پەیوەنییان لە گەڵدا پچڕین و بەتەواوی بێ تاقەت بوون تا خوای گەورە ئایەتی لێخۆشبوونی بۆ دابەزاندن و بە ڕاستگۆ ناوی بردن و هانی موسوڵمانانی دا کە شوێن پێی ئەوان

هەڵگرن چونکە سەرفرازی لە ڕاستگۆییدایە.دەبینی ئایەتەکە نە لە دوورو نە لە نزیك پەیوەندی بە ئیمامی عەلییەوە نییە با ئیمامی عەلیش ڕاستگۆترین کەس بێت.

بە نیسبەت فەرموودەکانیشەوە بەهەمان شێوە  هیچ کاتێك نەئیمامی عەلی وەنەهیچکام لە نەوەکانی ئەومیان لێ دەرنەهێناوە کە بەڵگە بێت لەسەر ئیمامەتی عەلی ونەوەکانی و لە هیچ بۆنەیەکدا ئاماژەیان پێ نەداوە. تەنها ئەم خاڵەش بەسە بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە ئەو فەرموودانە بەڵگە نین لەسەر ئیمامەت و بۆ ئەو مەبەستە نەوتراون  بەڵکو هەندێکیان بۆ دەرخستنی پلەو پایەی.ئیمامی عەلییە  و هەندێیان بۆ دڵنەوایی بووە وەکو فەرموودەی مەنزیلە و هەندێکیان بۆ بەرگری بووە لێی لە بەرامبەر ئەو کەسانەی ڕەخنەیان لێ گرتبوو وەکو فەرموودەی من کنت مولاە. جگە لەوەی کە پێغەمبەر فەرموودەی دەربارەی هەموو یارانی و بە هەمان ئەو مەبەستانەی کە دەربارەی ئیمامی عەلی هاتوون وتووەو کەس نەیکردووەتە بەڵگە لەسەر ئیمامەتی هیچ کەسێکیان.

بە نیسبەت زەواجی موتعەشەوە هەوڵی داوە وای نیشان بدات کە ئەم زەواجە لە شەرعدا حەڵاڵەو وەکو هەموو زانایانی شیعە حەرام کردنەکەی داوەتە پاڵ ئیمامی عومەر  و هەوڵی داوە بە شێوەیەك نیشانی بدات کە شتێکی لۆژیکییەو لە بەرژەوەندی مرۆڤدایە و ئەو فەرموودانەی شاردۆتەوە کە شیعە لە فەزڵ و پاداشتی موتعەدا هێناویانەتەوە و ئەو فەتوایانەی شاردۆتەوە کە زاناکانیان هێناویانەتەوە لە سەر چۆنێتی و مەرجەکانی و بوارەکانی .وتەنها لەو کتێبانەوە بەڵگەی هێناوەتەوە کە بۆ غەیری شیعە نوسراون وەکو کتێبەکەی کاشف الغطاء و لە سەرچاوە سەرەکییەکانەوە هیچ دەقێکی نەهێناوەتەوە.

بۆ ئەوەی خوێنەر بەو شێوەیە لە موتعە بگات کە شیعە باوەڕیان پێیە و ئەلهامی دەدەن داوای لێدەکەین کتێبی گەشتێك بە جیهانی تەشەیوعدا(سیاحة في عالم التشیع) بخوێنێتەوە. ئێمە قسەمان تەنها لەسەر حەلاڵی و حەرامی موتعە نییە بەڵکو قسەمان لەسەر ئەو هەموو فەرمودەیە هەیە کە لە پلەو پایەو پاداشتی موتعەدا هێناویانەتەوە و لەسەر ئەو هەموو بوارە فراوانانەی ئەلهام دەدرێت.

شایانی باسە نووسەر باسی ئەوە ناکات بۆچی ئیمامی عەلی لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەی خیلافەتی خۆیدا حەلاڵێتی موتعەی ڕانەگەیاند و کاری پێنەکرد.

لەسەر تەقییەش دیسانەوە هەوڵی داوە بە شێوەیەك نیشانی بدات کە لۆژیکی و قبوڵ کراو بێت و لە جیاتی ئەوەی فەرمودەکانیان بەبەڵگە بێنێتەوە قسەی ئەو زانایانەیان دێنێتەوە کە بۆ ڕازاندنەوەی تەقییەو بۆ غەیری شیعە نوسراوە و هەڵوێستی ڕاستەقینەی شیعە دەرناخات کە ئەو هەموو فەرمودانەن کە لە سەر پلەو پایەی تەقییە هاتوون و لە گەڵ ئەو کەسانەی کە دڵنیان لێیان بۆ ئەوەی ببێت بە عادەتێك تێیاندابۆ ئەوەی لە گەڵ ئەو کەسانەدا بیکەن کە لێیان دەترسن لە کاتێکدا کە تەقییە جگە لە ڕوخسەتێك هیچی تر نییە و هەل و مەرجی تایبەتی خۆی هەیەو لە گەڵ هەموو کەسێکدا نییە و لە پێشەکییەکەدا ئاماژەمان بە هەندێك لەو دەقانە داوە.

لەباسی بدائیشدا هەمان شتی کردووە، نەهاتووە ئەو دەقانە بخاتە ڕوو کە لەسەر بەداء هاتووەو مانا ڕاستەقینەکەی دەردەخەن بەڵکو وەکو هەموو زاناکانی تری شیعە هاتووە بەدائی پێچاوەتەوە بە مەسەلەی ناسخ و مەنسوخ

کە گوایە چۆن لە شەریعەتدا ناسخ و مەنسوخ هەیە بە هەمان شێوە لە فەرمانە تەکوینییەکانیشدا هەیە.

لە ڕاستیدا بەداء جگە لە نەزانی دانە پاڵ خوا هیچ مانایەکی تر هەڵناگرێت و هیچ پەیوەندییەکی بە ناسخ و مەنسوخی شەریعەتەوە نییە وە ئەگەر لێکۆڵینەوەی وردی لەسەر بکرێت و بە جوانی شی بکرێتەوە عەقیدەی دوازدە ئیمامی لە بن دێنێت.بۆ نموونە: شیعە دەڵێن هەردوازدە ئیمامەکە خوا دایناون و پێغەمبەر هەواڵی لە ناوی هەردوازدەیان داوە هەرلە عەلییەوە تا ئیمامی ون بوو، وهەموو ئیمامەکانیش ئەوەیان زانیوە.

ئێمە دەپرسین: ئەگەر وایە بۆچی جەعفەری صادق وتیووی ئیسماعیلی کوڕم دوای خۆم ئیمامە؟ ئەگەر پێغەمبەر خەبەری دابێت کە موسای کازم دوای جەعفەر ئیمامە بۆچی جەعفەر ئیسماعیلی کوڕی داناوە ؟ ئەمە یەکێك لە سێ ئەگەر هەڵدەگرێت: یا درۆیەو پێغەمبەر (د.خ)ناوی کەسی نەهێناوەو ئەم فەرمودەیە هەڵبەستراوە، وەیا پێغەمبەر (د.خ) ناوی ئیسماعیلی نەوتووە بەڵام جەعفەر ویستوویەتی سەرپێچی لێبکات و گۆڕانکاری تێدا بکات، وە یا جەعفەر ئەو شتەی نەزانیوەو ئەو ناوانەی لا نەبووەو ئاگای لەو شتە نەبووە،ئەمیش پێچەوانەی عەقیدەو بۆچوونی شیعەیە !.

ئەگەر ڕاستە پێغەمبەر (د.خ) خەبەری لە ناوی هەردوازدە ئیمامەکە داوە و ئیمامەکان ئەوەیان زانیوە دەبوایە پێغەمبەر بیوتایە ئیسماعیل ئیمامە نەك موسا چونکە دوای مردنی ئیسماعیل زانرا کە موسا ئیمامە نەك کاتی پێغەمبەر، واتە لێرەدا لێك نەچوون (تناقض) ێکی تەواو هەیە: لەلای پێغەمبەر بەداء ڕوویەداوەو زنجیرەی ئیمامەکانی وەکو ئەوەی کە ئێستا هەیە باس کردوە( واتە موسادوای جەعفەر دێت نەك ئیسماعیل)

کەچی لای جەعفەری صادق زنجیرەی ئیمامەکان جیاوازەو ئەو وایزانیوە ئیسماعیل ئیمامە نەك موسا و ئەو کاتەی ئیسماعیل دەمرێت بەداتەکە ڕوویداوە!

بەم شێوەیە دەبینی نووسەر لەم کتێبەیدا بەلگەیەکی بەرجەستەی نیشان داوە لە سەر ئەوشتانەی کە لە پێشەکییە شیکارییەکەدا وتوومانە و خوێنەر دەتوانێ بۆی بگەڕێتەوەو ڕاستی قسەکەمانی بۆ دەرکەوێت.

دەمێنێتەوە لێرەدا قسەیەکی گرنگ بکەین کە لە یەکێك لە پەراوێزەکاندا بە کورتی ئاماژەمان پێ داوە، ئەویش ئەوەیە کە عەقلییەتی ئیسلامی پێویستی بەوە هەیە کە گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی بە سەردا بهێنرێت لە باس کردنی خیلافەت و هەلسەنگاندنی خەلیفەکان وشیاوێتییان بۆ فەرمانڕەوایی.

تاکو ئێستا موسولمانان بە شێوەیەك لەسەر شیاوێتی خەلیفەکان دەدوێن وەکو ئەوەی کە هێشتا نەهاتبنە سەر تەخت و فەرمانڕەواییان نەکردبێ و خەلکی نەزانێ تواناو لێهاتووییان چەندە. هەر لەبەر ئەوەشە چاودێران کاتێك گفتوگۆو جیاوازی نێوان موسولمانان دەبیستن یا دەبینن لەسەر شیاوێتی ئەبوبەکرو عەلی سەریان سوڕدەمێنێ و هەندێك لەواتەی کەنازانن ئەمە مەسەلەیەکی مێژووییە دەپرسن کەی کاتی هەلبژاردنەکەیە؟.

موسولمانان تاکو ئێستا پێوەرێکی زانستییان پێ نییە بۆ هەلسەنگاندنی خەلیفەکان و شتەکان تێکەل دەکەن، بۆنموونە لە باسی شیاوێتی کەسێك بۆ خیلافەت باسی لایەنی زانستی شەرعی دەکەن کە پێوەرە بۆ زانایان نەك بۆ پیاوانی دەولەت، یاباسی ئازایەتی و تواناي شەڕو سەرکەوتنەکانی دەکەن لە بەرزاندنی پالەوانانددا کە ئەمەش پێوەری سەربازییە

نەك سیاسی و بۆ پاڵەوانانی شەڕ دەبێت نەك بۆ پیاوانی دەوڵەت، باباسی توانای وتارخوێنی دەكەن كە ئەمە پێوەرە بۆ ڕەوانبێژان و زمان زانان نەك بۆ پیاوانی دەوڵەت. لەهەموونەمانەش خراپتر و نازانستیتر كە بەتەواوی بەڵگەیە لەسەر سادەیی عەقڵییەتی ئیسلامی ئەوەیە كاتێك باسی شیاوی خەلیفەكانی ئیسلام دەكەن بەتایبەت خەلیفە ڕاشیدەكان وە بە تایبەتتر لە بەراوردكردن لە نێوان ئەبو بەكرو عەلیدا كە هەریەكەیان فەرمانڕەوایی كردوە و ئەوكارانەی كردویانە تۆماركراوە دەچن لە ڕوانگەی ئەو فەرمودانەوەهەڵیان دەسەنگێنن كە باسی پلەوپایەی ئاینییان دەكات نەك لە ڕوانگەی ئەو كارانەی كە كردیان و ئەو دەسكەوتانەی بەدەستیان هێناو ئەو ئامانجانەی پێكایان كە ئەمڕۆ لە جیهانی سیاسەتدا ڕەچاو دەكرێن. لە جیاتی ئەوەی بەراورد لە نێوان دوو سەردەمدا بكەن كە هەمووی شتی بەرجەستەن و بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن، دەچن لەسەر بنەمای تیۆری و لە ڕوانگەی ئەو فەرمودانەوە یا لە ڕوانگەی ژیانی پێش دەسەڵات گرتنە دەست هەڵیان دەسەنگێنن. ئەڵبەتە ئەم هەڵە مەنهەجییە بە پلەی یەكەم شیعە تێی كەوتووە بەڵام سوننە بۆیان ڕاست نەكردونەتەوەو هەڵەكەیان دەست نیشان نەكردووە.

ئێمە قەناعەتمان وایە كە هەریەك لەو خەلیفانە گونجاوترین كەس بوون بۆ سەردەمی خۆیان و كەسیان نەشیاو نەبوون بەڵام ئەوەیە كە ئەبوبەكر لە سەردەمی خۆیدا و بۆ ئەو قۆناغە لە عەلی شیاوتربووە بەڵگەش كردەوەكانیانە.

ئەگەر ئێمە بمانتوانیبایە وەكو شیعە بێ ئەدەبی بكەین بەرامبەر یارانی پێغەمبەر ئەو كاتە بەراوردێكی تێروتەسەلمان لە نێوان سەردەمی ئەبوبەكرو

عەلیدا دەکرد و لە ڕوانگەی ئەو شتانەی کردویانە و ئەو ئامانجانەی پێکاویانەو ئەو دەسکەوتانەی بۆ ئیسلامیان بە دەست هێناوە هەڵمان دەسەنگاندن، ئەو کاتە تای تەرازووی ئەبوبەکر زۆر قورستر دەبوو چونکە سەردەمەکەی بریتی بوو لە سەردەمی جێگیر بوون و فراوان بوونی دەسەڵاتی ئیسلام و نەمانی ئاژاوەی ناوخۆو کۆ کردنەوەی قورئان و بڵاوبوونەوەی ئەمن و ئاسایش و برایەتی و دادپەروەری و خۆشگوزەرانی و هتد. واتە لە هەردوو لایەنەوە، ناوخۆیی و دەرەکی ئیسلام لە برەودابوو. لە بەرامبەریشدا سەردەمی عەلی بریتی بوو لە وەستانی فتوحات و شەڕو ئاژاوەی ناوخۆو دووبەرەکی کەوتنە ناو موسوڵمانان و تەماع کردنی دوژمنان لە دەوڵەتی ئیسلامی و نەمانی ئاسایش و کوژرانی دەیان هەزار کەس لە موسوڵمانان وهتد.. ئایا کەسێك تۆسقاڵێك ژیری و ویژدان و ئینصافی هەبێت دەڵێت سەردەمی عەلی لە سەردەمی ئەبوبەکر باشتر بوو؟ جا ئێمە ئەگەر وەکو شیعە بێ ئەدەبیمان بکردایە بەامبەر یاران و وەکو ئەوان لە خوا نەترس بووینایە دەمانوت ئەوە نەشیاوی عەلی دەگەیەنێ و ئەومان بەبەرپرس دەزانی لەو حاڵەتەی بەسەر ئوممەتی ئیسلامیدا هات و ئەو دەیان هەزار موسوڵمانەی کوژران دەخستە ئەستۆی ئەو، بەڵام ئێمە هیچ شتێك وای لێ نەکردووین لە ئینصاف بچینە دەرەوەو بە کاردانەوە کار بکەین و دەڵێین لە گەڵ ئەوەشدا عەلی ڕاست بووە و نەیارەکانی لە معاویەو تەڵحەو زوبەیرو عائیشە و دواتریش خەواریجەکان هەموو هەڵە بوون و عەلی گونجاوترین کەس بووە بۆ ئەو سەردەمەو ڕەنگدانەوەی ڕۆحی ئیسلام و مەنهەجی قورئان بوو و ئەو نەبوایە وەکو ئیمامی شافیعی دەفەرموێت: حوکمی باغی و لادەرەکانمان نەدەزانی و بەو زانست و لەخواترسی و ڕەوانبێژییەی ئەو شتە ئاڵۆزانەی بۆ ڕوون کردوویەتەوە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت.....

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا

١.موسی الموسوی کوڕەزای ئیمامی گەورەی شیعە سەید ابو الحسن الموسوی الاصبهانی یە  کە مەرجیعی گەورەی شیعە بوو لە سەردەمی خۆیدا، لەساڵی ١٩٣٠ لە شاری نەجەف لە دایك بووە و خوێندنی ئاینی لە حەوزەی نەجەف خوێندووەو هەر لەوێ پلەی زانستی بەرزی پێ دراوە کە پلەیِ ئیجتیهادەو بڕوانامەکەی لە لایەن مەرجیعی  باڵای ئاینی شیعی و سەرۆکی حەوزەی زانستی نەجەف شێخ محمد الحسین آل کاشف الغطاء ـەوە ئیمزا کراوە.

٢. ساڵی ١٩٥٥پلەی زانستی دکتۆرای لە شەریعەتی ئیسلامی لە زانکۆی تاران  وەرگرتووە

٣.ساڵی ١٩٥٩ز لە زانکۆی سۆربۆن لە پاریس دکتۆرای  لە فەلسەفە هێناوەتەوە.

٤.لە ساڵی ١٩٦٠-١٩٦٢ز  مامۆستای ئابوری ئیسلامی بوو لە زانکۆی تاران.

٥.لە ساڵی ١٩٦٨- ١٩٧٨ز  مامۆستای فەلسەفەی ئیسلامی بوو لە زانکۆی بەغدا.

٦.لە ساڵی ١٩٧٩ز  هەڵبژێردرا بە سەرۆکی ئەنجومەنی ئیسلامی باڵا لە ڕۆژئاوای ئەمریکا.

٧. لە ساڵی ١٩٧٣-١٩٧٤وەکو مامۆستای میوان لە زانکۆی هالە لە ئەڵمانیای دیموکراسی وانەی وتۆتەوەو لە زانکۆی تەرابلوسیش لە لیبیا وانەی وتۆتەوە.

٨.له سالّی ١٩٧٥-١٩٧٦ز وەکو مامۆستای لێکۆڵەرەوە بووە له زانکۆی هارفارد له ئەمریکا.

٩. له سالّی ١٩٧٨ز به نوێنەر چووە بۆ زانکۆی لۆس ئەنجلۆس له ئەمریکا.

نووسراوە چاپکراوەکانی:

١. له کندی یەوە بۆ ابن رشد ١٩٧٢ چاپی بیروت.

٢. ئێران له چارەکه سەدەیەکدا ١٩٧٢ چاپی بیروت.

٣. چەند بنەمایەکی فەلسەفی ١٩٧٧ چاپی نەجەف.

٤. شتە نوێیەکانی لەفەلسەفەی مەلا صدر الدین ی شیرازی ١٩٧٨ چاپی بەغدا.

٥. له سەهرەوەردییەوە بۆ مەلا صدرالدین ١٩٨٠ چاپی بیروت.

٦ فەیلەسوفه ئەوروپییەکان ١٩٨٠ چاپی بیروت.

٧. شۆڕشه نەگبەتەکه ١٩٨٣ چاپی لۆس ئەنجلۆس.

٨. جمهورییەتی دووەم ١٩٨٥ = = =

٩. شیعەو ڕاستکردنەوە ١٩٨٧ = = =

١٠.شیعەکانی دونیا وریا بنەوە

له گەڵ چەندین وتارو لێکۆڵینەوەی تر.

# شیعە و ڕاستکردنەوە

## ململانێی نێوان شیعەو تەشەییوع

نووسینی:

**موسا موسەوی**

وەرگێڕانی:

**ئاسۆ حەسەن**

نرخ 3000 دینار